# هێندێ بابەتی زمانەوانیی و وێژەیی

« ڕەخنە و کۆڵینەوە »

حوسێن محەمەد عەزیز

2706ک/2006ز

پێشکەش بە گیانی پاکی هەموو هونەرمەند،
نووسەر، هۆنەر، ڕەخنەگر و زمانەوانە
بەهرەدارە دەسڕەنگینە لێهاتووە بلیمەتە ئازا و
نەترسەکانی کورد بێ.

# ـ ناوەڕۆک ـ

# پێشـــــەکیی

ڕەنگە، ئەمـە دوابەشی گوتارەکانم بێ، ئەگینا، مەگەر لە داهاتوودا، توانا و کاتـی ئەوەم هەبێ، کـۆمـەڵێ گـوتاری نـوێی دیکە بنووسم و لە پەرتووکێکی دیکەدا چاپیانکەم. چونکە، ئەوانەی تا ئێستە نووسیومن و بڵاومکردوونەتەوە، هەر هەمـوویانم، لە دووتوێی حـەوت پەرتـووکی جـیـاجـیـای وەک: « شـەکـرە شـارەکەم سـولەیمانیی، حـەوت گـوتاری قـەدەغەکراو، ئێمـە بۆ واین؟، برایەتی درۆزنانە، کـورد و کێشـەی کەرکووک، دۆزەخی ژێردەسـیی » و ئەم بەرهـەمـەدا چاپ و بڵاوکردۆتەوە، بە هەمووشیان « 95 » گوتارن!
ئەم بەرهەمە نوێیە، لە « 20 » گوتاری کورت و درێژی جیاجیای « زمانەوانیی، هونەریی، وێژەیی » و هـێندێ بـابەتـی دیکـەی گـرنگ پێکهـاتووە. بـەڵام، ئەم گـوتارانە، لـەگـەڵ گـوتارەکـانی پێشـوودا، کـەمێ جـیـاوازییـیان هـەیە. چونکە، گوتارەکـانی پێشـوو، زۆربەی هەرە زۆریان، لە بابەتـی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و کۆمـەڵایەتیی » دەدوان، کەچیی، لە گـوتارەکـانی ئەم جـارەدا، کەمـتر، بایەخم بەو بابەتانە داوە و تا ئەندازەیەک، لە کاری ڕامیارییەوە دوورن.
هێندێ لەم گوتارانە، زۆر لە مێژە نووسراون و هێندێکی دیکەشیان زۆر نوێن. واتە: لە نێـوان سـاڵەکـانی « 1996 - 2005 »دا نووسـراون. ئەوەی شـایـانی باسـە، لە ماوەی سـاڵێکدا « 2004 - 2005 »، هـەمـوو هەفـتـەیەک، گـوتارێکی نوێم نووسیوە، هەفتەی واش هەبووە، دوو گوتارم نووسیوە.
هەروەها، هەموو گـوتارەکانم، بەپێی نێوەڕۆکی بابەتەکان، دوور و نزیکییان لە یەکـدییـەوە، لە سێ بەشـی جـیـاوازی « زمـانەوانیی، وێژە و هـەمـەجـۆر »دا کۆکردۆتەوە، پاش و پێشم خستوون و ڕێکمخستوون، نەک بەپێی ئەو زنجیرە گـوتارە بێ، کە کـاتی خـۆی، لە لاپەڕەی ئەلیکـترۆنیی « Kurdistanpost »دا بڵاومکردوونەتەوە. لەبەرئەوە، بە پێـچـەوانەی پەرتووکـەکـانی پێـشـوومـەوە، هەمـوو گـوتـارە نوێ و کـۆنەکـانم تێکەڵاوکـردووە، بەپێی پێـوەندیی نێـوان بابەتەکـان کـۆمکردوونەتەوە. جگە لەوەی، لە کـۆتایی پەرتووکـەکـەشـدا، چاوپێکەوتنێکی خۆم و بانگەوازێکی تایبەتییشم بڵاوکردۆتەوە!

لێرەدا دەمەوێ، ئەوەش بڵێم: جگە لەوەی، هێندێ لەم گوتارانە، لە هێندێ ڕۆژنامە و گۆڤاری وەک: « گزینگ، پەیام، هاوبیر، نێوەند، ڕزگاریی، ئاڵای ئازادیی ... » لە دەرەوە و نێوەوەی وڵات بڵاوکراونەتەوە، لە هەمان کاتیشدا، هەموو گوتارە نوێکان، لە گۆشەی « گوڵبژێر » و لە « **Kurdistanpost** »دا، هەفتانە، بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕێکوپێک بڵاوکراونەتەوە.

خوێنەرانی هێژا!

هەرچەندە، هەموو ئەم گوتارانە، ڕاقە لە بیروباوەڕی تایبەتیی خۆم دەکەن، ئەز وەک نووسەرێکی کورد، دید و بۆچوونی خۆم، سەبارەت بە هێندێ لە کێشە گرنگەکانی « هونەر، هونەرمەند، نووسین، نووسەر، هۆنراوە، هۆنەر، زمان و زمانەوانیی »، زۆر بە ڕاشکاویی دەربڕیوە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو کوردێکی دڵسۆزی نیشتمانپەروەر بۆی هەیە، باری سەرنجی تایبەتیی خۆی دەربڕێ، ڕەخنە لە دید و بۆچوونەکانم بگرێ، گەر لە هەر ڕوویەکەوە، هەڵەیەکم هەبێ، بۆم ڕاستکاتەوە و ڕێی ڕاستم پیشاندا، زۆرم پێ خۆش دەبێ و لە کانگەی دڵەوە سوپاسیدەکەم!

لە کۆتاییشدا، هیوادارم، لە لایەکەوە توانیبێتم، ڕاژەیەکی پچووکی ووشەی پیرۆزی کوردیی، زمانی شیرینی دایک و ئەم نەتەوە بندەسە هەژارەم کردبێ. لە لایەکی دیکەشەوە، لە داهاتوودا بتوانم، هەموو گوتارەکان کۆکەمەوە، سەرلەنوێ، لە یەک پەرتووکی گەورەدا، چاپ و بڵاویانکەمەوە، تا، هەموویان بە ئاسانیی، دەس خوێنەری کورد بکەون و کەڵکی لێ وەرگرن!

**دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز**
**ستۆکهۆڵم**
**2006. 01. 01**

# سێ سەرنجی زمانەوانیی

لە زمانی کوردییدا، هێندێ ووشە هەن، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، لە لایەن کۆمەلانی خەلکەوە، بە هەلە بەکارهێنراون و بە هەلەش بەکاردەهێنرێن. بۆیە پێویستە، ڕاستکرێنەوە، بە شێوەیەکی ڕاست و گونجاو، لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاربهێنرێن. بۆ نموونە:

**1**. لە زاراوە ئێتنیکەکاندا، سێ جۆر ووشە، بە مەبەستی ڕامیاریی بەکار دەهێنرێ، وەک « میللەت، گەل و نەتەوە ». دیارە میللەت، ووشەیەکی کوردیی نییە، بەلکوو ووشەیەکی « ئیسلامیی ـ عەرەبیی »یە، لە ڕێی ئایینی ئیسلامەوە، لە زمانەکانی « کوردیی، فارسیی و تورکیی »دا بلاوبۆتەوە. ووشەی میللەت لە قورئانی پیرۆزدا، بە « ملە ـ ملت » هاتووە و چەن جارێ دووبارەبۆتەوە. ئەم ووشەیە لە بنەڕەتدا، لە قورئاندا بۆ مەبەستێکی تایبەتیی و (بۆ دیارییکردنی " کۆمەلگەی ناموسولمان " بەکار هێنراوە)«**10،1**» بەلام ئێستە، بۆ ئەو مەبەستە بەکار ناهێنرێ. هەرچەندە، (هێندێک لە گەلە موسولمانەکانی ڕۆژهەلات بە تایبەتی تورک و فارس و تەنانەت کوردیش، ئەم ووشەیەیان لە عەرەبەوە وەرگرتووە، کەچی بە مانای بنەڕەتی خۆی بەکاری ناهێنن، بەلکوو بە مانای « گەل »ی کوردی و **People** ی ئینگلیزی و **Volk**ی ئەلمانی و هێندێ جاریش بەرامبەر " نەتەوە **Nation** " بەکاری دەبەن، وەک ئەوەی دەبێژن: **Turk Milleti**، " گەل یا نەتەوەی تورک " ، ملت فارس " گەل یا نەتەوەی فارس "، میللەتی کورد " گەل یا نەتەوەی کورد " .)«**10،1**».

گەل ووشەیەکی کوردیی پەتیی و ڕەسەنە، بۆ یەکەمین جار، لە سالانی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستدا، لە نووسینەکانی گۆڤاری « گەلاوێژ »دا دەرکەوت. ووشەی گەل لە کوردییدا، پتر بە کۆمەل دێ، وەک گەلەگورگ، واتە: کۆمەلێ گورگ. گەل لە بری میللەتی عەرەبیی بەکار نایە، بەلکوو پێویستە، گەل لەبری « الشعب » و نەتەوەش لە جیاتی « الامە »ی عەرەبیی بەکاربێنرێن. باشتریش وایە، میللەت بۆ ئەو مەبەستە لە بیر خۆمان بەرینەوە. دیارە گەل و نەتەوەش جیاوازییان هەیە. گەل بە کوردی

دانیشتووی پارچەیەکی دیاریکراوی « کوردستان » دەگوترێ، وەک گەلی کورد لە « ڕۆژهەلاتی کوردستان »، یا گەلی کورد لە « ئێران ». چونکە، بە هەموو کوردی پارچەکانی « کوردستان »، یەک نەتەوە پێکدێنن. هەروەها عەرەبەکانیش، لە هەر وولاتێکی عەرەبییدا، بە گەلی عەرەب ناودەبرێن، بە هەمووشیان یەک نەتەوە پێکدێنن.

کوردەکانی « ڕۆژهەلاتی کوردستان »، ئەو سێ زاراوە ئیتنیکە، بە هەڵە بەکاردێنن. تا ئێستە لە نێو خۆیاندا، لە سەر بەکارهێنانی ئەو سێ زاراوەیە، بە تەواویی ساغ نەبوونەتەوە. هێندێکیان میللەت و نەتەوە، لە یەکدی جیا ناکەنەوە و بە یەک شتی دادەنێن. وەک پێشتر ڕوونمکردەوە، میللەت ووشەیەکی عەرەبییە و بۆ کۆمەڵێ بەکاردێنرێ، لەبری گەل و نەتەوە بەکار ناهێنرێ، لەگەڵ نەتەوەشدا، جیاوازییەکی گەلێ گەورەی هەیە.

هێندێکی دیکەیان، لە فارسەکانەوە فێربوون، دەڵێن: میللەتی « ئێران »، یا نەتەوەی « ئێران ». لەگەڵ ئەوەشدا، میللەت و نەتەوەش بۆ کورد بەکاردێنن. هێندێکی دیکەشیان، لەبری گەل، زاراوەی خەڵک بەکاردێنن، گەلیش لای ئەوان، خوێندەوارە ڕۆشنبیرە پێشرەوەکەی خەڵک دەگرێتەوە! جگە لەوەی، ئەم باوەڕەیان، لە کاربەدەسە شۆڤێنیستەکانی دەوڵەتی « ئێران »ەوە وەرگرتووە، هەر لە بنچینەشدا هەڵەیە. چونکە، « ئێران » دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، تەنیا یەک نەتەوەی تێدا بژی، بەڵکوو، دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵە. واتە: دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە چەن گەلێکی جیاواز پێکهاتووە. هەر یەکێ لەو گەلانەش، بە گەلێکی سەربەخۆ دادەنرێن و بەشێکی گرنگ، لە نەتەوەکانی خۆیان پێکدێنن. نەک وەک فارسە شۆڤێنیستەکان، بە هەموو شێوەیە، پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن و دەیانەوێ، بە هەر شێوەیەبێ، لە مێشکی ڕۆڵەکانی ئەو گەلانەی بئاخنن، کە لە « ئێران »دا، تەنیا یەک نەتەوە هەیە، ئەویش نەتەوەی « ئێرانیی »یە!

لە ڕاستییدا، « ئێران » ناوی خاک و دەوڵەتە. لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە هێچ جۆرێ ڕاست نییە، زاراوەکانی جوگرافیا و ئیتنیک تێکەلاوکرێ. بەڵکوو دەتوانین، بڵێین: « ئێران »، وەک دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان، لە ڕووی جوگرافیاوە، لە چەن وولاتێکی جیاوازی وەک: وولاتی « فارس، کوردستان، بلوژستان، ئازربایجان ... » پێکهاتووە. لە ڕووی ئیتنیکیشەوە، لە چەن گەلێکی جیاوازی وەک: « فارس، کورد، بلوژ، تاژیک، ئەفغان، ئازەر، توورکمان و عەرەب » پێکهاتووە، بە هەمووشیان دەگوترێ، گەلانی « ئێران »، نەک میللەتی « ئێران »، یا گەلی « ئێران »، یا نەتەوەی « ئێران ».

وەک چەن جارێکی دیکە، لە هێندێ نووسیندا ڕوونمکردۆتەوە، ئەم زاراوەیە، لە لایەکەوە، ئیمپریالیزمی جیهانیی و لە لایەکی دیکەشەوە، کاربەدەسانی دەوڵەتە سۆسیالیستەکانی پێشوو دایانناوە. چونکە لە بنەڕەتدا، دانیان بە بوونی گەلەکانی بندەسیاندا نەناوە، وەک چەن گەلێکی سەربەخۆ، هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا نەکردوون. لەبەرئەوە، هەر لەو ڕۆژدوە ئەو ددوڵەتانە دامەزراون، هەرگیز زاراوەی گەلانی « سۆڤێت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا ... » یان بەکار نەهێناوە. بەڵکوو هەمیشە، بە گەلی « سۆڤێت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا ... » ناویانبردوون. تا لە کۆتاییدا، ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانە هەڵوەشاونەتەوە و چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنال، لە جێیان دامەزراوە.

هەڵبەتە، هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « کوردستان »یش، داگیرکەران، هەر هەمان چاوبەستیان لەگەڵ کردووین، جگە لە گەلەکانی خۆیان، بە هیچ شێوەیە، دانیان بە بوون و مافی گەلەکانی دیکەی بندەسیاندا نەناوە. بۆیە، زاراوەی گەلی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » بەکارهێناوە، زاراوەی گەلانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا »یان بەکار نەهێناوە.

بە داخەوە، زۆربەی کوردەکانی « ڕۆژهەلات »، لە لایەکەوە، لەبەرئەوەی، خۆیان بە « ئێرانیی » دەزانن. لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەرئەوەی، لە زمانی کوردییدا، زۆر شارەزا نین، ئەو زاراوانە بە هەڵە بەکاردێنن، دید و بۆچوونە شۆڤێنییەکانی نەتەوەی باڵادەسی فارس کاوێژدەکەنەوە!

2. هەروەها، تێبینیمکردووە، هەر دوو ووشەی « داکۆکیی و بەرگریی »، زۆر جار بە هەڵە بەکاردێنرێن. ووشەی « داکۆکیی » لە زمانی کوردییدا، بەرانبەر ووشەی « دفاع » و ووشەی « بەرگریی »ش، بەرانبەر ووشەی « مقاومە »ی عەرەبیی دێن. کەچیی، هێندێ کەس و نووسەر، لە قسەکردن و تەنانەت لە نووسینەکانیشیاندا، ووشەی « بەرگریی » بە پێچەوانەوە بەکاردێنن و بەرانبەر ووشەی « دفاع »ی عەرەبیی دایدەنێن.

3. هێندێ جار، ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی « کوردستان »یش، بەگوێرەی بەرژەوەند و باوەڕی تایبەتیی تەسکیی پارتایەتیی و بە ئارەزووی دڵی خۆیان، زاراوەی ئیتنیی و ڕامیاریی دادەتاشن، بێ ئەوەی، لەگەڵ مەبەستەکەیاندا بگونجێ، یا ڕاستییەکی تێدابێ. ئەمەش، پتر زمانەکەمان دەشێوێنێ، نەک دەوڵەمەندیکا. بۆ نموونە: چەن ووشەیە هەن، واتاکانیان لە یەکدییەوە نزیکن، وەک: « ڕووخان، تێکچوون، تەواوبوون، کۆتاییپێهێنان، ئاشبەتاڵ، هەرەس، نسکۆ ». لە ڕواڵەتدا دەتوانین، ئەم ووشانە هەموویان، بۆ تەواوبوونی

شـــۆڕشی « 11/سێپتێمبـەر » بەکاربێنین، بەڵام، لە ڕاستییدا، هەر یەکەیان، بۆ مەبەستێکی تایبەتیی و دیارییکراو بەکاردێنرێن.
هەمـوومـان دەزانین، دوای ئەوەی شـۆڕشی «11/سێپـتێمبەر »، لە ئەنجامی پیلانێکی نێوچەیی و نێودەوڵەتییدا تێکشکا، هێندێ لەم زاراوانە دەرکەوتن. یەکەمین جـار، ووشـەی « ئاشبەتاڵ »، وەک چەمکێ بۆ ئەو کـارەساتە نەتەوەیی و ڕامیارییەی بە سـەر کورددا هـات، لە زاری کۆمەڵانـی ڕەشـــووڕووتی گەلی « باشووری کـوردسـتـان »ەوە داکەوت. بەڵام دواتر، « کـۆمـەڵەی مـارکسیی ـ لێنینیی کوردستان » و « یەکێتی نیشتمانیی کوردستان »، وەک نەیارێکی بنەمـاڵەی « بارزانیی » قـۆستـیـانەوە، لە ئاخـافتن و نووسینەکانیـاندا، وەک زاراوەیەکـی ڕامـیـــاریی بەکـــاریانهـێنا. تەنانەت ئەورۆ، ئەو ووشـــەیە وای لێـهـاتووە، جـۆرە کـاردانەوەیەکـی لای هێندێ کـەس پەیداکردووە، هەر کـاتێ، یەکێ باسی « ئاشبـەتاڵ » بکـا، یەکـســەر دۆست و ئەندامــانی « پارتیی »، دەماری تووڕەیییان هەڵدەسێ و تووکی سەریان گرژدەبێ، وەک ئەوەی، گرفتە گەورە سەرەکییەکەی کورد، لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیەدا بێ!
گـەر لە ڕووی زمـانەوانییـەوە، لەو ووشـەیە بدوێین، دەبینین، « ئاشبـەتاڵ » ووشـــەیەکـی لێکدراوە، لـە دوو ووشـــەی « ئاش » و « بەتـاڵ » پێکهــاتووە. لە هـەمان کاتیشدا، بە یەکێ لە ئیدیۆمە یەکگرتووەکانی زمانی کوردیی دادەنرێ.
گەر « ئاشبەتاڵ »، بە پێی هەنبانەبۆرینەکەی « هـەژار » لێکبدەینەوە، (دەس لە کـار کێشـان) دەگرێتـەوە. «7،2» بەڵام، گـەر بۆ بەسـەرهـاتەکـەی بگـەڕێینەوە، ئەوا « ئاشبەتاڵ »، واتە: کـاتێ ئاشەوان هـەستدەکا، ئاشـەکەی خـەریکە دانی لێ دەبڕێ، یا، بە تـەواویی دانی لێ بڕاوە، بۆ ئەوەی ئاشـەکـە لە کار نەکـەوێ، گـەر شـوێنی ئاشـەکـە لە ئاواییـیەوە نزیکبێ، لـە سەربانی ئاشـەکەوە، ڕووەو ئاوایی دەقیژێنێ و دەڵێ: ئاشبەتاڵ. بەڵام، گەر شوێنی ئاشەکە، لە ئاواییەوە دووربێ، ئەوا ئاشـەوانەکە دەچێ بۆ ئـاوایی و لەوێ هاواردەکا، ئاشبـەتاڵ، تا باراشی بۆ بێنن، چ ئاش و چ ئاشەوان لە کار نەکەون.
دیارە، کـۆمـەڵانی خـەڵک، ئەو ئیدیۆمـەیان، بۆ مـەبەسـتێکی ڕامیـاریی، لەو کارەوە خـواستـووە و بەکاریانهێناوە. لێرەدا، بە مـەبەستی وازهێنان لە کارێ بەکارهـاتووە، کە خـاوەنەکـەی بە کـەموکـوڕیی و بێ ئەوەی تەواویکا، بـەجێی هێـشـتـووە. بەڵام، بە باوەڕی مـن، ئـیدیۆمی « ئاشـبـەتاڵ »، بۆ تێکچـوونی شۆڕشی چواردە ساڵەی گەلەکەمـان بەکـار ناهێنرێ و لە جێی خۆیدا نییـە. چونکە، گـەر شـۆڕش بە ئاش و ژەنەڕاڵ « بارزانیی »ش بە ئاشـەوان بچـوێنین، ئەوا، ئەو ئاش و ئاشـەوانە، دانیـان لێ نەبڕابوو، تا، هاوار لە کۆمـەڵێکی دیکە

بکەن و باراشییان بۆ بێنن، بۆ ئەوەی ئاشەکەیانی پێ بگێڕن! بەڵکوو، هەموومان دەزانین، شۆڕشی کورد، لەبەر بێ توانایی ئابووریی و کەمیی کەرەسەی جەنگیی، کۆتایی پێ نەهات، لە ڕووی سەربازییشەوە تێک نەشکا، بەڵکوو هەر لە سەرەتاوە، لە ڕووی ڕامیاریی و دیپلۆماسییەوە، بە تەواویی لاوازبوو. پاشان، لە ئەنجامی پیلانێکی نێونەتەوەییدا تێکشکا و تووشی ئەو ماڵوێرانییە گەورەیە بوو. بەرژەوەندیی زلهێزێکی وەک « ئەمێریکا »ش، ڕۆڵی سەرەکیی لەو تێکشکاندنەدا وازیکرد. لەبەرئەوە، بە هیچ شێوەیە، زاراوەی « ئاشبەتاڵ »، لێرەدا ناگونجێ و بۆ ئەو مەبەستە بەکار ناهێنرێ.
ووشەی « هەرەس »، واتە: کاتێ کێوێ یا چیایەک، بەردی زل، پارچە بەرد و خۆڵێکی زۆری لێ دەبێتەوە، دەڕوخێ و لە بەرزاییەوە، بەرەو خوار تلۆر دەبێتەوە. ئەو کاتە دەڵێن: کێوەکە یا چیاکە هەرەسیهێنا. یا کاتێ، بەفرێکی زۆر دەبارێ، بە تەواویی، سەر لووتکە و قەدپاڵی کێو و چیاکان دادەپۆشێ، ئەو بەفرە ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە. پاشان، تیشکی خۆر کاریتێدەکا، وردەوردە دەتوێتەوە و بنەکەی بۆشدەبێ، یا، هەر خۆی لە بنەڕەتدا، لە ژێر بەفرەکەدا، بۆشاییەک دروستبووە، یەکسەر دادەڕوخێ و لە سەرەوە بۆ خوارەوە، بە گوڕ و بە تاو، وەک شەپۆلەبەفر تلۆردەبێتەوە، هەرچی هەیە، لەگەڵ خۆیدا ڕایدەماڵێ، یا، لە شوێنی خۆیدا دایدەپۆشێ، بۆیە بە هەرەسی بەفر ناوی دەبەن.
بە باوەڕی من، باشترین ووشە، ووشەی « هەرەس »ە. چونکە، کورد هەموو شتێکی هەبوو. بەڵام، سەرانی شۆڕشەکە، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی ورد، بۆ باری شۆڕشەکە و گەلەکەمان بکەن، بێ ئەوەی، ئاگاداریییەکی تەواوییان، لە سەر بارودۆخی نێونەتەوەیی و بەرژەوەندیی زلهێزەکانی جیهان هەبێ، بێ ئەوەی، ئاگایان لە خۆیان بێ، بەو هەموو توانا مرۆیی و مەتیریاڵییەوە، لە پڕ، وەک چیایەکی بەفرین، شۆڕش هەرەسیهێنا، هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا ڕاماڵی و کۆتاییپێهات.
دیارە، ئەم زاراوانەش، بەپێی کات، توانا، دەسەڵات و تەرازووی هێزەکان دەگۆڕێن. سەرەتا، زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی گەل و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی « کوردستان »، لە تاو سوێی ئازاری ئەو کارەساتە گەورە نەتەوەییییە، لە ئاخافتن و نووسینەکانیاندا، تووتی ئاسا، ئەو زاراوەیان دووپاتدەکردەوە. سەرکردەکانی پارت و بنەماڵەی « بارزانیی »ش، هێندە پەشۆکابوون، ئاگایان لە خۆیان نەبوو، هیچیان لە دەسدا نەمابوو، زۆر بایەخیان بەو جۆرە ووشە و چەمکانە نەدەدا. یا با بڵێین: لێیان تێ نەدەگەیشتن! بەڵام، کاتێ

هۆشیان بە بەر خۆیاندا هاتەوە، زانییان، چییان بە سەر خۆیان و گەلەکەیان هێناوە، وردەوردە، خۆیان کۆکردەوە و خۆیان ڕێکخستەوە، هێزی چەکداریان دامەزراندەوە، مەچەک و بازوویان ئەستووربۆوە، وەک ڕێکخراوێکی ڕامیاریی بە هێز و توانا، سەرلەنوێ بۆ گۆڕەپانەکە گەڕانەوە، وەک هێزێکی چەکدار لە « کوردستان »دا، خۆیان نواندەوە، بە تایبەتیی، دوای ئەوەی شۆڕشی گەلانی « ئێران » ڕوویدا، بە تەواویی، لە دارەدارە کەوتن، سەرپێی خۆیان کەوتنەوە و خوێنێکی نوێ، بە جەستەیاندا گەڕا. ئیدی لەوە بەدوا، لە کەسیان قەبووڵ نەدەکرد، زاراوەی « ئاشبەتاڵ » بەکاربێنێ، بەڵکوو لەبری ئەوە، سەرەتا زاراوەی « هەرەس »یان بەکارهێنا. تەنانەت کاتێ، لە نزیکەوە، لەگەڵ هێزە « کوردستانیی »یەکانی دیکەشدا، دەسیان بە وتووێژ کرد و لە یەکدی نزیک بوونەوە، پاشان، ڕێککەوتن و بەرەی « کوردستانیی »یان دامەزراند، ئیدی ئەوانیش، وازیان لەو ووشەیە هێنا و ووشەی هەرەسیان بەکاردەهێنا.
هەرچەندە، هەر جارێ، دەمبۆڵەیە، هەراوهوریایە، لە نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی »دا پەیدابووایە، یا جەنگی نێوخۆ لە نێوانیاندا هەڵگیرسایە، هەر زوو ئەندامان و کادێرەکانی سەرکردایەتیی « یەکێتیی »، جارێکی دیکە، ووشەی « ئاشبەتاڵ »یان بەکار دەهێنایەوە، تا بەو شێوەیە، سووکایەتیی بە سەرانی « پارتیی » و بنەماڵەی « بارزانیی » بکەن. ئەوەبوو، لەبەر نارەزایی سەرانی « پارتیی »، لەبری ووشەی « ئاشبەتاڵ »، ووشەی « هەرەس »، لە نووسیندا برەوی پەیداکرد و تا ئەندازەیەکی زۆریش چەسپا.
بەڵام، سەرانی « پارتیی » و بنەماڵەی « بارزانیی »، کاتێ سەرکەوتنی مەزنتریان بەدەسهێنا، جارێکی دیکە بە خۆیاندا چوونەوە. بۆیە ئێستە، ووشەی « هەرەس »یش بە گاڵتەپێکردن و سووکایەتیی دادەنێن. لەبەرئەوە، ووشەیەکی دیکەیان داناوە، ئەویش ووشەی « نسکۆ »یە. جا گەر لە پاشەڕۆژدا، بە تەواویی، دەس بە سەر کاروباری شۆڕشەکەدا بگرنەوە، تەنیا خۆیان لە گۆڕەپانەکەدا تەراتێنبکەن، هیچ لایەنێ لە « کوردستان »دا، بەربەرەکانیان نەکا، ئەوا ئەو کاتە، جارێکی دیکە، ووشەی « نسکۆ »ش ڕەتدەکەنەوە. دوور نییە، ئەم جارەیان، ووشەیەکی دیکەی لەبارتر، بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دابتاشن، کە زۆر زیاتر لە ڕاستییەوە دووربێ!
با، کەمێ لە ووشەی « نسکۆ »ش بدوێم. لە هەنبانەبۆرینەکەی « هەژار »دا، ووشەی نسکۆ بە (**1**/ ڕەت، سەرسم. **2**/ هەڵەنگووتن) هاتووە. «**865،2**»
دیارە، بە هیچ شێوەیە، زاراوەی « نسکۆ »، بۆ تێکچوون و کۆتاییپێهاتنی شۆڕشی « **11**/ سێپتێمبەر » بەکار نایە. چونکە، شۆڕش نە مرۆڤ و نە

ئاژەڵ بووە، تا ڕەت و سەرسمی دابێ، کەوتبێ و جارێکی دیکە هەستابێتەوە.
هەڵەنگوتنیش، بە واتای (توشبوون و کەوتن) دێ «27،2»
جگە لەوەی، شۆڕش بۆ کارێکی تایبەتیی ڕامیاریی یا سەربازیی، هەنگاوێکی دیارییکراوی نەناوە، تا لەو هەنگاوەدا، تووشی ئەو هەڵەنگوتنە بووبێ، بەڵکوو هەموو دەزگە « ڕامیاریی، سەربازیی، کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی »یەکانی، هەر لە « زاخۆ »وە تا « خانەقین »، بە یەک جار، لەبەر یەک هەڵوەشاون، تیکچوون و ڕوخاون. پاشان، ماوەی پتر لە ساڵێکیشی بە سەردا تێپەڕیوە، تا جارێکی دیکە، ئاگری شۆڕشێکی دیکەی نوێی چەکداریی، بە تەواویی، کڵپەیسەندووە، گڕی بەرزبۆتەوە و هەموو « کوردستان »ی ڕووناککردۆتەوە.
واتە: هەرەسێکی تەواویی « ڕامیاریی، سەربازیی، مەڕاڵیی و سایکۆلۆژیی » بوو، نەک هەر کاری لە شۆڕشی « 11/ سێپتێمبەر » و گەلی کوردی « باشوور » کرد، بەڵکوو، لە هەموو ڕوویەکەوە، کارێکی یەکجار گەورەی، لە سەرجەم بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی نەتەوەی کورد کرد. بە شێوەیە، پشکۆی داخێکی زۆر سەخت و بێ ئەندازەی، بە دڵی هەموو دڵسۆز و کوردپەروەراندا چزاند و کسپەی لە جەرگی نیشتمانپەروەرانی کورد هەڵسان.
لەبەرئەوە، نە « ئاشبەتاڵ »ی دوێنێ و نە « نسکۆ »ی ئەوڕۆ، بۆ ئەو کارەساتە گەورەیە، لە جێی خۆیاندا نین و گونجاو نین. بەڵکوو، لە ڕاستییدا، زاراوەی « هەرەس »، پڕ بە پێستی ڕووداوەکەیە. چونکە هەرەسبوو، هەرەسێکی ماڵوێرانکەرانەی وابوو، بە هیچ شێوەیە لە بیر ناچێتەوە و تا ئەوڕۆش، برینەکانی بە تەواویی سارێژ نەبوون، لاپەڕەکانی مێژووش، زۆر بە وردیی، هێندێ لەو کارەساتانەی تۆمارکردووە، بە شێوەیەکی بەردەوامیش تۆماریاندەکا.

**ستۆکهۆڵم**
**1998. 03. 21**

* * *

---

**تێبینیی:**
ئەم گوتارە، لە مانگنامەی « پەیام »ی « لەندەن »ی ژمارە 8، ساڵی 1998 دا بڵاوکراوەتەوە.
**سەرچاوەکان:**

1. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەیی ی کوردی نە بیری " قەومیەت " ی ڕۆژهەڵاتی و نە بیری " ناسیۆنالیزم " ی ڕۆژئاوایی یە، چاپی1، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، ستۆکهۆڵم ـ سوید، 1984.
2. هەژار، هەنبانەبۆرینە، فرهنگ کوردی ـ فارسی، چاپی1، سروش، تهران، 1396.

# زمان
# و
# نەتەوایەتیی

گومانی تێدا نییە، ئەورۆ کۆمەڵگەی مرۆ، لە بوارەکانی « خوێندەواریی، ڕووناکبیریی، ڕاگەیاندن و زانست »دا، گەلێ هەنگاوی مەزنی ناوە و گەلێ پێشکەوتنی لەبەرچاویشی بەدەستهێناوە. لەبەرئەوە، هێندێ دید و بۆچوونی تایبەتیی، هێندێ جاریش، دەمەتەقێی گەرم، لە سەر هێندێ زاراوە و چەمکی وەک: « زمان، ناسیۆنالسیت، ئینتەرناسیۆنالیست، ئایین، سیکولاریزم، دێمۆکراسیی ... » پەیدابووە. ئەم دەمەتەقێیانەش، پتر لە لایەن گرووپە خاوەن بیر و فەلسەفە جیاجیاکانی وەک: « کۆمۆنیست، ناسیۆنالیست و ئیسلامی ڕامیاریی »یەوە وروژێنراوە و بایەخی تایبەتیی پێ دراوە.

لە ڕاستییدا، هیچ یەکێ لەو چەمک و زاراوانەش، سەربەخۆ نین، بەڵکوو، هەموویان پێکەوە گرێدراون و بە شێوەیەکی دیالێکتیکیی، کار لە یەکدی دەکەن. لەبەرئەوە، زۆر جار، لایەنە پێوەندییدارەکان، قامک لە سەر هەموویان دادەنێن و واتاکانیان، پێکەوە دەبەستنەوە. هەر فێرگەیەکیش لەو فێرگانە، لە ڕوانگەی بیر و فەلسەفەیەکی دیارییکراو، بەگوێرەی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی، لەو جۆرە شتانە دەڕوانێ و لێکیاندەداتەوە!

بۆیە، زۆر بە پێویستی دەزانم، لەم گوتارەدا، دید و بۆچوونی تایبەتیی خۆم، دەربارەی هێندێ لەو چەمکە گرنگانە دەربڕم، لە هەمان کاتیشدا، دەمەتەقێیەکی زانستانە بوروژێنم، تا ڕووناکبیر و نووسەرانی کوردیش، بەشداریی تێدا بکەن، بە باری سەرنجی تایبەتیی خۆیان، واتای هێندێ لەو چەمک و زاراوانە، بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەمان ڕوونترکەنەوە.

سەرەتا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: ئەز، لە ڕووی بیر و فەلسەفەوە، خۆم بە « ناسیۆنالیست » دەزانم، باوەڕێکی تەواوم، بە سەرەتاکانی « دێمۆکراسیی » و « سیکولاریزم » هەیە. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، ئەو « سیکولاریزم »ەی، ئیسلامی ڕامیاریی تێیگەیشتووە، هەرگیز باوەڕم پێی نەبووە و باوەڕیشم پێی نییە. چونکە، لە هەموو ژیانی خۆمدا، دژی بێ باوەڕیی بووم، خۆم بە موسوڵمان زانیوە، باوەڕێکی تەواو و لەبنەهاتووشم، بە خوای خۆم هەبووە و باوەڕیشم پێی هەیە. « سیکولاریزم »یش لای من، تەنیا هەر ئەوەیە: کاری ڕامیاریی و دەوڵەت، لە کاری خواپەرستیی و ئایین جیاکرێتەوە. ئەگینا، چۆن بە هەموو شێوەیە هەوڵدەدەم، « سیکولاریزم »ێکی پڕ لە گومڕایی، بێ باوەڕیی و دژایەتییکردنی خوا ڕەتکەمەوە، تا، وەک چەکێکی کوشندە، دژی ئایین و خواپەرستیی ڕاستەقینە بەکار نەهێنرێ، بە هەمان شێوەش هەوڵدەدەم، ئیسلامی ڕامیاریی، بە ناوی دژایەتییکردنی « سیکولاریزم »ەوە، هەموو کارتەکان تێکەڵاو نەکا و دژی هەموو هێزە « کوردستانیی »یەکان بوەستێتەوە، هەراوئاژاوەیەکی ئەوتۆ دروستبێ، ئەو سەری دیار نەبێ!

ڕاستە، من خۆم بە « ناسیۆنالیست » دەزانم و شانازییشی پێوە دەکەم. پێشموایە، هەموو مرۆڤێ لەم جیهانەدا، ڕەگێکی « ناسیۆنالیستیی » هەر تێدا هەیە. چونکە، لە نیشتمانێکی دیارییکراودا لەدایکبووە و بە زمانێکی تایبەتییش دەپەیڤێ، ئەگینا، خۆ لە ئاسمانەوە نەباریوە؟!! بۆیە دەبێ، ئەو نیشتمان و زمانەی، لە هەموو نیشتمان و زمانەکانی دیکەی جیهان خۆشتر بوێ. ئەمەش، کارێکی سروشتیی و ڕاستە، لەگەڵ هیچ جۆرە دید و بۆچوونێکی ئایینیی و مرۆییدا ناکۆک نییە. ئاخر خۆ پەیامبەری ئیسلام، چیای « ئوحود »ی خۆشویستووە و خۆشی فەرموویەتی:(« ئوحود » چیایەکە، خۆشیدەوێین، خۆشماندەوێ.) جا، گەر هەر کوردێکی نەگبەت بیگوتایە: چیای « قەندیل »، یا، هەر چیایەکی دیکەی نیشتمانەکەم خۆشدەوێ، ئەوا ئەندامی گرووپەکانی ئیسلامی ڕامیاریی و هێندێ لە موسوڵمانە کوردەکان، شاخ و گوێیان لێ دەڕوان، بە کێویلەیان نێوزەددەکرد و دەیانگوت: تۆ چۆن، خۆڵ و بەرد خۆشدەوێ، ناشێ، بتپەرستبی؟!!

بەڵام، ئەز ئەو « ناسیۆنالیست »ە نیم، کە هێندێ کەس لێی تێگەیشتووە. چونکە، « ناسیۆنالسیتیی » لای من، تەنیا هەر ئەوەیە: مرۆ خاکی نیشتمان و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی خۆشبوێ. ناپاکیی لە کورد و « کوردستان » نەکا. بۆ کێشە ڕەواکەی دڵسۆز و بە ئەمەک بێ. هەوڵ بۆ تەبایی و یەکێتیی نێوان ڕیزەکانی گەل بدا. دژی ناپاکیی، ناکۆکیی و دووبەرەکیی بێ. لەگەڵ ناڵەی هەژاران و چەوساوەکانی کورددا بێ. دژی ستەمی نەتەوەیی و داگیرکردن بێ. دژی چەوساندنەوە و زۆرداریی کۆمەلایەتیی بوەستێ. نەک بیر، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایەک بێ، لە وێنەی بتێکدا داتاشرێ و شایانی پەرستنبێ.
لەبەرئەوە، ئەز هێندە « ناسیۆنالیست »م، تا بیر و ڕێبازەکەم، لە ڕاژەی کۆمەلانی خەڵکدا بێ. ئەگینا، لە مێژە گوتوومە و نووسیویشمە: بیر و فەلسەفەیەک، ڕێباز و ئایدۆلۆژیایەک، ڕیزەکانی نەتەوەکەم لەتوکوتکا، ڕۆڵەکانی لە سەر ئایدۆلۆژیا و لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتییدا، دەسیان بە خوێنی یەکدی سووربێ، بە هەموو توانای خۆمەوە، ئەو فەلسەفە و ئایدۆلۆژیایە ڕەتدەکەمەوە. ئیدی، سەر بە هەر باوەڕ و فەلسەفەیەکی ئاسمانیی و زەمینیی بێ، گرنگ نییە! ئاخر ئایدۆلۆژیایەک، بۆ ئازادیی و خۆشیی مرۆ بە گشتیی و کورد بە تایبەتیی، بەگەڕ نەخرێ، کەڵکی چییە؟ ئایدۆلۆژیایەک، جگە لە «ماڵوێرانیی، وێرانکاریی، ئاژاوەنانەوە، ڕاونان و گرتن، کوشتن و بڕین، جەنگی نێوخۆ، خوێنڕشتن و جینۆسایید »، هیچی دیکەی پێ نەبێ، بۆچی چاکە؟ بە کەڵکی کام گەل و نەتەوە دێ؟!!
لەبەرئەوەی، خۆم بە « ناسیۆنالسیت »ێکی دیمۆکراسیخوازی مرۆپەروەر دەزانم، بایەخێکی یەکجار زۆر، بە زمانە نەتەوەییەکەی خۆم دەدەم، گەشەی پێ دەکەم، پێشیدەخەم و تا دەتوانم، ئەو زمانەی خوای گەورە پێی بەخشیوم، لە هەموو زمانەکانی دیکەی جیهانم خۆشتردەوێ و ڕاژەیدەکەم. ئەمەش، نە هەڵەیە و نە « کفر »ە، بەڵکوو بە تەواویی، لەگەڵ باوەڕە « ناسیۆنالیستیی » و خواپەرستییەکەمدا دەگونجێ و ڕێکدەکەوێ. چونکە، خوای پەروەردگار، بە کوردێتیی ئەفراندوومی و هەر بە کوردییش زمانی پژاندووم!
هەرچەندە، زمان و کەلتووری کوردیی، لە چاو جاراندا، زۆر گەشەیکردووە، هەنگاوی گەورەی، بەرەو پێشەوە ناوە و لە خەم ڕەخسیوە. بەڵام دیسانەوە، ئەورۆ بە ئاشکرا دەبینم، گرووپەکانی ئیسلامی ڕامیاریی لە « باشووری کوردستان »، هێندەی بایەخ بە زمان، کەلتوور، مێژووی ئایین و نەتەوەی عەرەب و ئیسلام دەدەن، هێندە بایەخ، بە زمان، کەلتوور و مێژووی کورد نادەن. ئەمەش، خۆی لە خۆیدا، مەترسییەکی گەورەی، بۆ سەر پاشەڕۆژی

کورد هەیە. چونکە، ئەو کارەی ئەوان دەیکەن، بە قازانجی نەتەوەی بالادەس و بە زیانی کورد تەواودەبێ، بەعەرەبکردنی زمان و کەلتووری کوردیش نەبێ، هیچی دیکە ناگەیەنێ. بۆ نموونە: بە بیانووی کاری ڕامیاریی و ئایینییەوە، ناوە کوردییەکان دەگۆڕن، ناوی سەرکردەی عەرەبە موسولمانەکان، لە ناوی هێز و پرۆژەکانیان دەنێن، وەک ئەوەی لە ئایینی ئیسلامدا، تەنیا هەر، بڕیار لە سەر ئەوە درابێ، هەموو شتێ دەبێ، بە عەرەبیی بێ، بۆ مێژووی نەتەوەی عەرەب و ئیسلام بگەڕێینەوە! یا، زمانی کوردیی، زمانی « کفر » بێ و بە هیچ شێوەیە نابێ، بایەخ بەو بەها گرنگ و پیرۆزانەی نەتەوە بدرێ!

بۆیە، لەو نامەیەی ڕۆژی « **2002. 10. 08** »، لە « سولەیمانیی »، بۆ مامۆستا « عەلی باپیر »م ناردووە، زۆر بە ڕاشکاویی نووسیومە: (بە ڕاستیی، گەر بە دەس من بووایە، « نوێژ، قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر »یشم دەکرد بە کوردیی! جا نازانم، بەڕێزت لەو بارەیەوە، چی دەڵێی؟ چونکە، گەر وا بڕوا، لە نێوچەی ژێر دەسەڵاتی ئێوە و لە ڕیزی پارتە ئیسلامییەکاندا، وردەوردە، ناوی « کوردیی » و سڵاو لە یەکدی کردنیش، بە « کوردیی » نامێنێ!)

«**195،2**»

ئەز پێموایە: کۆڵەکەی سەرەکیی نەتەوە، لە زمان پێکهاتووە. چونکە، هەر بە هۆی زمانەوە، بە من دەڵێن: کورد و بە یەکێکی دیکەش دەڵێن: عەرەب. هەر بە هۆی زمانیشەوە، نەتەوەکان لە یەکدی جیادەکرێنەوە، پۆلێندەکرێن و لە چەن گرووپێکی ئیتنی هاوبەشدا کۆدەبنەوە.

لەبەرئەوە، گەر وەک « ناسیۆنالیست »ێ، لە زمانی کوردیی بڕوانم، ئەوا زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: لە هەموو زمانەکانی دیکەی گەل و نەتەوەکانی ئەم جیهانەم خۆشتردەوێ. بۆ؟ چونکە، هەر بەو زمانە، پەردەی گوێم کراوەتەوە، بانگم بە گوێدا هەڵدراوە، بە منداڵیی گڕوگاڵمکردووە، فێری یەکەمین ووشەی پیرۆزی « دایە و بابە » بووم! کاتێ ئازارێکم پێ گەیشتووە، هەر بەو زمانە ناڵاندوومە. کاتێ تووشی گرفتێ بووم، هەر بەو زمانە، هاوارم لە خوای خۆم کردووە، تا بەدەنگمەوەبێ و یارمەتییمبدا. کاتێکیش، سەرکەوتنێکم بەدەسهێناوە و بەختەوەربووم، هەر بەو زمانە، خۆشیی خۆم دەربڕیوە. هەموو کاتێکیش، هەر بەو زمانە دەتوانم، باشتر، جوانتر، ڕوونتر، ڕەوانتر، پتر دید و بۆچوونەکانی خۆم دەربڕم، ڕاڤەش لە هەست و هۆشی خۆم بکەم!

بە داخەوە، هێندێ کورد هەن، زمانە « ئەورووپایی »یەکان، بە چەن زمانێکی بیانیی دادەنێن. لە هەمان کاتیشدا، زمانی نەتەوە بالادەس و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان » بە گشتیی و زمانی « عەرەبیی » بە تایبەتیی،

به چەن زمانێکی نامۆ و بیانیی نازانن! بەڵام، بە لای منەوە، نەک تەنیا هەر، زمانە « ئەورووپایی »یەکان، بەڵکوو، هەموو زمانەکانی دیکەی « توورکیی، فارسیی و عەرەبیی »ش، هەر وەک سێ زمانی نامۆ و بیانیی تەماشادەکەم. چونکە، زمانی زکماکیی و نەتەوەیی من نین، بە هەموو جۆرێ، بە من نامۆن، زمانی سێ نەتەوەی سەردەس، زمانی فەرمیی چوار دەوڵەتی داگیرکەر و نایاسایی « کوردستان » نەبن، هیچی دیکە نین و بە هیچ شێوەیە، لام پیرۆز نین! با، تێکەڵیی ئایینییشمان لەگەڵ نەتەوەی « عەرەب » و خزمایەتی زمانیشمان، لەگەڵ نەتەوەی « فارس »دا هەبێ! ئاخر، گەر ئەو نەتەوە باڵادەسانە، هەر لە مێژەوە، خاکی « کوردستان »یان داگیر نەکردایە، ئێستە ڕۆڵەی کورد، بۆ ئەو سێ زمانەیان دەزانی؟ ئەدی بۆ زمانەکانی: « چینیی، هیندیی، بەنگالیی، پورتوگالیی، مالایئیدۆنێسیی، ژاپۆنیی، ئۆردۆ ... » نازانن؟!!

بەڵام، گەر وەک خواپەرستێکی ڕاستەقینە و لە ڕوانگەی ئایینەوە، لە زمانی کوردیی و هەموو زمانەکانی دیکەی، گرووپە ئیتنیکەکانی دیکەی جیهان بڕوانم، ئەوا، هەموو زمانەکانم، لا جوان و پیرۆزن. چونکە، هەموویان هەر یەزدانی مەزن درووستیکردوون، هیچیان دەسکردی هیچ کەس، ڕێکخراو، پارت و دەوڵەتێ نین، هەر وەک خواش فەرمووویەتی: (ومن ایاته خلق السماوات والارض و اختلاف السنتکم و الوانکم ان فی ذلک لایات للعالمین.)

تەنانەت، زمانی نەتەوەیی، هێندە پیرۆز و پڕ بایەخە، خوای گەورە، پەیامبەرەکانی خۆشی، لە نێو نەتەوەکانی خۆیاندا هەڵبژاردووە و هەر بەو زمانەش ناردوونی، کە قسەیانپێکردووە، تا، باشتر لە یەکدی بگەن. وەک لە چەن جێیەکدا فەرموویەتی: (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه لیبین لهم فیضل الله من یشاء و یهدی من یشاء و هو العزیز الحکیم.) (ولکل امه رسول فاذا جاء رسولهم قضی بینهم بالقسط و هم لا یظلمون.) (ولقد بعثنا فی کل امه رسولا ان اعبدوا الله و اجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدی الله و منهم من حقت علیه الضلله فسیروا فی الارض فانظروا کیف کان عاقبه المکذبین.)

جا، گەر خوای گەورە خۆی، ئارەزووی لێ بووایە، هەڵبەتە، ئەم هەموو گرووپە ئیتنیکانەی درووست نەدەکرد، بەڵکوو، هەموو گرووپە ئیتنیکەکانی، لە یەک گرووپی دیارییکراودا کۆدەکردەوە. هەروەها، ئەم هەموو زمانانەشی درووست نەدەکرد، بەڵکوو، تەنیا هەر یەک زمانی تایبەتیی درووستدەکرد! هەر وەک خۆشی فەرموویەتی: (ولو شاء ربک لجعل الناس امه واحده و لا یزالون مختلفین.)

لەبەرئەوە، هەر نەتەوەیەک، پارێزگاریی زمانی نەتەوەیی خۆی نەکا، هەوڵ بۆ « بوژاندنەوە، پێشکەوتن، گەشەکردن و پەرەسەندن »ی زمانەکەی خۆی نەدا، جگە لەوەی، « کفر »ێکی گەورەی نەتەوەیی دەکا، لە هەمان کاتیشدا، وردەوردە، زمانەکەی لاوازدەبێ و دەپوکێتەوە. دووریش نییە، لە پاشەڕۆژدا لەنێونەچێ و نەتەوەکەش، تووشی گرفتێکی گەورەی زمانەوانیی و سایکۆلۆژیی ببێ!

ئەوەتە، ئێستە زۆر بە ئاشکرا دەبینین: چ بزووتنەوەیەکی مەزن، لە جیهاندا هەیە، بە چ شێوەیە، هەموو نەتەوە پچووک و ژێردەستەکان، هەوڵ بۆ بووژاندنەوەی زمانەکانیان دەدەن. تەنانەت، نەتەوە سەردەس و خاوەن دەوڵەتەکانیش، بایەخێکی یەکجار زۆر، بە زمانە نەتەوەییەکانی خۆیان دەدەن و پێشیدەخەن. چونکە، زمان بە چرایەکی ڕووناک و گەشی، نێو ماڵی تاریکونووتەکی هەموو نەتەوەیەک دادەنرێ، زۆربەی تایبەتمەندییەکانی نەتەوە، بە زمان دەردەبڕرێن و هەر لە زمانیشدا کۆدەبنەوە. خۆ هەر بە هۆی زمانیشەوە، گەلێ شتی گەورە و گرنگ، لە جیهاندا ڕوودەدەن.

گەر ئاوڕێکیش لە مێژوو بدەینەوە، تەماشایەکی سەردەمی « ڕێنیسانس » بکەین، ئینجا، بە تەواویی بۆمان دەردەکەوێ و تێدەگەین، هێندێ لە گەلانی « ئەوروپا »، لە نێوان ساڵەکانی « **1300- 1400** » و بەرەو ژوور، بە چ شێوەیە، بایەخیان بە زمانی نەتەوەیی خۆیان داوە. بە هۆی بوژاندنەوەی زمانەکەیانەوە، چۆن توانیویانە، پێشکەوتن بەدەسبێنن. لە کاتێکدا، چەندین پێشەوای مەزنی ناوداری وەک: « دانتی، پەترارک، پۆکاشیۆ، داڤینشی، میخایل ئەنجیلۆ و ئارازمس ... »، لە نێو گەلەکانی خۆیاندا هەڵکەوتوون، گەلێ شانازییان، بە زمان و کەلتووری نەتەوەیی خۆیانەوە کردووە، بایەخێکی یەکجار زۆریان پێ داوە، گەلێکیان پێدا هەڵداوە و ڕاژەیانکردووە. بۆیە بەو شێوەیە، تەلاری کۆشکی ڕازاوەی زمان، هونەر و وێژەی نەتەوەیی خۆیان، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی نیشتمانەکانیان تێپەڕاندووە.

بۆ نموونە: هۆنەرێکی گەورەی بە ناوبانگی وەک: « دانتی »، لە هەموو بوارەکانی بزووتنەوەی « ڕووناکبیریی، وێژەیی، هونەریی، کاری ئەکادیمیی و ڕامیاریی »دا، شۆڕەسوارێکی بێ وێنەی سەردەمەکەی خۆی بووە. لەبری زمانی « لاتین »، زمانە نەتەوەییەکەی خۆی بەکارهێناوە. ئەو کەڵەنووسەر و زانا گەورەیە، دەربارەی زمانی نەتەوەیی، زۆر بە ڕوونیی گوتوویەتی: (زمانی نەتەوەیی، لە توانایدا هەیە، پاڵ بە گەلەوە بنێ، گۆڕانێکی بنەڕەتیی تێدا پێکبێنێ.)«93،3»

بەڵام، زمـان لای نەتـەوەی باڵادەس، نەک هەر پارێزراوە، نەک هـەر بە هەمـوو شێوەیە ڕاژەکراوە و پێشخراوە، بەڵکوو، زمانەکەی خۆشیان، بەزۆر، بە سەر گـرووپە ئـیتنیکەکـانی دیکەی ژێردەسی خـۆیانـدا سـەپاندووە، لە لایەن ڕۆڵە زیرەک و هـەڵکەوتووەکـانی ئەو نەتەوانەشـەوە، هێندەی دیکە ڕاژەکـراوە و بوژێنراوەتـەوە. جا ئەو سـەپاندنە، لە ڕێی دەسـەڵاتی دەوڵەتەوە بـووبێ، یا، بە هۆی زمـانی ئـایینی هاوبەشـەوە بووبێ، یا، بە هـۆی هەر دوو فـاکتـەرەکـەوە بووبێ، شـتێکی لە باسـەکە نەگۆڕیوە، وەک نەتەوە باڵادەسـەکـانی « عـەرەب، توورک و فـارس »، زمـانەکـانی خـۆیان، بە سـەر نەتەوەی بندەسی « کـورد »دا سەپاندووە! کەچیی، لای نانەتەوەییەکانی نەتەوەی بندەس: « کۆمۆنیست » و « ئیسلامیی »، هەرگیز، ئەو بایەخە گرنگە، بە زمـانی دایک نەدراوە. چونکە، هەم هـەست و هـۆشی نەتـەوەییـیـان لاوازبووە، هەم هـەمـیـشـە، لە بۆتەی بیـانییـپەرستـییـدا تواونەتەوە، لە ئاسـتی زمـانەکـەی خۆشیـاندا، کـەڕ و کاسبوون!

لە نێوان زمـانەکانی « عـەرەبیی، فارسیی و توورکیی » نەتەوە باڵادەسەکاندا، هەر لە کـۆنەوە تا ئەوڕۆ، بایەخـێکی یەکجـار زۆر، بە زمـانی عـەرەبیی دراوە. چونکە، زمـانی ئـاییـنی هـاوبەشی، هەمـوو گـرووپە ئـیتنیکەکـانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکـەرەکەی « کوردستـان » بووە. تەنانەت، هەر دوو نـــــەتەوەی « توورک » و « فـارس »یش، بایەخـێکی زۆریان، بە زمـانی عـەرەبیی داوە. ئەو بایەخدانەش بە شێوەیە بووە، هەمیشە هەوڵیانداوە، ڕۆڵەکـانی خۆیان و کورد هـاندەن، فـێری زمـانی عـەرەبیی بن. کەچیی، لە هەمـان کـاتیـشـدا، زمـانی کوردییان قەدەغەکردووە!

ئەوەتەی نەتەوەی کورد مـوسـوڵمـان بووە، ڕاژەی زمـان و کـەلتووری عـەرەب دەکا، بە شێوەیە، هێندەی ڕاژەی ئەو زمان و کەلتوورە کردووە، هێندە بایەخی بە زمـانەکـەی خـۆی نەداوە. بە تایبـەتیی، هێندەی لە کـۆندا، مـەلا و زانا مـوسـوڵمـانەکانی کـورد، خـۆیان مـاندووکـردووە و بایەخـیان بە « ڕێنووس، ڕێزمـان، وێژە و زمـان »ی عـەرەبیی داوە، نیـو هێندە، بایەخـیان بە زمـانە خۆڕسکە خواکردە زکمـاکەکەی خـۆیان نەداوە. بەڵگەشم ئەوەیە: گەر کـەمێ بایەخیان پێ بدایە، هەڵبەتە ئێستـە، زمانی کوردیی، بە جۆرێکی دیکە دەبوو، بۆ هـیچ ووشـەیە دا نەدەمـاین. ئەوانیش، لە لاپەڕەیەکی دیکەی گـەشـتـر و پرشنگدارتری مـێـژووی وێژەی کـوردییـدا، ناویان تۆمـاردەکرا! لەبەرئەوە، هەرچەندە زمانی عەرەبیی، بە زمـانی دەوڵەت و « قـورئان »یش ناسراوە، بەڵام لای من، هەر بە زمانێکی بیانیی و خۆسەپێنەری نەتەوەی باڵادەس دادەنرێ!*

ڕەنگە، هێندێ کورد هەبن، وا لەم دید و بۆچوونانەی من بگەن، ڕقوکینەیەکی زۆر، لە نێو دڵ و دەروونمدا، دژی نەتەوەی عەرەب و زمانی عەرەبیی پۆنگی خواردبێتەوە، بۆیە وا بەو شێوەیە و بێ پەردە، هەستی خۆم دەردەبڕم. بەڵام، لە ڕاستییدا، ئەمە وا نییە، بەڵکوو، تەنیا دەمەوێ، ڕاستیی ڕوونکەمەوە، بێ ئەوەی ڕقوکینە، تێکەڵاو بە لێکدانەوە و باسەکان بکەم. یا، هێندێ پێیانوابێ، ئەز تەنیا هەر، بە ووشەی عەرەبیی، هەناسەم توونددەبێ، لەشم دەخورێ و تەنگژە دەمگرێ. بەڵام، لە ڕاستییدا، نەک هەر لەشم بە ووشە و زاراوەی عەرەبیی لیردەکا، بەڵکوو، هەر هەمان باری سەرنج و تێبینییشم، بەرانبەر بە هەموو ووشە و زاراوەیەکی بیانیی هەیە، گەر ووشە و زاراوەی کوردیی هەبێ و بەکار نەهێنرێ. چونکە، ئەز پێموایە: گەر زمانی « لاتین » و زمانە « ئەورووپایی »یەکانی دیکە، بە چەن زمانێکی بیانیی دانرێن، ئەوا، لە هەمان کاتدا، هەر سێ زمانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، گەلێ لەو زمانانە، بە من نامۆ و بیانییترن. لەبەرئەوەی زمانی نەتەوە و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »ن و بە زۆر بە سەرماندا سەپێنراون!
هەڵبەتە، دید و بۆچوونەکان، سەبارەت بە چەمکی نامۆ و بیانییبوونی زمان، جیاوازییەکی زۆریان هەیە. بۆ نموونە: هەموو ئەو دید و بۆچوونانەی، « ناسیۆنالیست »ێکی کورد، دەربارەی زمان و نەتەوە هەیەتی، لای موسوڵمانەکان بە گشتیی و ئیسلامی ڕامیاریی بە تایبەتیی، جۆرێکی دیکەیە و هەرگیز وا نییە. چونکە، ئەوان ئەو سێ زمانە بە گشتیی و زمانی عەرەبیی بە تایبەتیی، بە چەن زمانێکی بیانیی نازانن. بەڵکوو، بە زمانی چەن نەتەوەیەکی برای هاوئایین دادەنێن. گومانیشم لەوە نییە، هەموو ئەندامێکی ئەو گرووپە ئیسلامییانەی « کوردستان »، تەنیا هەر بەو شێوەیە، لە واتای ووشەی نامۆ و بیانیی تێگەیشتوون، هەر بەو شێوەیەش، لەو زمانانە دەڕوانن و لە یەکدییان جیادەکەنەوە! چونکە، زمانی نەتەوەی داگیرکەری عەرەب، بە زمانێکی بیانیی نازانن، بەڵکوو، بە زمانێکی ڕەسەنی دەزانن و بگرە، لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆشیان، پتر خۆشیاندەوێ و بایەخی پێ دەدەن. عەرەبە داگیرکەرەکانیش، بە برای دایک و باوکی خۆیان دادەنێن. بەڵام، سەیر ئەوەیە، لە هەمان کاتدا بەو چاوە پڕ لە ڕێزەوە، لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆیان ناڕوانن، کوردە « سیکولار »ەکانیش، بە دوژمنی باوەکوشتە و سەرەکیی خۆیان دەزانن!
کەچیی، بەڵەنسی ئەم هاوکێشە گرنگە، هەرگیز تەواو نەبووە و تەواویش نییە. لەبەرئەوەی، لای زۆربەی هەرە زۆری، ڕۆڵەی نەتەوە باڵادەس و دەستەی

دەسەلاتدارانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، هەرگیز وا نەبووە و واش نییە. چونکە، چەن کەسێکی کەمی خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر و ڕامیاری هەڵکەوتووی وەک: « عەزیز شەریف، موعەمەر قەزافیی، سمایل بێشکچیی ... » نەبێ، ڕێزیان لە مافەکانی کورد گرتووە، ئەوانی دیکە، هەمیشە بە پێچەوانەوە ڕەفتاریانکردووە، بە تایبەتیی توورکەکان، چاویان بە هیچ جۆرە پێشکەوتنێکی کورد و سەربەخۆییەکی « کوردستان » هەڵ نەهاتووە و هەڵیش نایە! جا، هەر لە چەپڕەوەکانیانەوە، تا ڕاستڕەوەکانیان بگرە، هەر لە « سیکولار »ەکانیانەوە، تا بە « ئیسلامیی ڕامیاریی »ش دەگا، بە نێر و مێیانەوە، دانیان بە مافە نەتەوەیی، مرۆیی و دێمۆکراسییەکانی گەلی کورد، لە هیچ پارچەیەکی « کوردستان »دا نەناوە و ناشینێن. هەروەها، عەرەبەکان بە گشتیی، هەرگیز، باوەڕیان بە مافە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد لە « عێراق » و « سووریا »دا نەبووە و نییە. بەڵکوو کورد، بە یەکەمین ڕێگر و کۆسپی سەر ڕێی پێشکەوتنی عەرەب و سەربەخۆیی نیشتمانەکەیان دادەنێن. بە ناپاک و بەکرێگیراوی دەوڵەتەکانی بیانیی تاوانباریدەکەن، وەک لەم دواییانەدا، لە کەناڵی « ئەلجەزیرە »وە، چەن ڕووناکبیر و ژۆرنالیستێکی ناوداری وەک: دوکتۆر « فەیصەڵ ئەلقاسم » و « ئەحمەد مەنصوور »، زۆر بە ڕاشکاویی، ئەم چەن کەللەشەکرەیان شکاند!

جگە لەوەی، هەموو داگیرکەرانی « کوردستان » بێ جیاوازیی، چاویان لەو کەمە ئازادیی و نیمچە سەربەخۆییە بڕیوە، کە ئەوڕۆ لە « باشوور »دا هەیە و دەیانەوێ، ڕۆژێ زووتر، دەسیان ئاواڵەبێ، خۆیان بۆ لێدانی بزووتنەوەی کورد تەرخانکەن، ئەو سەربەستییەی بە خوێن سەندراوە، تێکیبدەنەوە و لەنێوی بەرن! چونکە، بە ناوی برای ئایینییەوە، هیچ مافێ بە کورد ڕەوا نابینن، تەنیا هەر ئەوە نەبێ، لە ژێر ئاڵای یەک دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلامییدا، تاهەتایە، ئەوان برا گەورە و ئێمەش برا پچووک بین، وەک چەندین سەدە دەبێ، بەو شێوەیە، نەتەوەی کوردیان چەوساندۆتەوە، بەو قەوانە سواوە، مێشکی ڕۆڵەکانیان پڕکردووە، بە هەزارانیان لێ فووداوە، بە ناوی ئایینەوە، وولاتانی گەلانی جیهانیان پێ داگیرکردوون و بە هەزاران ڕۆڵەی کوردیان، بە خۆڕایی و لە پێناوی هیچدا، لە بەرەکانی جەنگدا بەکوشتداوە. بە تایبەتیی، گرووپەکانی ئیسلامیی ڕامیاریی عەرەبە « سوننە »کان، گەر ئەوڕۆ دەسیان هەبێ، ئەوا، لە ئاخووندەکانی « ئێران » کەمترمان پێ ناکەن!

ئەز پێموایە: سەرەتاکانی ئایین بە گشتیی و ئایینی ئیسلام بە تایبەتیی، هەرگیز نەیانتوانیوە، چارەسەری کێشەی نەتەوایەتیی گەلانی جیاواز بکەن و

ناشیکەن. چونکە، لە لایەکەوە، هەم باوەڕیان پێی نەبووە و باوەڕیشیان پێی نییە. هەم لەو بوارەشدا، هیچیان پێ نەبووە و هیچیشیان پێ نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، لە سەردەمی پەیامبەران « موسا، عیسا و محەمەد »دا، گرفتی نەتەوەیی نەبووە، تا بە تەواویی لێی بکۆڵنەوە و چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە. بۆ نموونە: لە سەردەمی پەیامبەری ئیسلامدا، گەر گرفتی نەتەوەیی هەشبووبێ، هەرگیز، بەم شێوە گڕگرتووەی ئەوڕۆ نەبووە. تەنانەت، بەو شێوەیەی سەردەمی هەر دوو ئیمپراتۆریای عەرەبە موسوڵمانەکانی « ئەمەویی » و « عەباسیی » بە گشتیی و « توورکە عوسمانیی »یەکانیش بە تایبەتیی نەبووە، تا، تیۆریی تایبەتیی بۆ داڕێژێ و بڕیار لە سەر چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتیی بدرێ. لەبەرئەوە، ئەوەی دەیبیستین و دەیبینین، گوایە: هێندێ گرووپی ئیتنیکی دیارییکراو، لە هێندێ دەوڵەتدا، بە نێوی چەن گرووپ و ڕێکخراوێکی ئیسلامی ڕامیارییەوە، خۆیان ڕێکخستووە، ڕاپەڕیون، خەباتی چەکداریی دەکەن و داوای مافی چارەنووس دەکەن، تەنیا هەر ئەوەیە: ئایینەکەیان، لەگەڵ ئایینی نەتەوەی باڵادەسدا، جیاوازیی هەیە و نایانەوێ، لە بندەسی ئەواندا بن و فرمانڕەواییانبکەن!

بۆ نموونە: ڕۆڵەکانی گەلی موسوڵمانی چەوساوەی « فلەستین »، دژی هەموو دەزگە دەوڵەتیی و سەربازییەکانی دەوڵەتی « ئیسرایل » دەجەنگن. هەروەها، هەموو گەلانی دیکەی موسوڵمانی « کشمیر، فیلیپین، بۆسنە، چیچێنستان، کۆسۆڤۆ... »، دژی گەل و نەتەوە سەردەس و داگیرکەرەکانی « فەلە » خەبات دەکەن. بەڵام، گەر هاتوو، چەن گەلێکی دیکەی موسوڵمانی وەک: « عەرەب، توورک و فارس »، ئازادیی و سەربەخۆیی نەتەوەیی، لە چەن گەلێکی دیکەی موسوڵمانی وەک: « کورد، ئازەر، بلووژ ... » زەوتکەن، خاکەکەیان لێ داگیرکەن و بیانچەوسێننەوە، ئەوا دەبێ، هیچ نەڵێن و هیچ نەکەن، بەو فرمانڕەوایی و ژێردەسییەش قایلبن. چونکە، لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتێکی ئیسلامییدا دەژین و ئەمەش، لە لایەن یاسا و دەستووری ئیسلامەوە، بڕیاری لە سەر دراوە!

بۆیە، لە هیچ بەشێکی « کوردستان »دا، هیچ گرووپێکی ئیسلامی ڕامیاریی؛ سەر بە نەتەوە باڵادەسەکان نابینین، دان بە مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورددا بنێ! تەنانەت، گەر یەکێ لە گەلە موسوڵمانەکان، خاکی گەلێکی دیکەی ناموسوڵمانی وەک « جوو » یا « فەلە »ی داگیرکرد، ئەوا، بە هیچ شێوەیە بۆیان نییە، داوای مافی چارەنووسی خۆیان بکەن. بەڵکوو دەبێ، بەزۆریش بێ، هەر ملکەچی یاسا و بڕیارەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکە بن. نەک هەر

ئەوەش، بەڵکوو دەبێ، سەرانەش بە دەوڵەتە ئیسلامییەکە بدەن! بۆ نموونە: دەسەڵاتدارە عەرەبە موسوڵمانەکانی « سۆدان »، خاکی « فەلە » ڕەش پێستەکانی « خوارووی سۆدان »یان زەوتکردووە و دان بە مافەکانیشیاندا نانێن! یا، « توورکە عوسمانیی »یەکان، بە ناوی ئایینەوە، بە چ شێوەیەکی دڕندانە، قەلاچۆی گەلی « ئەرمەن »یان کرد!
بە ڕاستیی، ئەمە دید و بۆچوونی ڕامیاریی و نەتەوەیی ڕاستەقینەی، زۆربەی هەرە زۆری گەلە هاوئایینە « عەرەب، فارس و توورک »ەکانمانن. خۆشیان ئەوە ناشارنەوە، کە هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەدیی، بە نەتەوەی کورد بە گشتیی و گەلی کورد لە « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی ڕەوا نابینن. ئیدی، بۆچی دەبێ، بە برای خۆمانیان بزانین، هەر لەبەرئەوەی، یەک ئایینی هاوبەش کۆماندەکاتەوە؟!! ئاخر، گەر ئەو برایانە ئامادەبن، هاوکاریی لەگەڵ یەکدیدا بکەن، بۆ ئەوەی، گەلێکی موسوڵمانی دیکەی وەک کورد قڕکەن. یا، بە لانی کەمەوە نەیەڵن، لە هیچ بەشێکی نیشتمانەکەیدا، بە هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی خۆی بگا، برای چیمانن؟ گەر ئەوانە برابن، ئەدی دوژمن دەبێ، چۆن بێ؟!!
هەرچەندە، بە هەموو لێکدانەوەیەکیش بێ، چ لە کۆن و چ لە ئێستەشدا، نەتەوەی کورد، زۆر لەو نەتەوە سەردەسانە موسوڵمانتربووە و ئایینەکەشی، خاوێنتر ڕاگرتووە. بەڵام، ئەوان هەر خۆیان، بە موسوڵمانی ڕاستەقینە دەزانن و دان، بە هیچ مافێکی نەتەوەیی کورددا نانێن. چونکە، جگە لە نەتەوەی ئیسلام، باوەڕیان بە هیچ نەتەوەیەکی دیکە نییە. جگە لە مافی ئیسلامییش، باوەڕیان، بە هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و دیمۆکراسیی نییە و هەر بە « کفر »یشی دەزانن!
لەگەڵ ئەوەشدا، هەستی ئایینیی و هەستی نەتەوەیی خۆیان، زۆر زیرەکانە و ژیرانە تێکەڵاوکردووە، بە شێوەیەکی زۆر جوان، هەم دژی داگیرکەرانی وڵاتەکانیان، هەم دژی گەلە بندەسەکانی خۆیان، وەک چەکێکی دوودەم بەکاریانهێناوە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش بەکاریدێنن. لەبەرئەوە، لە کاتێکدا، دژی داگیرکەرانی بیانیی دەجەنگن، مافی گرووپە ئیتنیکەکانی بندەسی خۆشیان، ناسەلمێنن و قووتیدەدەن!
کەچیی، ئەم دید و بۆچوونە، بۆ گەلێکی موسوڵمانی وەک کورد، هەرگیز دەسی نەداوە و دەسیش نادا. چونکە، هەر دوو نەتەوەی داگیرکراو « کورد » و داگیرکەر « عەرەب، توورک و فارس »، یەک ئایینی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە. لەبەرئەوە نابێ، لە نێوان ئێمە و ئەواندا، بۆ خاڵی هاوبەش بگەڕێین، بەڵکوو

دەبێ، بۆ خاڵی ناکۆکیی بگەڕێین، تا بە هۆیەوە، خۆمان لەوان جیاکەینەوە، خـــۆمـــان لە خـــەڵەتاندن، چاوبەست، دادۆشـــینی ئابووریی، قـــووتدان و تواندنەوەی نەتەوەیی بپـــارێزین. لەم بوارەشـــدا، تەنیـــا هـــەر، چەکی زمـــان دەتوانێ، ئەو ڕۆڵە پیرۆزە بگێڕێ و ئەو کارە گرنگە جێبەجێکا.
هەرچەندە، هێندێ جار، گرووپە ئیسلامییەکانی « کوردستان »، هێندێ ئایەت و فەرموودەی پەیامبەر، بۆ مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیان دێننەوە و لێکدانەوەی تایبەتیی بۆ دەکەن. بەڵام لە ڕاستییدا، فری بە سەر مافی چارەنووسی نەتەوەکانەوە نییە! بەڵکوو، ئەوان دەیانەوێ، بە هەر شێوەیەبێ، لەگەڵ بەرنامە و ڕێبازی ڕامیاریی خۆیاندا بیانگونجێنن، تا ئەو کەلێنە گەورەیە، لە ئایینی ئیسلامدا پڕکەنەوە و ئەندامە دەروێش ئاساکانی خۆشیانی، پێ بخەڵەتێنن!#
هەرچی چۆنێبێ، گەر ئێمە هەموومان، لە یەک کاتدا، خۆمان بە کورد و موسوڵمان بزانین، دەبێ، بە هەموو لایەکمان، هەوڵ بۆ مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورد بدەین و خەباتی بۆ بکەین، لە ماڵە پچکۆلانەکەی خۆماندا، کوردێکی دڵسۆز و خواپەرستێکی ڕاستەقینە بین، وەک هەموو گەل و نەتەوەکانی جیهان، هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ وایان کردووە، بەڵەنسێکیان لە نێوان، ئەو دوو لایەنە گرنگ و پیرۆزەدا ڕاگرتووە، نەیانهێشتووە، « نە شیش بسووتێ و نە کەباب !»
ئەم ئەرکە گەورە و گرانە پیرۆزەش، پێش هەموو لایەنێ، بەرەوڕووی گرووپە ئیسلامییەکانی « کوردستان » دەبێتەوە. بۆ ئەوەی، لە لایەکەوە، دەسی ئەو داگیرکەرە بازرگانانەی ئایین، هەم بۆ ڕۆڵەکانی هەر دوو نەتەوەی سەردەس و بندەس، هەم بۆ هەموو گەلانی ئیسلامیی ئاشکراکەن، تا چی دیکە، بە ناوی ئایینەوە، کورد نەکوژن و خاکەکەی داگیر نەکەن! لە لایەکی دیکەشەوە، داکۆکیی لە مافە نەتەوەیی و دێمۆکراسییە ڕەواکانی نەتەوەی کورد بکەن، داوای دەوڵەتێکی سەربەخۆی یەکگرتووی « کوردستانیی »ش بکەن.
جا، گەر ئێستە، کەمێ لە پێوەندیی نێوان زمانی نەتەوەیی و زمانەکانی دیکەی گەلانی جیهان بدوێم، ئەوا دەڵێم: گومانی تێدا نییە، هەموو زمانەکان، بەپێی دوور و نزیکییان لە یەکدییەوە، بەگوێرەی پێشکەوتنی تێکنۆلۆژیا و زانست، کەڵک لە یەکدی وەردەگرن. بۆیە، ووشە و زاراوەی زمانەکان، تێکەڵ بە یەکدی دەبن و گەلەکان، ووشە لە یەکدی دەخوازن. بەڵام، ئەز بەپێی پێویستی نووسینەکەم، بەگوێرەی بوون، یا نەبوونی هێندێ ووشە و زاراوە لە زمانی کوردییدا، هەمیشە، پەنام بۆ بەر، زمانە جیاجیاکانی گەلانی جیاوازی

جیهان بردووه. ئیدی، بەو شێوەیەی گونجابێ و باوەڕم پێی بووبێ، ووشە و زاراوەی گونجاوم، لێ وەرگرتوون و بە شێوەیەکی شیاو، لە نووسینەکانمدا بەکارمهێناون.

لە ڕاستییدا، زۆربەی کات، پتر ووشە و زاراوەم، لە زمانی « لاتین » و زمانەکانی دیکەی گەلانی « ئەورووپا »وە وەرگرتووە، وەک لەوەی، پەنام بۆ بەر زمانەکانی « عەرەبیی، توورکیی یا فارسیی » بردبێ. چونکە، ووشە و زاراوەکانی زمانی « لاتین »، مولکی هیچ گرووپێکی ئیتنیک نین. بەڵکوو، مولکی هەموو کۆمەڵگەی مرۆن. بۆیە، هەموو گەل و نەتەوەیەک بۆی هەیە، بەکاریانبێنێ. بەڵام، زمانەکانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، مولکی ئەو سێ نەتەوە داگیرکەرەن، نەک هەر کورد بۆی هەیە، بەکاریانبێنێ، بەڵکوو، بەزۆریش بە سەریاندا سەپاندووە و دەشیسەپێنن، لە هەمان کاتیشدا، زمانە خواکردەکەی خۆشیان لێ قەدەغەکردووە!

هەروەها، تەنیا هەر کوردیش، ئەو زاراوە جیهانییانە بەکار ناهێنێ، بەڵکوو، زۆربەی زۆری گەلانی جیهان و نەتەوەی عەرەبیش بەکاریاندێنن. لە کاتێکدا، ئەوان وەک کورد، خاکیان داگیر نەکراوە، دەیان ساڵیش دەبێ، دەوڵەتی نەتەوەیی تایبەتیی خۆیان دامەزراندووە، چەندین دەزگەی « هونەریی، وێژەیی و زانستیی »شیان هەیە، ئینجا، هەر پەناش بۆ ئەو زاراوە جیهانییانە دەبەن. ئاخر، چی بکەن، گەر ئەو ووشە و زاراوانە بەکار نەهێنن؟ خۆ ناتوانن، هەموو ئەو ناو و زاراوانەی ئەوڕۆ هەن، وەک: « ڕادیۆ، تێلێفیزیۆن، ڤیدیۆ، سینەما، تێلێفۆن، کۆمپیوتەر، دیسک، کاسێت، کامێرا، فیلم، پرۆژێکتەر، فرێزەر، دێمۆکراسیی، دیکتاتۆریی، بۆرژوازیی، قانون، دوکتۆر، پرۆفیسۆر، گرووپ، فۆنەتیک، فۆنیم، پرۆژە، دیالۆگ، فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا ... » بگۆڕن و بەرانبەرەکانیان داتاشن! جا گەر ئەوان وابن و لە نووسینەکانیاندا، ئەو زاراوانە بەکاربێنن، ئەدی ئێمەی کورد، کە لە هەموو مافێکی نەتەوەیی خۆمان بێ بەشکراوین، گەر بەو شێوەیە نەیاننووسین و بەکاریان نەهێنین، دەبێ، بە چ شێوەیەکی دیکە بیاننووسین؟

ئەز پێموایە، خۆیان بەکاربێنین، گەلێ لەوە باشترە، زاراوەی نالەباریان بۆ داتاشین و واتای ڕاستەقینەی خۆشیان بەدەستەوە نەدەن! بە ڕاستیی، ئەم جۆرە ووشە و زاراوە ناسراو و گرنگانە، بە هیچ شێوەیە پێویست ناکا، زاراوەی دیکەیان بۆ داتاشرێ. چونکە، ڕۆڵەی گەل و نەتەوەکانی جیهان، زۆر بە ئاسانیی لێیان تێدەگەن، تا ئەو ووشە و زاراوانەی، زمانە زیندووەکانی گەلانی جیهانیش فێربن، گەلێ چاکترە و باشتریش، لە یەکدی تێدەگەن!¤

جگە لەوەی، هەمیشە، لە نێوان زمانی کوردیی و ئەو سێ زمانەی، نەتەوە داگیرکەرەکانی « عەرەب، فارس و توورک »دا جیاوازییمکردووە. چونکە، گەرچی زمانی « عەرەبیی »، زمانی ئایینی هاوبەش و دەوڵەتیش بێ، بەڵام، لە چاو زمانی « فارسیی »دا، زۆر لە زمانی « کوردیی »یەوە دوورە. ئەوە لەگەڵ زمانی « توورکیی »شدا، هەر بەراورد ناکرێن!

گەر لە بنچینەدا، هەر دوو زمانی فارسیی و کوردیی، یەک زمان نەبووبن، ئەوا گومانی تێدا نییە، سەر بە یەک گرووپە زمانن. لەبەرئەوە، زۆر لە یەکدییەوە نزیکن و کورد دەتوانێ، بە ئاسانیی، ووشەی لێ وەرگرێ. هەر وەک « هێمن »یش نووسیوێتی: (ئێمە نابێ، گوێ بدەینە شۆڤێنیستەکانی فارس، کە دەڵێن: کوردیی شێوەیەکی فارسییە. بۆ خۆمان دەزانین، زمانەکەمان: زمانێکی سەربەخۆیە و ناترسین و نایشارینەوە، کە خزمایەتیی وە تەک فارسییشدا هەیە. زۆر باش دەتوانین، ووشەی فارسیی وەرگرین، وەک ئەوان کە لە وەرگرتنی ووشەی کوردیی و هیچ زمانێکی دیکە سڵ ناکەن. بەڵام، هەق نییە، لەباتی ووشەی « مەزن، گەورە، زەلام و زل » ووشەی « بزرگ »ی فارسیی بنووسین. یا لەجیاتی « جوان، چەلەنگ، دەلال و شەنگ »ی خۆمان، ووشەی « قەشەنگ » لەکاربێنین، کە توورک و فارس، کێشەیان لە سەر هەیە.)«**28،4**»

پێموایە: ئەمە ڕێی ڕاست و بەکارهێنانی ووشەی بیانیی بێ، نەک تەنیا ووشەی عەرەبیی بەکاربێنین، چونکە موسوڵمانین و ووشەی زمانەکانی دیکەش پشگوێخەین، چونکە گەلەکانیان، سەر بە ئایینێکی دیکەن!

لە ڕاستییدا، عەرەبەکان، نەک هەر خاکەکەیان داگیرکردووین، بەڵکوو، زمانەکەشیان تێکداوین! چۆن؟ هەرچەندە، کورد ئەلفوبێی عەرەبیی بەکاردێنێ، بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، لەگەڵ سرووشت و خەسڵەتەکانی زمانی کوردییدا ناگونجێن. چونکە، جگە لەوەی، دوو زمانی جیاوازن، هەروەها، چۆن هێندێ پیتی وەک: « ث ، ذ ، ص ، ض ، ط ، ظ » لە زمانی کوردییدا نین، هەر بەو شێوەیەش، هێندێ پیتی ڕەسەنی کوردیی وەک: « پ، چ، ڕ، ژ، ڤ، گ، ڵ، ۆ، ێ » لە زمانی عەرەبییدا نین. بەڵام، ئەو پیتانە، لە زمانە « ئەورووپایی »یەکاندا هەن. لەبەرئەوە، گەلێ ووشە و زاراوەی جیاجیای زمانەکانی گەلانی جیهان، لە ڕێی زمانی عەرەبییەوە، لە زمانەکەماندا، بە هەڵە بڵاوبوونەتەوە. لەبەرئەوەی ئەوان، ئەو پیتانەیان نییە.

بۆیە، گەر هەر ووشەیە، ناوێ، یا زاراوەیەکمان، لە هەر زمانێکی بیانیی دیکەوە وەرگرت، دەبێ، ووشەکە لە زمانە نەتەوەییە ڕەسەنەکەی خۆیدا،

دەنگەکەی چۆن بێ، هەر بەو شێوەیەش بیلێینەوە. یا، خۆیان چۆنی دەنووسن، ئێمەش هەر بەو شێوەیە بینووسین. بەڵام، پیتی کوردیی بەکاربێنین.
لەبەرئەوە نابێ، بۆ ناوی « ئامێر، زاراوە جۆربەجۆرەکان، ناوی مانگەکان، گوند، شارۆچکە، شار و وولات »، وەک ڕۆڵەکانی نەتەوەی « عەرەب، توورک و فارس »ەکان بیاننووسین، بەڵکوو پێویستە، ئەو گەلانە خۆیان، چۆنی دەڵێن و دەنووسن، ئێمەش، هەر بەو شێوەیە بیاننووسین. نەک، لە زمانی عەرەبییەوە وەریانگرین و بەکاریانبێنین. بەڵکوو، لە زمانە سەرەکییەکەی خۆیانەوە وەریانگرین. چونکە، ئێمە ئەو پیتانەمان هەن.
بۆ نموونە: ناوی دەوڵەتی « **Portugal** »، تەنیا هەر دەبێ، بە پیتی کوردیی و بە « پورتوگال » بنووسرێ، نەک گوتن و نووسینەکەی، لە زمانی دووەمەوە وەرگرین. چونکە، عەرەب پیتی « پ ــ گ »یان نییە و بە « برتغال » دەینووسن. یا، لەبەرئەوەی فارسەکان، بە دەوڵەتی « پورتوگال » دەڵێن: « پرتەقاڵ »، ئیدی کوردەکانی « ڕۆژهەلات »یش دەبێ، لەبەر خاتری چاوی کاڵی ئەوان، هەر ئەو ناوە بەکاربێنن. ئەدی ئەو کاتە، چۆن جیاوازیی لە نێوان « پرتەقاڵ »ی میوە و « پورتوگال »ی وولاتدا دەکەن؟!!
یا، « ڕووس »ەکان خۆیان، بە پێتەختەکەیان دەڵێن: « **Moskva** ». کەچیی، لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبییدا، پیتی « ڤ ــ **V** » نییە، عەرەبەکان بە « موسکو »ی دەنووسن و دەخوێننەوە، لە کاتێکدا، ڕاستەکەی « مەسکڤە »یە.
یا « **Chile** »، لەبەرئەوەی لە زمانی عەرەبییدا، پیتی « چ ــ **CH** » نییە، عەرەبەکان بە « شیلی » دەینووسن. هەروەها ناوی « چیچێن » بە « شیشان » دەخوێننەوە. بۆیە نابێ، ئێمەی کوردیش، لە عەرەبەکانەوە وەریانگرین. چونکە، عەرەبیی و کوردیی، دوو زمانی جیاوازن و دەبێ، لە زمانە ڕەسەنەکەوە وەریانگرین، بە « چیلی » و « چیچێن » بیاننووسین.
یا، با تەماشای ناوی وولاتی « مصر » بکەین. لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا، بە « **Egypt** » دەنووسرێ. بەڵام، چونکە « مصر » وولاتێکی عەرەبییە، لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیاندا بە « مصر » دەنووسرێ و دەخوێندرێتەوە، ئێمەی کوردیش دەبێ، لە عەرەبەکانەوە بیخوازین، بە پیتی کوردیی و بە « میسر» بینووسین.
هەروەها « **Japan** ،**America** ،**Polen** ،**Gabon** ،**Gambia** ،**Ghana**، **Vatikan** ،**Vietnam** و **Venezuela** »، عەرەبەکان بە « یابان، امریکا، بولونیا، کابون، کامبیا، کانا، فاتیکان، فیتنام و فنزویلا » دەیاننووسن.

بەلام، ڕاستر وایە، بە « ژاپۆن، ئەمێریکا، پۆلۆن، گابۆن، گانا، گامبیا، ڤاتیکان، ڤیێتنام و ڤێنزەوێلا » بنووسرێن.
لە کۆتاییشدا، تەنیا هەر ئەوە ماوە، بە هێندێ بۆچوونی تایبەتیی خۆم، کۆتایی بەم گوتارە بێنم، کە لە نێوان ساڵەکانی « **1996** - **1999** »دا نووسیومن و ئێستەش، دووبارەیاندەکەمەوە: (هەر چەندە، ووشەی بیانیی ناتوانێ، کار لە تایبەتمەندیی هیچ جۆرە زمانێ بکا، زمانەکە بگۆڕێ، یا ڕێزمان و ووشەکانی زمان تێکدا. بەلام، هەر چۆنێبێ، تا زمان، لە ووشەی بیانیی خاوێنکرێتەوە، تا پاک ڕاگیرێ، تا ڕاژەکرێ، هێندەی دیکە، زمانەکە دەبوژێتەوە، شیرینتر، گەشاوەتر، جوانتر دەبێ و پێشتردەکەوێ.
لەگەڵ ئەم ڕاستییانەشدا دەبێ، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵدەین، زمانەکەمان، لە ووشەی بیانیی بژارکەین. چونکە، گەر ئەم کارە نەکەین، هەر بڵێین: تازە ئەو ووشانە کوردێنراون، وەک ئەوە وایە، بڵێین: لە مێژە کورد لەگەڵ « فارس، عەرەب و توورک »دا تێکەلاوبوون، لە سنووری ئەو دەوڵەتانەدا، پێکەوە دەژین، تازە پێکەوە ڕاهاتوون، ئیدی، سەری خۆمان بۆ بیەشێنین، داوای ماف و دەوڵەت بکەین؟)«**449،1**»

**ستۆکهۆلم**

**2004. 04. 24**

* * *

---

**تێبینیی:**

*** بۆ زانیاریی پتر، تەماشای بابەتەکانی « زمانی ئایین و زمانی نەتەوەیی، زمانی دەوڵەت و زمانی نەتەوەیی » لاپەڕە « 74 - 140 »، پەرتووکی « سەلیقەی زمانەوانیی » نووسەر بکە، زۆر بە درێژیی باسکراوە.**

**# لە سەر نووسینەکانی مامۆستا « عەلی باپیر »، کۆلینەوەیەکی تایبەتییم نووسیوە. بەلام، دۆستایەتیی و ئەمەکداریم، ڕێی پێ نەدام و بە ڕاستم نەزانی، تا خۆی لە زینداندا بێ، بلاویکەمەوە!**

**¤ بۆ زانیاریی پتر، تەماشای « سەلیقەی زمانەوانیی »، لاپەڕە « 433 - 449 » بکە، بە درێژیی باسکراوە. لێرەدا نامەوێ، لەوە پتر لێی بدوێم.**

**سەرچاوەکان:**

1. حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چاپی1، چاپخانەی هەواڵ، کوردستان ـ سولەیمانیی، 1999.
2. حوسێن محەمەد عەزیز، سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن، چاپی1، چاپخانەی سیما، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2003.
3. د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، رێنیسانس، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، چاپی1، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، 1984.
4. هێمن، پاشەڕۆک، چاپی2، چاپخانەی پیرۆز، مهاباد، خاکەلێوەی 1362 هەتاوی.

# واتای زمانەوانیی و ڕامیاریی، زاراوەکانی « کەمەنەتەوەیی، گەل و نەتەوە »

بە داخێکی زۆرەوە، زمانەکەشمان، وەک زۆر شتی دیکە، بە دەسی ئانقەس بێ، یا، لە نەزانینەوە بێ، تا ئەندازەیەکی باش، شێوێنراوە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش دەشێوێنرێ. دەتوانم، بڵێم: هێندەی ئەوڕۆ، زمانی کوردیی دەشێوێنرێ، هێندە لە ڕابردوودا نەشێوێنراوە. چونکە لە کۆندا، هێندە نووسەرمان زۆر نەبووە، هێندە نامیلکە و پەرتووک نەدەنووسران، هەمووی چەن ڕۆژنامە و گۆڤارێکی کوردیی دەردەچوون، چەن نووسەر و شارەزایەکی زمانی کوردیی، تێیاندا دەنووسی و سەرپەرشتییاندەکرد. بەڵام، پەنا بە خوا! ئەوڕۆ هەرچی هەڵدەسێ و دەسی پێنووس دەگرێ، دەنووسێ! ئەوە جگە لەوەی، هۆکانی ڕاگەیاندن بە هەر سێ بەشەکەیەوە: « بیستن: ڕادیۆ، بینین: تێلێڤیزیۆن " نێوخۆیی و ئاسمانیی "، نووسین: ڕۆژنامە و گۆڤار » هێندە زۆربوون، هەر بێ تامبووە! زۆربەی زۆری ئەو نووسینانەی بڵاویشدەکرێنەوە، چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بێ، گەلێ لاوازن، بێ پێز و هێزن، بێ تام و چێژن، بێ بۆن و بەرامەن، زمانی نووسینەکانیان سفتوسۆڵ، بێ گرێوگۆڵ، شیرین و ڕەوان، تەڕوپاراو نین، بایەخێکی زۆر، بە زمانی نووسین نادرێ، داڕشتنەکانیان بە ئاشکرا، لەنگیی پێوە دیارە، شێوازی نووسینیان، جوان نییە و نووسەر لەگەڵ نووسینەکەی خۆیدا، زۆر خۆی ماندوو ناکا. هەروەها، هەڵەیەکی زۆری چاپ، ڕێنووس و زمانەوانیی تێدا هەیە، زۆربەی بابەتەکانیش، تەنیا هەر دووبارەکردنەوە و جوونەوە نەبێ، شتێکی دیکەی نوێیان تێدا نییە!

لە زمـانـی کـوردییـدا، هێندێ ووشـە هەن، هەر لـە کـۆنەوە تا ئـەورۆ، لە لایەن کـۆمەڵانی خـەڵکەوە، بە هـەڵە بەکارهـێنراون و بە هەڵەش بـەکاردێنرێن. بۆیە پێـویسـتـە، ڕاسـتکرێنەوە و بـە شـێـوەیەکی ڕاست و گـونجـاو، لە ئاخـافتن و نووسـیندا بەکاربـێنرێن. سـەیر ئـەوەیە، خـوێندەوار، ڕووناکـبـیـر و نووسـەرانی کورد، خۆشیان باش دەزانن و دانیشـی پێدا دەنێن، کە ئەو ووشانە، بە هەڵە بەکـارهێنراون، تـەنانـەت، بە « هـەڵـەی باو » ناودەبرێن، وەک: « بەرگـریی و داکۆکیی، کاریگەریی و کارتێکردن، بایەخ و گرنگ، شێوە و شێواز، بەند و بەندە، کـەمەنەتـەوەیی، میللەت، گـەل و نەتـەوە ... » جا، گـەر هەر بەو شێـوە هـەڵەیە، بە سـەرماندا تێپەڕن، دوور نییە، وەک زۆر شتی دیکەی ڕۆشتووە، لە پاشەڕۆژدا، زیانی لێ نەکەین!
لەم گـوتارەدا، بایەخـێکی تایبـەتیی، بە چەن زاراوەیەکی ئیتنیکیی دەدەم، تا لەو بارەیەوە، هێندێ ڕاستیی، بۆ خـوێنەران ڕوونکەمەوە و چی دیکە لەوە پتر، بە هـەڵە بەکـار نـەهێنرێن. هەرچـەندە، چەن جـارێکی دیکـەش، لە سـەر ئەم بابەتەم نووسـیوە، بەڵام، لەوە دەچـێ، کورد نەخـوێنێتـەوە، یا بخـوێنێـتـەوە و کەڵک لە خـوێندنەوە وەر نەگرێ، یا، کەس گـوێ لە کـەس نەگرێ! چونکە، هەر چی هەڵدەسێ، تـەنیا هـەر، بە سـەنگ و تەرازووی خـۆی، شتـەکان دەکێشـێ.
ئەمـەش، نیشـانەی ئەو پەڕی « گـەڕەلاوژێ، گاڵتـەجاڕیی، پاشاگـەردانیی و مالـوێرانیی » زمانەوانیی نەبێ، نیشانـەی هیچ شتێکی دیکە نییە! لەبەرئەوە، گـەلێ جـار، زاراوەی داتـاشـراوی وام گـوێ لێ دەبێ، یا، بـەر چاوم دەکـەوێ، گومـانیان لێ دەکەم، کـوردیی بن! بە ڕاستیی، ئـەمە نە نیشـانەی دەوڵەمەندیی زمانە و نە پێشکەوتنی زمانی کوردییش پیشاندەدا!
هەڵبەتە، هێندێ زاراوەی ئیتنیی هەن، پێبەپێی باری سەرنجی « ئایدۆلۆژیای ڕامیاریی، بنەمای فەلسەفیی جیاواز و دیدی ئایینە جیاجیاکان » دەگۆڕێن.
بۆ نموونە: ئایینی ئیسلام، هەمـوو گەلانی مـوسـوڵمانی سـەر ڕووی زەوی، بە یەک نەتەوە دادەنێ، ئەویش نەتەوەی ئیسلامە. ئەز لێرەدا، مەبەستم لەو دیدە ئایینییە نییە. بەڵکوو هەوڵدەدەم، ئەو زاراوانـە، لە ڕووی « ئیتنیی، ڕامیاریی و زمانەوانیی »یەوە ڕوونکەمەوە.
دەبێ، ئـەوەش بزانین، « جـۆگـەلە، ڕووبار، زەریا و ئۆقـیـانووس »ەکـان، با هەمووشـیـان هەر لە ئاو پێکهـاتبن، چۆن لە نێو خـۆیاندا، لە خـەسڵـەتەکانی چەندێتیی و چۆنێتیدا جیاوازییان هـەیە، هەر بـەو شێوەیەش، « کەمینە، گەل و نەتـەوە »ش، با هەمـووشـیـان، هـەر گـرووپی ئیـتنیی بـن، لەگـەڵ یەکـدیدا جیـاوازییـان هەیە. بۆیە دەبێ، هەر زاراوەیەک، پێناسـەی تایبـەتیی خـۆی بۆ

بکرێ، له جێی تایبەتیی خۆیدا دانرێ، بەپێی واتای تەواو و دیارییکراوی خۆی بەکاربێنرێ.
جا ئێستە، با بزانین، هەر یەکێ لەو زاراوە ئیتنیکانە، واتایان چییە و چی دەگەیەنن؟ کەی و لە کوێدا بەکاردێنرێن؟ چونکە، گەر ئێستە، لە ڕێی هۆکانی ڕاگەیاندن، بلاوکراوەی ڕێکخراو و پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان »ەوە، ئەو زاراوە ئیتنیکانە، بە هەڵە بەکاربێنرێن، ئەوا، بێ ئەوەی پێ بزانین، خۆمان تووشی گرفتێکی گەورە دەکەین.
گەر واز لە « تیرە، هۆز و خێڵ » بێنین، بەو پێیەی، بە چەن پێکهاتەیەکی بنچینەیی، گەل و نەتەوە دادەنرێن، ئەوا باسەکەم، لە پچووکەوە بۆ گەورە دەسپێدەکەم. واتە: زاراوە ئیتنیکەکان، لە ڕووی واتا و ناوەڕۆکەوە، لە چەن بەشێکی وەک: « گرووپە ئیتنیکە پچووکەکان، کەمەنەتەوەیی، گەل و نەتەوە » پێکدێن. لێرەدا هەوڵدەدەم، زۆر بە کورتیی، لێیان بدوێم، لە هەر دوو دەوڵەتە « ناسیۆنال » و « تێریتۆریاڵ »ەکانیشدا، نموونەیان لە سەر بێنمەوە.
هەروەها، گەر نەتەوەیەک یەکگرتووبێ، یا، پارچەپارچەکراوبێ، بەو بەشانەی نەتەوەکە دەڵێن چی؟
هەموومان دەزانین، هەر لە کۆنەوە، « کوردستان » خاکی نەتەوەی کورد بووە، بۆیە، ئەو ناوەشیان بە سەردا دابڕیوە. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، ئەوەش باش دەزانین، لەم جیهانەدا، هیچ نیشتمان و دەوڵەتێ نییە، گرووپی ئیتنیی جیاوازی تێدا نەژی. جا، ئەو گرووپە ئیتنیکانە، هەر لە بنەڕەتدا، لەو وڵاتەدا بووبن، یا، لە ئەنجامی کۆچوڕەودا هاتبن، یا، بە زۆر هێنرابن و نیشتەجێکرابن، ئەوەیان، باسێکی دیکە لە خۆی دەگرێ.
بۆ نموونە: لە شارێکی وەک « کەرکووک »دا، جگە لە کورد، چەن کەمینەیەکی نەتەوەیی وەک: « عەرەب، توورکمان، ئەرمەن، کلدان و ئاشووریی »شی تێدا دەژی. ئیدی، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، ئەو گرووپە ئیتنیکانە، خاوەنی خاکی خۆیان بن. بەڵام، هەر لە کۆنەوە، شانبەشانی ڕۆڵەکانی کورد، لەو شارەدا ژیاون و شارەکەش، وەک شارێکی هاوبەشی لێهاتووە. لەبەرئەوە، تا ئەو گرووپانە پێیان خۆشبێ، لە ئەو شارە بژین، بە مەرجێ، زیان بە کورد نەگەیەنن، دژی کێشە نەتەوەیی و ڕامیارییە ڕەواکەی نەوەستن، باوەڕ ناکەم، هیچ کوردێ هەبێ، لە گوڵ کاڵتریان پێ بڵێ! بەڵام، بە پێچەوانەوە، بەپێی هەموو یاسایەکی زەمینیی و ئاسمانیی، گەر ئەو بارە ناسکەی کورد ڕەچاو نەکەن، هەست و هۆشی نەتەوەیی، ڕۆڵەکانی کورد بریندارکەن، ئەوا، بۆیان نییە، لەو خاکەدا بژین!

ئەورۆ، بە ئاشكرا دەبینین: لە سایەی ئەو كەمە ئازادیی و دیمۆكراسییەی، لە « باشووری كوردستان »دا هەیە، كەمینەی « توركمان » زیندووبوونەتەوە، ئازادییەكی تەواویان هەیە و كاربەدەسانی كورد، یارمەتییاندەدەن و پشتگیرییاندەكەن. بەڵام، تا دوێنێ بوو، سەرانی ڕژێمی فاشستی گۆڕبەگۆڕی « بەعس »، نەك هەر بە كەمینەی نەتەوەییشی دا نەدەنان، بەڵكوو، زۆر بە ئاشكراش دەیانگوت: لە « عێراق »دا، تەنیا هەر دوو گەلی جیاوازی تێدا هەیە، ئەوانی دیكە دەبێ، خۆیان بە ڕۆڵەی یەكێ لەو دوو گەلە بناسێنن. لەبەرئەوە، لە سەرژمێری گشتیی « عێراق »دا، لە لایەن ڕژێمی « بەعس »ەوە ناچاركران، خۆیان بە « عەرەب »، یا بە « كورد » بنووسن! كەچیی ئەورۆ، دەڵێن: ئێمە نەتەوەین و « كەركووك »یش، بە شارێكی دێرینی « توركمان » دادەنێن!

مەبەست لە « گرووپە ئێتنیكە پچووكەكان » ئەوەیە: هێندێ لە ڕۆڵەكانی نەتەوەیەكی دیارییكراو، یا، بەشێ لە تیرە و هۆزێكی تایبەتیی، لە بەر هەر هۆیە بێ، لە نیشتمانەكەی خۆیان دادەبڕێن و پەرەوازەدەبن، لە وڵاتێكی دیكە دەگیرسێنەوە و نیشتەجێدەبن. ئیدی، نەوە دوای نەوە، لەو وڵاتەدا دەژین و وایان لێدێ، بە تەواویی، بە خەڵكی ئەو وڵاتە دەژمێررێن و ڕەگەزنامەی ئەو دەوڵەتەش وەردەگرن. بەڵام، هەر بە ڕۆڵەی نەتەوە ڕەسەنەكەی خۆیان دەژمێررێن. پێناسەكەشیان ئەوەیە: بە ژمارە زۆر كەمن، پەرشوبڵاون، نە خاكیان هەیە، نە مێژوویەكی نەتەوەیی تایبەتییشیان، لەو وڵاتانەدا هەیە. بەڵكوو، مێژووەكەیان، لەگەڵ مێژووی نەتەوە و دەوڵەتی دەسەڵاتداردا تێكەڵاودەبێ. شانازیی بە پێناسەی ئەو دەوڵەتەوە دەكەن، كە تێیدا دەژین. گەر حسێبێكیش، بۆ هەستی نەتەوەیی خۆیان بكەن، ئەوا، پتر شانازیی بە مێژووی نەتەوەیی خۆیانەوە دەكەن، یا، شانازیی بە هەر دوو مێژووەكەوە دەكەن. چونكە، لە یەك كاتدا، هاووڵاتی ئەو دەوڵەتەن و بە بەشێكی لەبنەهاتووی نەتەوەكەی خۆشیان دادەنرێن. بۆ نموونە: ڕۆڵەكانی كورد لە « ئوردوون، یەمەن، لوبنان، پاكستان ... »، وەك گرووپێكی پچكۆلانەی ئێتنیكیی، حسێبیان بۆ دەكرێ!

بەڵام، « كەمینەی نەتەوەیی »، جگە لەوەی، خاوەنی خاكی تایبەتیی خۆی نییە، واتە: لە یەك هەرێمی جوگرافیایی دیارییكراودا ناژی و هەموو ڕۆڵەكانی، لە نێوچەیەكدا كۆ نەبوونەتەوە، هەموو مەرجەكانی دیكەی نەتەوایەتییان تێدا هەیە. بۆ نموونە: « توركمان، ئاشووریی و كلدان »، لە « باشووری كوردستان » و « عێراق »دا، وەك چەن كەمینەیەكی نەتەوەیی ناسراون. بەڵام،

لەگەڵ « گرووپە ئێتنیکە پچووکەکان »دا، جیاوازییەکەیان ئەوەیە: ژمارەیان زۆر زیاترە و مێژوویەکی نەتەوەیی تایبەتییشیان هەیە. لە هەمان کاتیشدا، هەر دوو گرووپەکە، بە بەشێ لە نەتەوەکانی خۆیان دادەنرێن.

« میللەت »، لە زمانی « عەرەبیی » و لە « قورئان »دا، هەر لە کۆنەوە، بۆ کۆمەڵێکی دیارییکراوی، سەر بە ئایینێکی تایبەتیی بەکارهێنراوە. بەڵام، لە نێو کورددا، لە جێی « گەل » بەکارهاتووە. هەڵبەتە، « میللەت » ووشەیەکی کوردیی ڕەسەن نییە، بەڵکوو، ووشەیەکی « ئیسلامیی ـ عەرەبیی »یە، لە ڕێی ئایینی ئیسلامەوە، لە زمانی هێندێ لە گەلە موسوڵمانەکانی وەک: « کورد، فارس، تاژیک، توورک، ئوزبێک، ئازەر ... »دا بڵاوبۆتەوە.

ووشەی « میللەت » لە قورئانی پیرۆزدا، بە « ملە ـ ملت » هاتووە و چەن جارێ دووبارەبۆتەوە. وەک ئەوەی، پەروەردگار لە سورەتی « ئەلنەحل »دا فەرموویەتی: (ثم اوحینا الیک ان اتبع ملە ابراهیم حنیفا و ما کان من المشرکین). ئەم ووشەیە لە بنەڕەتدا، لە قورئاندا، بۆ مەبەستێکی تایبەتیی و (بۆ دیارییکردنی " کۆمەڵگەی ناموسوڵمان " بەکارهێنراوە) بەڵام ئێستە، بۆ ئەو مەبەستە بەکار ناهێنرێ و واتاکەی گۆڕاوە. هەرچەندە، (هێندێک لە گەلە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵات، بە تایبەتیی توورک و فارس و تەنانەت کوردیش، ئەم ووشەیەیان لە عەرەبەوە وەرگرتووە، کەچیی، بە مانای بنەڕەتیی خۆی بەکاری ناهێنن، بەڵکوو، بە مانای « گەل »ی کوردیی و « **People** »ی ئینگلیزیی و « **Volk** »ی ئەڵمانیی و هێندێ جاری دیکەش، بەرامبەر " نەتەوە **Nation** " بەکاریدەبەن، وەک ئەوەی دەبێژن: **Turk Milleti**، " گەل یا نەتەوەی تورک " ، ملت فارس " گەل یا نەتەوەی فارس " ، میللەتی کورد " گەل یا نەتەوەی کورد " )«**10،1**»

« گەل »، ووشەیەکی کوردیی پەتیی و ڕەسەنە. بۆ یەکەمین جار، وەک زاراوەیەکی ئێتنیک، لە ساڵانی سیی و چلەکانی سەدەی بیستەمدا، لە نووسینەکانی گۆڤاری « گەلاوێژ »دا دەرکەوت. ووشەی گەل لە زمانی کوردییدا، پتر بە کۆمەڵ دێ، وەک: « گەلەگورگ، سەگەل ـ سەگ گەل، مێگەل، کوڕگەل ... »، واتە: کۆمەڵێ « گورگ، سەگ، مەڕ، کوڕ ... ». پێوەندیی نێوان « گەل » و « نەتەوە »، وەک دوو زاراوەی ئێتنیک، وەک پێوەندیی نێوان، « بەش » و « گشت » وایە. واتە: هەموو گەلێ، بە بەشێ لە نەتەوە ڕەسەنەکەی خۆی دەژمێررێ و هەموو مەرجەکانی درووستبوونی هەمان نەتەوەی « زمان، خاک، مێژوو ... » دایکییشی تێدا هەیە. بەڵام، بەگوێرەی باری نەتەوەیی و ڕامیاریی، گەل دوو شێوەی جیاوازی هەیە:

1. گەلی بندەس و چەوساوە: ئەو بەشەیە، کە لە نەتەوە ڕەسەنەکەی خۆی پچڕاوە، خاکەکەی داگیرکراوە، ڕۆڵەکانی دابەشبووە، ئازادیی نەتەوەیی پێشێلکراوە و خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆشی نییە. بۆ نموونە: گەلی کورد لە « توورکیا »دا، بەشێکی گرنگ، لە نەتەوەی کورد پێکدێنێ و بە بەشێ لە نەتەوەی « توورک » نازمێررێ. هەروەها، گەلی « فلەستین »، بەشێ لە گەلی « ئیسرایل » نییە، بەڵکوو، بە بەشێ لە نەتەوەی « عەرەب » دادەنرێ!
2. گەلی سەربەخۆ و سەربەست: ئەم بەشە، لەگەڵ ئەوەشدا، سەربەستیی نەتەوەیی خۆی هەیە و دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆشی دامەزراندووە، بەڵام، لە بەر هەر هۆیە بێ، لە نەتەوەکەی خۆی پچڕاوە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکە هەموویان، لە ژێر سایەی، ئاڵای یەک دەوڵەتی نەتەوەیی یەککگرتوودا، پێکەوە نازین. بۆ نموونە: گەلی عەرەبی « میسر»، سەربەخۆیی نەتەوەیی و دەوڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە، بەشێکیش لە نەتەوەی عەرەب پێکدێنێ. کەچیی، لەگەڵ گەلانی دیکەی عەرەبی « سعوودیە، یەمەن، سۆدان، لیبیا، جەزایر ... »، بە هۆی بەرژەوەندیی دەوڵەت و جیاوازیی نێوچەی جوگرافیاوە، لە یەکدی دابڕوان. تەنانەت، لە هێندێ خەسڵەتی وەک « دیالێکت، کەلتوور و خووڕەوشت »یشدا، جیاوازییان هەیە. هەروەها، هەر دوو گەلی باشوور و باکووری « کۆریا »، بە هەر دووکیان نەتەوەی « کۆریی » پێکدێنن. بەڵام، سنووری نێوان دەوڵەتەکانیان، ڕۆڵەی ئەو دوو گەلەی لە یەکدی کردووە!
« نەتەوە »، دەربارەی پێناسە و مەرجەکانی نەتەوە، دید و بۆچوونی جیاواز هەیە. ئەو دید و بۆچوونانەش، بەگوێرەی بیر و فەلسەفە جیاجیاکان دەگۆڕێن. هەرچی چۆنێبێ، هەموو زانا و بیریارەکان، لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون، نەتەوە: بە ئەو کۆمەڵە خەڵکە دەگوترێ، بە زمانێکی تایبەتیی دەپەیڤن، لە سەر خاکێکی دیارییکراو دەژین، مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە، خاوەنی خووڕەوشتێکی تایبەتن، هەستێکی نەتەوەیی خاوێن و خۆڕسکی هاوبەش کۆیاندەکاتەوە!
نەتەوە، بە گەورەترین زاراوەی گرووپە ئێتنیکەکان دەژمێررێ. هەروەها، نەتەوەش وەک گەل، لە ڕووی سەربەخۆیی و سەربەستیی نەتەوەیی و ڕامیارییەوە، هەر لە کۆنەوە، چەن جۆرێکی هەبووە و هەیە:
1. نەتەوەی بندەس: ئەم جۆرە نەتەوەیە، سەربەخۆیی و سەربەستیی نەتەوەیی خۆی لەدەسداوە. لە ژێر باری ژێردەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی و ڕامیارییدا دەناڵێنێ و خاوەنی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆی نییە. ئەمەش، دوو شێوەی جیاوازی هەیە: نەتەوە هەبووە، خاکەکەی دابەش نەکراوە و لە

ژێردەسی یەک دەوڵەتی داگیرکەردا بووە. بۆ نموونە: نەتەوەی « فارس »، سەردەمێ لە بندەسی « گریکیی »یەکاندا بووە. نەتەوەش هەبووە و ئێستەش هەر هەیە، خاکەکەی دابەشکراوە و هەر بەشێکیشی، لە لایەن داگیرکەرێکی جیاوازەوە، دەسی بە سەردا گیراوە، وەک نەتەوەی « کورد، باسک و مەکەدۆنیی ».

2. نەتەوەی سەربەست: مەبەست لە ئەو نەتەوانەیە، کە لە دەس ژێردەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی ڕزگاریانبووە و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دامەزراندووە. بەڵام دیسانەوە، ئەم جۆرەشیان، دوو شێوەی جیاوازی هەیە: نەتەوە هەیە، یەکگرتووبووە و یەکگرتووشە، یەک دەوڵەتی ناسیۆنالی یەکگرتووی دامەزراندووە و هەموو ڕۆڵەکانیشی، لە ژێر سێبەری، یەک ئالادا کۆکردۆتەوە، وەک نەتەوەی « ڕووس ».

شێوەی دووەمیان: هەرچەندە، نەتەوەکە ئازادە، بەڵام، خاکەکەی یەکگرتوو نییە، یەک دەوڵەتی یەکگرتووی ناسیۆنال، هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەکە کۆ ناکاتەوە. بەڵکوو، نەتەوەکە بە سەر چەن دەوڵەتێکدا دابەشبووە، سنووری ئەو دەوڵەتانە، وەک تەلێکی کارەبا، ڕۆڵەکانی لە یەکدی دابڕیوە، بۆ نموونە: نەتەوەی « عەرەب و کۆریا ».

بە ئەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، هەر نەتەوەیە، بەشێ لە ڕۆڵەکانی و پارچەیە لە خاکەکەی لێ جیابۆوە، بە « گەل » دادەنرێ. ئەمەش، لە ئەنجامی ئەوەوە دروستبووە، کاتێ دەوڵەت و ئیمپراتۆریا گەورەکانی جیهان، دەسەلاتیان هەبووە، خاکی هێندێ لە نەتەوەکانیان داگیرکردووە، بە سەر خۆیاندا دابەشیانکردوون و ڕۆڵەکانیان لە یەکدی دابڕیون.

لە کۆندا، کەم نەتەوە هەبووە، تووشی ئەم گرفتە نەتەوەییە گەورەیە نەبووبێ، بەشێکی گەورە، یا گچکەی لێ نەپچڕابێ، وەک نەتەوەی « پۆڵۆنیی، مەکەدۆنیی، باسک، ئازەر، تاژیک، ئەڵمان، عەرەب، کورد، کۆریی، ڤێتنام... » تەنانەت، عەرەبەکان نەک هەر، بە سەر چەن دەوڵەتێکی عەرەبیی و ناعەرەبییشدا دابەشبوون. بەڵکوو، ماوەی هەشت ساڵ لەمەوبەریش، دوو دەوڵەتی عەرەبیی « یەمەن » هەبوو، هەر دەوڵەتێ، لە بەر ڕۆشنایی ئایدۆلۆژیایەکی ڕامیاریی جیاوازدا دامەزرابوو، گەلی « یەمەن »یان دووڵەتکردبوو، هەر وەک چۆن ئێستە، لە « باشووری کوردستان »، لە پێناوی بەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتیی، لە بەر هەڵپەی پارە و کورسیی دەسەلات، دوو بەڕێوەبەرێتی کوردیی، لە دوو شاری گەورەی وەک: « هەولێر » و « سولەیمانیی » دروستبووە!

بەڵام، دوای ئەوەی، هەست و هۆشی نەتەوەیی بوژاوەتەوە، هوشیاریی رامیاریی پەرەیسەندووە، پشکۆی بیری ئازادیی و رزگارییخوازیی، لە نێو ئاگردانی مێشکی، ڕۆڵەی نەتەوە بندەستەکاندا گەشاوەتەوە، ڕۆڵەی نەتەوە بندەستەکان چاویان کراوەتەوە، لە واتای سەربەخۆیی نەتەوەیی و سەربەستیی راستەقینە تێگەیشتوون، وردەوردە، لە دەس کۆتوپێوەندیی دیلیی ڕزگاریان بووە، دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان دامەزراندووە، هێندێ لە ئەو گەلە دابڕاوانە یەکیانگرتۆتەوە و بۆ باوەشی نەتەوە ڕەسەنەکەی خۆیان گەڕاونەتەوە. ئیدی بەو شێوەیە، تا هاتووە، ژمارەی ئەو نەتەوە دابەشکراوانە کەمتر بوونەتەوە. دیارە، لە ئاییندەشدا، کەمتردەبنەوە! بۆ نموونە: هەر دوو گەل و دەوڵەتی « ڤێتنام »، ساڵی « **1976** »، یەکیانگرتەوە و ڕۆڵەکانی بە یەکدی شادبوونەوە. هەر دوو دەوڵەتەکەی « یەمەن »ی خواروو و سەروو، لە ئەنجانی جەنگی نێوخۆدا، ساڵی « **1986** » یەکیانگرتەوە. کاتێ جەنگی ساردیش، لە نێوان هەر دوو کەمپە زلهێزەکەی جیهاندا « ئەمێریکا » و « سۆڤێت » تەواوبوو، هەر دوو گەل و دەوڵەتی « ئەڵمان »یای خۆراوا و خۆرهەلات، ساڵی « **1990** » تێکەڵبوونەوە!

هەرچەندە، بیریار و نووسەرەکانی سەر بە فەلسەفەی « مارکسیزم »، بوونی « نەتەوە »، بە فاکتەری « ئابووریی »یەوە گرێدەدەن. واتە: « ئابووریی »، بە یەکێ لە مەرجە سەرەکییەکانی درووستبوونی « نەتەوە » دادەنێن. بەڵام، وەک دەزانین، فاکتەری « ئابووریی »، پێوەندییەکی توندوتۆڵی، بە درووستبوون و دامەزراندنی « دەوڵەت »ەوە هەیە. گومانیشی تێدا نییە، هەر دوو چەمکی « نەتەوە » و « دەوڵەت »، جیاوازییەکی گەورەیان هەیە. چونکە، بوونی « دەوڵەت »، پێوەندیی بە « گەل »ەوە هەیە، نەک پێوەندیی بە بوونی « نەتەوە »وە هەبێ و « نەتەوە »ش بۆ دامەزراندنی « دەوڵەت »، پێویستییەکی زۆر گرنگبێ! چونکە، (بەپێی پێناسەی کلاسیکیی ڕێکخراوی « کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان »یش بێ، « دەوڵەت »، لە « گەل، خاک، میریی و سەروەریی » پێکدێ.) «14،17»

کەواتە: لە بەر ڕۆشنایی ئەم پێناسەیەشدا بێ، یەکێ لە جیاوازییەکانی نێوان « گەل » و « نەتەوە » ئەوەیە: یەکەمیان، بە یەکێ لە پێکهاتەکانی « دەوڵەت » دەژمێررێ و بە سنووره ڕامیارییەکەی دیارییدەکرێ. هەروەها، ئەو دەوڵەتەش دەتوانێ، چەن ڕەگەزێکی ئێتنیکیی دیکەی جیاواز، لە گەلە باڵادەسەکە و چەن زمانێکی دیکەی جیا، لە زمانی گەلە سەردەسەکە، لە نێو چوارچێوەی سنووری خۆیدا کۆکاتەوە. «796،18»

بۆ نموونە: هەر دوو گەلی « ئازەر » و « ئەرمەن »، لە نێوچەی « قۆقاز »، دوو کۆماری سەربەخۆیان، لە « ئازربایجان » و « ئەرمینیا » دامەزراندووە. بەڵام، بەشێکی دیکەی ئەو دوو گەلە، لە مافی سەربەخۆیی بێ بەشکراون و خاوەنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان نین. بەڵکوو، یەکەمیان لە لایەن دەوڵەتی « ئێران » و دووەمیشیان، لە لایەن دەوڵەتی « تـــوورکیا »وە داگیرکراون.
یا، گـــەر گـــەلانی « عـــەرەب » بگرین، دەبینین: هـەر گـــەلێ لە ئەو گـــەلانە، دەوڵەتێکی سەربەخۆ و تایبەتیی هەیە. بەڵام، نەتەوەکە هەمووی پێکەوە، یەک دەوڵەتی یەکگرتووی نییە. لە هەمان کاتیشدا، لە زۆربەی ئەو دەوڵەتـــــــــە « عـــەرەبیی »یانەدا، چەن گـروپێکی دیکەی ئیـــتنیی تێـدا دەژی، بە چەن زمانێکی نەتەوەیی دیکەی جیاوازیش دەپەیڤن. بۆ نموونە: « عێراق »، جگە لە گەلی « عـەرەب »ی باڵادەس، گەلی « کورد » و چەن کـەمـینەیەکی نەتەوەیی دیکەی وەک: « توورکمان، کلدان، ئەرمەن و ئاشووریی »شی، لە چوارچێوەی خـــۆیدا کـــۆکـــردۆتەوە و هـەر گـــروپێکی ئیـــتنیکیش، بە بەشێ لە نـەتەوە ڕەســەنەکـــەی خـــۆی دادەنرێ، نەک بە هەمـــوویان، یەک نەتەوەی هاوئاهەنگ پێکبێنن. لەبەرئەوە « عێراق »، دەوڵەتێکی « ناسیۆنال » نییە و بە دەوڵەتێکی « تێریتۆریاڵ » دادەنرێ!
بەڵام، « نەتەوە » لە یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی و ڕامیـاریی پێکهاتووە، جگە لە فاکتەرەکانی « مێژوو، خاک، هەستی هاوبەش و بەرژەوەندیی نەتەوەیی »، زمـــانێکی هاوبەشـــیـــشـــیـــان هـەیە. هـەروەها، چەمکی « نەتـەوە »، هیچ پێوەندییەکی، بە چەمکی « دەوڵەت »ەوە نییە. چونکە، « نەتەوە » کۆنترە و زۆر لە پێش « دەوڵەت »ەوە هەبووە. «**19،20 - 42**»
بۆ بەڵگەی ڕاستـیی ئەم بۆچوونەش، ئێـسـتـەش نەتەوەی وا هـەیە، دەوڵەتی نەتـەوەیی خـۆی نـیـیـە. بۆ نموونە: « کـورد »، بە هەمـوو لێکدانەوەیەک، بە نەتـەوەیەکی ســـەربەخـــۆ دەژمـــێـررێ. بەڵام، خـــاوەنی دەوڵەتێکی نەتـەوەیی تایبەتیی نییە. هـەروەها، هەموو گەلانی « عەرەب »یش، نەتەوەیەکی سەربەخۆ پێکدێـنن. هـەرچەنـدە، « **22** » دەوڵەتی خـۆیـان هـەیە، بەڵام، دەوڵەتێ نیـیـە، بە ناوی نەتەوەی عەرەبەوە بێ و یەککرتووبێ. واتە: یەک دەوڵەتی نـەتەوەیی نییە، هەموو ڕۆڵەکانی نەتەوەی عـەرەب، لە ژێر سایەی ئاڵاکەی خـۆیدا کـۆکاتەوە! کەچیی، لـەگەڵ ئەوەشدا، عـەرەب لە نەتەوەبوونی خـۆی نەکەوتووە، بە یەکێ لە نەتەوە هـەرە کـۆن، ڕەسـەن و گـەورەکـانی جـیـهـانیش دادەنرێ. لەبەرئەوە، زاراوەی « گەل »، لەبری زاراوەی « نەتەوە »، بۆ هەموو « کورد » بەکار نایە و هەڵەیە!

سەیر ئەوەیە، لە بەر ڕۆشنایی ئەم دید و بۆچوونانەدا، دوکتۆر « عەبدولوەهاب حەمید رەشید » هاتووە، هەر دوو چەمکی « گەل » و « نەتەوە »ی ڕوونکردۆتەوە و جیاوازیی لە نێواندا کردوون، کەچیی، خۆی تووشی هەڵەیەکی زۆر گەورە کردووە و نووسیوێتی: (ڕاست نییە، بانگەشەی بوونی یەک گەلی یەکگرتووی عەرەبیی بکرێ، هەرچەندە، یەک نەتەوەی عەرەب هەیە. هەروەها ناتوانرێ، بانگەشەی ئەوە بکرێ و بگوترێ: گەلی " عەرەب " یا گەلی " کورد " لە « عێراق »دا هەیە. چونکە، « عێراق » دەوڵەتێکە، یەک گەلی تێدا هەیە و لە چەن نەتەوەیەکی جیاواز پێکهاتووە.)*

دیارە، بەشی یەکەمی ئەم بۆچوونە ڕاستە و یەک گەلی عەرەب نییە. چونکە، یەکگرتوو نین. بەڵکوو، گەلانی عەرەب هەیە و بە هەمووشیان، یەک نەتەوە پێکدێنن. بەڵام، بەشی دووەمی ئەم دید و بۆچوونە، زۆر هەڵەیە، چونکە:

**1**. ئاشکرایە، زاراوەی « ئەلقەومیە »ی عەرەبیی، لە ووشەی « ئەلقەوم »ەوە هاتووە و عەرەبەکان، لەبری زاراوەی « **Nationalism** »ی « ئەوروپایی » بەکاریدێنن. لەبەرئەوە، هەرگیز بە « نەتەوە »ی کوردیی نایە. بەڵکوو، لە ڕووی بیر و فەلسەفەوە، واتای « نەتەوەیی » دەگەیەنێ! هەڵبەتە، ڕەگی ئەم زاراوەیەش، لە ووشەی « ناسیۆن »ی « فرەنسیی »یەوە وەرگیراوە و واتای « نەتەوە »ی هەیە. لەبەرئەوە، « ئەلقەومیە » زاراوەیەکی « ئیتنیکیی » نییە، بەڵکوو، زاراوەیەکی « ڕامیاریی »یە، پتر پێوەندیی بە « بیر، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیا »وە هەیە، وەک ئەوەی دەڵێین: « بیر، فەلسەفە و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی « ئەلفکر ئەلقەومی، ئەلفەلسەفە ئەلقەومیە و ئەلئایدولوجیا ئەلقەومیە »، بەڵام، هەرگیز ناتوانین، زاراوەکانی « گەل » و « نەتەوە »، بۆ ئەو مەبەستە بەکاربێنین!

**2**. زاراوە ئیتنیکەکانی گەل و نەتەوە، لە هەموو زمانەکانی گەل و نەتەوەکانی جیهاندا، بۆ هەمان مەبەست بەکاردێنرێن، هەر وەک لە زمانی عەرەبییشدا، هەر هەمان زاراوەی « ئەلشەعب » و « ئەلئومە » بەکاردێنرێن! بەڵام، لە ڕاستییدا نازانم، بیریار و نووسەرەکانی عەرەب، زاراوەی « ئەلقەومیە »یان، لە کەیەوە، بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناوە؟ بۆچی بەکاریانهێناوە؟ هەرچەندە، چەندین جار، زاراوەی « ئەلقەوم »، لە « قورئان »دا هاتووە! هەر وەک دوکتۆر « جەمال نەبەز »یش، لەو بارەیەوە نووسیوێتی:

---

* ( لا یصح الادعاء بوجود شعب عربی واحد، رغم وجود امه عربیه واحده. کذلک لا یمکن الادعاء بوجود شعب عربی او شعب کردی فی العراق، لان العراق دوله تضم شعبا واحدا بقومیاته المتعدده.) «**14**،**17**»

(ئەم ووشـــەیە، لە سـەردەمی پێش ئیسلامەتیشدا هەر بووە و لە قورئانیشدا « 393 » جار بەکارهێنراوە، بەڵام، بە چەند مانایەک کە هیچیان بە تەواویی ئەو مانایە ناگەیەنن، کە ئەمڕۆ ووشـــەی "ئەلقەومیە **Nationalism**" کە لە "ئەلقەوم "ەوە وەرگیراوە، دەگەیەنێ.)«7،1»

لەبەرئەوە، ڕاست نییـە، گـەر لەبری « گـەلی کـورد لە عـێـراق ـ ئەلشـەعب ئەلکوردی فی ئەلعـراق »، زاراوەی « نەتەوەی کـورد لە عـێـراق ــ ئەلقـەومیـە ئەلکوردیە فی ئەلعراق » بەکاربێنین، هـــــــــەر وەک چۆن هەڵەیە، لە جێی « ئەلشـەعب ئەلعەربی فی ئەلعـراق »، زاراوەی « ئەلقـەومیـە ئەلعـەربیـە فی ئەلعراق » دابنێین!

ئێـسـتـە با بزانـین، ڕۆڵەکـانی نەتـەوەی کـورد، هـەر لە کـۆنەوە تا ئـەوڕۆ، بە ڕەشـەخـەڵک و خـوێنەوارەکانیـەوە، چۆن لە زاراوەی « کەمەنەتەوەیی، میللەت، گـەل و نەتـەوە » تێگەیشـتـوون؟ لێـرەدا، چەن نموونـەیەکی زیندوو، پێش چاو دەخەم:

لە کۆندا، لە نێـو ڕووناکبـیـر و نووسـەرانی کورددا، ئەو زاراوە ئیتنیکانە، بۆ مـەبەستێکی دیکە بـەکـارهێنراون. بەڵام، بەپێی تێـڕوانینی ئەوڕۆ بێ، هەر بە هەڵە دادەنرێن! بـۆ نموونە: نووسـەرێکی ناسراوی وەک: « ڕەفیـق حـیلمـیی »، زاراوەی « نـەتـەوە »ی، بە شـێـوەیەکی سـەیر و شـێـواو بەکـارهێناوە. لە نووسینێکدا، باسی « ڕەمزی مەلا مـارف »ی کـردووە و نووسـیویێتی: (ڕەمزی لە سـەر سنوری بـوێژەکـانی دەوری کـۆن و تازەدایە، ناتوانـین، بڵـێین: کـە بە تەواویی شـاعـرێکی تەقلیـدییـە و هـەر پەیڕەوی بوێژە کۆنەکـانی کـردووە. بە هەمـوو مانای ووشـە، بە شاعیرێکی عەسریی و تازەش ناژمێررێت. بەڵام، بە ئەسپایی و لەسـەرخۆ، لە هەر دوو نەتـەوەکانی وەرگرتووە و لە چەشکەی هەر دوو لادا بەشدارە.)«25،10»

لێـرەدا، مـامـۆسـتـا زاراوەی « نـەتەوە »ی، لە بـری « نەوە » یا « سـەردەم » بەکارهێناوە! یا، کاتێ باسی « سـالم »ی کردووە، نـووسیـویێتی: (لە نەتەوەی « صاحبقڕانە »)«55،10»

ئەمە هـەڵەیەکی گەلێ گـــــەورەیە. چونکە « ساحبقڕان » نەتەوە نییە، بەڵکوو « بنەماڵە »یە. هـەروەها دەیتوانی، بنووسێ: لە بەرەبابی « ساحبقڕان »ە.

« عـەزیزی ئـیـبـراهـیـمـیـی »، بەوەشـەوە نەوەسـتـاوە، « نـەتەوە » و « هـۆز »ی تێکەڵاوکـردووە. لە سـەرەتای بـەرهـەمـەکـەیدا نـووسـیـویێتـی: (ئەم نامـیلکـەیە پێـشکەش بە برایانی بەڕێز و خـوشکانی خۆشەویستم دەکـەم، کە بە کـورد و تورک و بەلووچ و عەرەب و فارس و هـەموو هۆزەکانی تریشەوە.)«6،12»

هەڵبەتە، لای نووسەر، تا ئەو کاتە، جیاوازیی لە نێوان « نەتەوە » و « هۆز »دا ڕوون نەبۆتەوە. بۆیە، ئەو پێنج نەتەوەیەی، لەگەڵ « هۆز »دا تێکەڵکردووە!
پاشان نووسیویێتی: (بزانن، هەر نەتەوەیەک کە زمان و ئەدەبی بوو، ئەژی و سەرئەکەوێ، ئەو گەلە جا با دیلیشبێ، هەر خۆ دەناسێنێ و ڕۆژێک دەبێ، هەر وەک گەلانی پێشکەوتووی دیکە کۆسپی ژیان لابەرێ و سەرکەوێ ...)
«6،12»
لێرەشدا، جارێ زاراوەی « نەتەوە » و جارێکی دیکەش، زاراوەی « گەل »ی بەکارهێناوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، نووسەر جیاوازیی لە نێوانیاندا نەکردووە. چونکە، گەر دوو زاراوەی جیاوازبن، هەر کاتێ بە نەتەوە، یا گەل، شتێکمان نووسی، دەبێ، هەر بە هەمان زاراوەش تەواوکرێ. واتە: دەبووایە، بینووسیایە: « بزانن، هەر نەتەوەیەک، کە زمان و ئەدەبی بوو، ئەژی و سەرئەکەوێ، ئەو نەتەوەیە، جا با دیلیش بێ، ... تاد ».
« ئومێد ئاشنا » نووسیویێتی: (شتێکی دیارە، کە نەتەوەی کوردیش وەکوو دووەم نەتەوەی عێراق وە بەپێی هەڵکەوتنی جوگرافیای ناوچەکەی و نزیکی لە دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ژێر دەسەلاتی ئەو ڕژێمە کۆن و دواکەوتووەدا ئەینالاند.)«20،9»
جارێ پێشەکیی، با ئەوە بڵێم: ئەو کاتانەی گەلی کورد، لە بندەستی توورکە « عوسمانیی »یەکاندا بووە و نالاندوویەتی، لە سەر ڕووی نەخشەی ئەم جیهانە، دەوڵەتێ نەبووە، ناوی « عێراق » بووبێ! ئینجا، کورد لە « عێراق »دا، لە ڕووی زمان و زاراوەی ئیتنیکەوە، نە ئەوساش و نە ئێستەش، هەرگیزا و هەرگیز نەتەوە نەبووە و نەتەوەش نییە. چونکە، کورد لە هەر کوێ هەبێ، بە هەمووی نەتەوەیەک پێکدێنێ. کوردیش، لە سنووری هەر دەوڵەتێکدا بژی، زاراوەی گەلی بۆ بەکاردێنرێ. گەلانی « عێراق »یش، هەر یەکەیان، بەشێ لە نەتەوەکەی خۆیان پێکدێنن، وەک گەلی کورد لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی کورد و گەلی عەرەبیش لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب دادەنرێن. نەک بڵێین: نەتەوەی « عێراق »، ئەمە خۆی لە خۆیدا، بە هەڵەیەکی گەورەی زمانەوانیی و ئیتنیی دەژمێررێ، بەکارهێنانی هەرگیز درووست نییە.*

---

* لەم ڕۆژانەدا، لە کەناڵی ئاسمانیی تێلێفیزیۆنی « ئەلشەرقییە »، گوێم لە هونەرمەند « فوواد سالم » بوو، تاوێ دەیگوت: « نەتەوەی عێراق ـ ئومە ئەلعراق » و تاوێکی دیکەش دەیگوت: « گەلی عێراق ـ شەعب ئەلعراق »، ئەمەش، نیشانەی نەزانین نەبێ، هیچی دیکە نییە!

« فاتیح ڕەسووڵ » نووسیویّتی: (گەلی کورد پێویستی بە پارتێکی مارکسیستی سەربەخۆی تەواو هەیە، کە ڕۆڵێکی سەرەکی و پێشڕەوانە، لە ڕێنوێنی خەباتی ڕەوای گەلەکەمان و ئەو نەتەوە پچووکانەی لە سەر خاکی کوردستان دەژین، ببینێت.)«22،8»
لە ئەم کۆپلە پچووکەی، لە بیستونۆ ووشە پێکهاتووە، دوو جار، زاراوەی گەل و جارێکیش، زاراوەی نەتەوەی بەکارهێناوە. پێشەکیی دەبێ، ڕووی دەمم لە نووسەر بکەم و لێی بپرسم: ئایا، مەبەست لە گەلی کورد یا گەلەکەمان، تەنیا گەلی کوردە، لە « باشووری کوردستان »، یا هەموو کورد لە جیهاندا دەگرێتەوە؟ چونکە، ئەو دووانە، دوو زاراوە و دوو واتای جیاواز دەگەیەنن.
گەر مەبەست لە گەلی کورد، تەنیا ئەو کوردانە بن، لە « باشوور » دەژین، ئەوا، لە جێی خۆیدا بەکارهاتووە. بەڵام، گەر مەبەستەکە هەموو کورد بێ، ئەوا، بە هەڵەیەکی گەورە دادەنرێ. چونکە، بە هەموو کوردی پارچەکان و هەندەرانیش، ئینجا نەتەوەیەک پێکدێنن!
پاشان، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، کەمەنەتەوەییەکانی « کوردستان »ی، بە « نەتەوە پچووکەکان » ناوبردووە! جگە لەوەی، ئەوانە، نەک هەر نەتەوە نین، بەڵکوو، بە گەلیش ناژمێررێن. چونکە، لە « کوردستان »دا خاکیان نییە. بۆیە، بە کەمەنەتەوەیی دادەنرێن. بەڵام، « کوردستان »ی ئەوڕۆ، جگە لە عەرەبە دەشتەکییە چێنراوەکان، نیشتمانی هەموو ئەو کەمەنەتەوەییانەشە، کە لە سەری دەژین، گەر بیانەوێ، وەک برا، لەگەڵ کورددا بژین، بۆ خاکوخۆڵەکەی، ئاووهەواکەی، خەڵک و خاوەنەکەی، بە ئەمەک و دڵسۆزبن!
جا ئێستە تێ نەگەیشتم، ئەو پارتە « کۆمۆنیست »ەی داوایکردووە، بۆ هەموو کوردە، یا، تەنیا هەر بۆ بەشێ لە نەتەوەی کوردە، کە « گەل »ەکەی مامۆستا دەگەیەنێ!
هەروەها، « نەوشیروان مستەفا »، لە نووسینەکانیدا، بە تایبەتیی، لەم سێ بەرگەی یاداشتەکانیدا، گەلێ جار، ئەم زاراوانەی تێکەڵکردووە. لێرەدا، چەن کۆپلەیەکیان، وەک نموونە لێ وەردەگرم.
نووسەر، لە یەکەمین بەرگی بیرەوەرییەکانیدا نووسیویّتی: (لە ڕاپۆرتەکەی دا لایەنە سەلبی و ئیجابییەکانی سیاسەتی بەعسی لە کوردستان دا باس کرد بو. ناسینی کورد لە دەستور دا وەکو نەتەوەیەکی سەرەکی و، سەلماندنی مافی ئۆتۆنۆمی و، ...)«50،14»
لێرەدا، کوردی لە « عێراق »دا، بە نەتەوەی سەرەکیی داناوە! ئاخر، کەس گوێی لێ بووە، یا، لە هیچ نووسینێکدا خوێندوویەتییەوە، نووسەرێکی

عەرەب، ڕۆژێ لە ڕۆژان بڵێ، یا بنووسێ: نەتەوەی عەرەب لە « عێراق »دا؟!!
یا، تەنیا هەر دەڵێن و دەنووسن: گەلی عەرەب لە « عێراق »دا: « ئەلشەعب ئەلعەرەبی فی ئەلعراق »؟!!
پاشان نووسیوێتی: (ڕزگار کردنی عێراق لە کۆت و زنجیر و پەیوەندییەکانی کۆلۆنیالیزمی نوێ و لە ڕژێمی دیکتاتۆری دوژمن بە گەل و هێنانە سەر کاری حکومەتێکی دیموکراتی ئیئتلافی لە نوێنەرانی پارتییە سیاسییە پێشکەوتووەکان و چینەکانی گەل و نەتەوە سەرەکی و پچوکەکانی عێراق ...) «80،14»
لەم کۆپلەیەدا، دوو زاراوەی جیاواز و ناکۆکی بەکارهێناوە: (گەل، نەتەوە سەرەکیی و پچووکەکانی « عێراق »).
یەکەم: گەل و نەتەوە جیایە. چونکە، لە « عێراق »دا نەتەوەی تێدا نییە. بەڵکوو، لە چەن گەل و کەمینەیەکی نەتەوەیی پێکهاتووە.
دووەم: دەبووایە، گەلانی « عێراق »ی بنووسیایە.
سێیەم: بەکارهێنانی زاراوەی « نەتەوە پچووکەکان »، هەڵەیەکی زۆر گەورەیە. چونکە، هەڵبەتە نووسەر، مەبەستی لە کەمەنەتەوەیی « توورکمان، کلدان و ئاشووریی » بووە. ئەوانەش، بەپێی هەموو پێناسە و یاسایەکی « عێراق »، کەمەنەتەوەیین و نەتەوە نین. ئەمەشی، جارێکی دیکە دووبارەکردۆتەوە، کاتێ نووسیوێتی: (بەشدار بونی کورد و نەتەوە پچوکەکان لە ئۆرگانە ناوەندییەکان دا بە پێ ی ژمارەیان.)«81،14»
لە جێیەکی دیکەشدا، بە شێوەیەکی زۆر سەیر، زاراوەی « نەتەوە »ی بەکارهێناوە و نووسیوێتی: (نەتەوەیی کردنی بازرگانیی دەرەوە و چاودێری کردنی بازرگانی ناوەوەی وڵات و گەشەپێدانی دەزگاکانی بەشی گشتی.) «83،14»
لێرەدا نازانم، مەبەستی لە زاراوەی « نەتەوەییکردن » چییە؟! گەر مەبەست لە « دەسبەسەراگرتن یا خۆماڵیکردن » نەبێ، هیچ شتێکی دیکە ناگەیەنێ!
هەرچەندە، بە تەواویی نازانم، نووسەر، لەگەڵ ئەم ووتەیەی « یەزیدیی »یەکان دایە، یانا؟ بەڵام، بە ڕاستیی ئەو زاراوەیە، بۆ « یەزیدیی »یەکان، پڕ بە پێستی خۆی دادەنرێ. چونکە، وەک لە کۆندا، هاوڕێ « فەهد »ی سکرتێری « پارتی کۆمۆنیست » و سەرانی دەوڵەتی « عێراق » بانگەشەیان بۆ دەکرد، « یەزیدیی »یەکان، نە کەمینەیەکی نەتەوەیی و نە گەلێکی جیاوازن. بەڵکوو، کوردن و بە بەشێ لە نەتەوەی کورد دادەنرێن. بەڵام، لەگەڵ کوردە موسوڵمانەکاندا، تەنیا هەر ئایینیان جیاوازە. لەبەرئەوە، زۆر لە جێی خۆی

دایه، گەر بە میللەتی « یەزیدیی » ناوبرێن، وەک قورئانی پیرۆزیش، ئەوانەی باوەڕیان بە پەیامبەران « برایم و موسا » هێنابوو، بە « میللەتی برایم و موسا » ناویبردوون. لێرەدا، نووسەر نووسیویّتی: (یەزیدیەکان بە خۆیان ئەڵێن: « میللەت » و بە دینەکەیان ئەڵێن: « ئولی ئیزدی ». خۆیان بە میللەتی هەڵبژێردراوی یەزدان ئەزانن.)«106،14»

لە دووەمین بەرگی بیرەوەرییەکانیشیدا، دەربارەی کورد نووسیویّتی: (ئەم میللەتەی کە ڕەنگە لە دنیای ئەمڕۆدا، تەنیا نەتەوەی گەورە بێت کە هێشتا .... میللەتە بەش بەش و دیلەکەی ئێمەیە کە ناوی: کوردە.)«10،15»

لێرەدا، هەر دوو زاراوەی « میللەت » و « نەتەوە »ی، بە یەک واتا بۆ کورد بەکارهێناوە. باوەڕ ناکەم، میللەت نەتەوە بێ! پاشان، لە جێیەکی دیکەشدا نووسیویّتی: (وەرزنامەی کۆمەڵە لە قۆناغێکا دێتە کۆڕی خەباتەوە کە خەباتی گەلەکەمان گەیشتۆتە بەرزترین و بالاترین پلەی، واتە پلەی خەباتی چەکدارانە، واتە لابەلا کردنی ناکۆکی سروشت دوژمنانە و سەرەکی نێوان بورجوازی بێرۆکراتی رەگەزپەرست و شۆڤێنی عەرەبیی عێراق و نەتەوەی کورد لە رێگای بەکارهێنانی زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە و چەکەوە.)«11،15»

لێرەدا، گەر مەبەستی لە نەتەوەی کورد، تەنیا کوردی « باشوور » بێ، ئەوا، لە ڕووی زمانەوە هەڵەیە. دەبووایە، گەلی بنووسیایە. بەڵام، گەر مەبەستی لە هەموو کورد بێ، ئەوا، جگە لەوەی، عەرەبی « عێراق »ی، لە نەتەوەی عەرەب جیاکردۆتەوە، کەچیی، کوردی لە نەتەوەی کورد جیا نەکردۆتەوە! لە ڕووی نەتەوەیی و ڕامیارییشەوە، هەر هەڵەیە. چونکە، ئەو دوژمنایەتییەی، لە نێوان کوردی « باشوور » و « بەعس »دا هەبووە، لە نێوان هەموو کورد و سەرانی « بەعس »دا نەبووە. بەڵکوو، تەنیا لە نێوان کوردی « باشوور » و « بەعس »دا هەبووە!

هەروەها، « حەمەسەعید حەسەن »یش، وەک لە هێندێ نووسینیدا دەردەکەوێ، جیاوازیی لە نێوان هێندێ زاراوەی ئیتنیکدا نەکردووە. بۆ نموونە: لە گوتارێکدا نووسیویّتی: (هەشتا و دوو ساڵە لە عێراقدا کورد نەتەوەی بندەستە و عەرەب نەتەوەی سەردەست.) کەچیی، هەر لە هەمان گوتار و لە جێیەکی دیکەدا نووسیویّتی: (ئەوان چونکە هەرگیز سەری ڕێزیان بۆ گوشاری میللەت نەوی نەکردووە، ...)«4»

لە سەرەتای کورتیلەگوتارێکی دیکەشدا نووسیویّتی: (چونکە عێراق لە دوو نەتەوەی گەورە پێکهاتووە،* بۆیە دەبێت عێراق ببێتە دوو هەرێمی فیدراڵ: کوردستان و عەرەبستان، ... دەبێت فیدراڵی بە نەتەوەی کورد بدرێت ...)

کەچیی، هەر دوای یەک دوو دێـــــــڕی دیکە نووسیوێتی: (ئەوجاش دەبێت « نوێنەران »ی کورد لە ئەنجوومەنی حوکمی عێراق، بگەڕێنەوە بۆ لای گەلی کورد و پرسی پێ بکەن.) پاشان، لە دوا دێڕی گوتارەکەشیدا نووسیوێتی: (پێنجەمیشیان نوێنەری ئوممەتی ئیسلامە، نەک نەتەوەی کورد.)«5»
نووسەر لەو چەن دێڕەدا، جیاوازیی لە نێوان زاراوەکانی نەتەوە، میللەت و گەلدا نەکردووە و هەر سێکیانیشی، تەنیا هەر بۆ یەک مەبەست بەکارهێناوە! وەک ئاشکرایە، کورد نە لە « عێراق » و نە لە « باشووری کوردستان »دا، نەتەوە نییە، بەڵکوو « گەل »ە. کەواتە: نووسەر بۆچی، ئەو زاراوە جیاجیایانەی بەکارهێناوە؟!! وا دەردەکەوێ، زاراوەی نەتەوەی لە زاراوەی « ئەلقەومیە »ی زمانی « عەرەبیی »یەوە وەرگرتبێ. چونکە، عەرەبەکان لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاریدێنن.* بەڵام، وەک کەمێ پێشتر ڕوونمکردەوە، ئەو زاراوەیە، زاراوەیەکی ئێتنیی نییە و بە هەڵە بەکارهاتووە.
ئێنجا، با سەرنجێ لە هەر دوو چەمکی « ئوممە »ی ئیسلامیی و « نەتەوە »ی کوردیی بدەین. دیارە زاراوەی « ئوممە »، وەک زاراوەیەکی ئێتنیک، زۆر لە کۆنەوە، لە نێو عەرەبەکاندا بەکارهێنراوە. بەڵام، لەگەڵ ئەو « ئوممە »ی لە قورئاندا هاتووە، لە ڕووی واتاوە جیاوازییان هەیە. چونکە، بەپێی دیدی ئیسلام بێ، هەموو ئەو مرۆڤانەی، باوەڕیان بە خوای تاکوتەنیا هەیە، دان بە پەیامبەرێتی « موحەممەد »دا دەنێن، بە یەک نەتەوە دادەنرێن. لەگەڵ ئەوەشدا هەموو گرووپە ئێتنیکە موسوڵمانەکانیش وەک « عەرەب، کورد، فارس، توورک ... » بە چەن « شەعب ـ گەل »ێکی جیاواز دادەنێن، بە هەمووشیان « ئەلئومە ئەلئیسلامیە ـ نەتەوەی موسوڵمان » پێکدێنن، بێ ئەوەی، گوێ بە جیاوازیی « ڕەگەز، نەتەوە، زمان، مێژوو، جوگرافیا، هەستی نەتەوەیی، باری کۆمەڵایەتیی، تراديسيۆن و کەلتووری هاوبەش » بدەن. بۆ نموونە: خوای گەورە، لە قورئانی پیرۆزدا، لە چەن جێیەکدا فەرموویەتی: (وما كان الناس الا امه واحده فاختلفوا ولولا كلمه سبقت من ربك لقضى بينهم فيما فيه يختلفون.) (ولكل امه رسول فاذا جاء رسولهم قضى بينهم بالقسط وهم لا يظلمون.) (ولو شاء ربك لجعل الناس امه واحده ولا يزالون مختلفين.) (ولقد بعثنا فى كل امه رسولا ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت فمنهم من هدى الله ومنهم من حقت عليه الضلله فسيروا فى الارض فانظروا كيف كان عاقبه المكذبين.) (ان هذه امتكم امه واحده وانا ربكم فاعبدون.)

* وەک ئەوەی دەنووسن: « العراق يتكون من قوميتين رئيسيتين ». یا دەنووسن: « القوميه الكورديه فى العراق ».

هەروەها، دەربارەی « ئەلشەعب »یش فەرموویەتی: (انا خلقناکم من ذکر و انثی و جعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم.)
کەواتە: « ئوممە »، چ زاراوەیەکی ئیتنیی بێ، چ زاراوەیەکی ئایینیی بێ، لە زمانی کوردییدا، هیچ جیاوازییەکیان نییە و هەر بە « نەتەوە » دێ. بەڵام، لە ڕووی واتاوە جیاوازییان هەیە!
ئینجا، با سەرنجێکی سەرپێیی، لە هێندێ بڵاڤۆک و دەزگەکانی ڕاگەیاندنی پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان » بدەین، تا بزانین، لە ئەو دیوەخانە جەنجاڵە پڕ لە سەیر و سەمەرەیەدا، چ باسە؟!!
بە داخەوە، لە لایەکەوە، زۆربەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بە گشتیی و کەناڵی ئاسمانیی « **Kurdsat** » بە تایبەتیی، لە لایەکی دیکەشەوە، سەرکردایەتیی پارتە ڕامیارییەکانی « باشووری کوردستان »، وەک گەلێ شتیان تێکداوە، زاراوە ئیتنیکەکانیشیان، بە تەواویی تێکداوە! هەر بۆ نموونە: « ڕێکار ئەحمەد »، سکرتێری « حزبی ڕزگاریی کوردستان »، لە بڵاڤۆکێکی دوو لاپەڕەییدا، جارێ زاراوەی نەتەوە و چەن جارێکیش، زاراوەی میللەتی بەکارهێناوە و نووسیویەتی: (بە هەمان شێوەش کورد وەک نەتەوە و میللەتێکی خاوەن خاک و زمان و کولتور و مێژوو، ...)«**11**»
هەروەها، « حزب و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان لە شاری کەرکوک »، ڕۆژی « **2004. 05. 03** »، بڵاڤۆکێکی نیو لاپەڕەییان دەرکردووە، وەڵامی هێندێ لە لاپەڕە « عەرەبیی »یەکانی، تۆڕی ئینتەرنێتی « شەبەکەت ئەنباء، ئەلعێراق لیلجەمیع و وەکالەی وەرکا »یان داوەتەوە و داکۆکییان لە کورد کردووە، گوایە: شانبەشانی سوپای « ئەمێریکا »، بەشداریی لە نەبەردەکانی « فەلووجە »دا نەکردووە!«**2**»
هەرچەندە، بڵاڤۆکەکەیان بە زمانی کوردیی نووسیوە، بەڵام، لەو چەن دێڕە شەل و گێڕەدا، تا توانیویانە، هەستی بیانییپەرستیی خۆیان دەربڕیوە، پاکانەیەکی زۆر بێ تامیان، بۆ گەلی عەرەب و هێزە ڕامیارییە « سیکولار » و ئیسلامییەکانی « عێراق » کردووە. جگە لەوەی، چەندین هەڵەی زمانەوانیی تێدا هەیە، حەوت دانە جاریش، باسی گرووپە ئیتنیکەکانی « عێراق »یان کردووە و هەر جارەش، بە جۆرێ نووسیویانە! ئەمە، هەر وەک ئەوە وایە، یەکێ ناوی « چخەیەر » بێ، چەن جارێک و لە سەر یەک بانگیکەی، بەڵام، هەر جارەی، بە ناوێکی جیاوازەوە بانگیکەی!
لەو بڵاڤۆکە نیو لاپەڕەییە پڕ لە هەڵەیەدا، لە پێنج جێی جیاوازدا نووسیویانە: « گەلانی عێراق ». دیارە، زۆر لە جێی خۆیدا، ئەو زاراوەیەیان

بەکارهێناوە. کەچیی، لە دوو جێی دیکەدا نووسیویانە: « گەل و نەتەوەکانی عێراق و نەتەوە جیاجیاکانی عێراق »، کە ئەم چەن چەمکە، پێکەوە ناگونجێن و ناکۆکییان هەیە!
زۆر جار، تەماشای هێندێ بەرنامەی هەر دوو کەناڵی ئاسمانیی « **Ktv** » و « **Kurdsat** » دەکەم، گوێ لە دەنگوباس و هەواڵەکانیان دەگرم. بەڵام دەبینم: زۆر بە شێوەیەکی هەڵە، ئەو زاراوە ئیتنیکانە بەکاردێنن. بۆ نموونە: هێندێ زاراوەی وەک: « میللەتی عێراق، گەلی عێراق و نەتەوەکانی عێراق » بەکاردێنن. لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، لە جیاتی گرووپە ئیتنیکەکانی شاری « کەرکووک »یش، هەر « نەتەوەکانی کەرکووک » بەکاردێنن! ئەمە نیشانەی ئەوەیە، کادێری شارەزا و زمانەوانیان نییە، تا، هەر زاراوەیە، لە شوێنی پێویستی خۆیدا بەکاربێنن و لە پاشەڕۆژدا، تووشی گرفتمان نەکەن.
لەبەرئەوە ڕاستتر وایە، گەلانی « عێراق » بەکاربێنن. چونکە، نە عەرەب و نە کورد، لە « عێراق »دا نەتەوە نین. بەڵکوو هەر یەکەیان، بە گەلێکی سەربەخۆ دادەنرێن. عەرەب بەشێ لە نەتەوەی عەرەب و کوردیش، بەشێ لە نەتەوەی کورد پێکدێنن! لە شاری « کەرکووک »یشدا، نە گەل و نە نەتەوەی تێدا نییە. بەڵکوو دەبێ، دانیشتوانی شاری « کەرکووک »، یا پێکهاتە نەتەوەییەکانی « کەرکووک »، یا گرووپە ئیتنیکەکانی « کەرکووک »، یا خەڵکی « کەرکووک » بەکاربێنین. ئەوە جگە لەوەی، « توورکمان، ئاشوور، ئەرمەن و کلدان »، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان، نە گەل بوون و نە بە گەلیش دانراون، بەڵکوو، هەر کەمینەی نەتەوەیی و ئایینیی بوون و ئەمەش، گەلێ ڕاستترە!
هەروەها، کوردەکانی « ڕۆژهەلاتی کوردستان »یش، ئەو سێ زاراوە ئیتنیکە، بە هەڵە بەکاردێنن و زۆر بە خراپیی لێیان تێگەیشتوون. تا ئێستەش، لە نێو خۆیاندا، لە سەر بەکارهێنانی ئەو سێ زاراوەیە، بە تەواویی ساغ نەبوونەتەوە. چونکە، هێندێکیان میللەت و نەتەوە، لە یەکدی جیا ناکەنەوە و بە یەک شتی دادەنێن. وەک پێشتر ڕوونمکردەوە: میللەت ووشەیەکی عەرەبییە، بۆ کۆمەڵێکی ئایینیی بەکاردێنرێ و لە بری گەل و نەتەوە بەکار ناهێنرێ. جگە لەوەی، لەگەڵ نەتەوەشدا، جیاوازییەکی زۆری هەیە. هێندێکی دیکەیان، لە « فارس »ەکانەوە فێربوون، « میللەتی ئێران »، یا « نەتەوەی ئێران »، لە ئاخافتن و نووسیندا بەکاردێنن. لەگەڵ ئەوەشدا، میللەت و نەتەوەش، بۆ کورد بەکاردێنن. هێندێکی دیکەشیان، لە بری گەل، زاراوەی « خەڵک » بەکاردێنن. گەلیش لای ئەوان، خوێندەوارە ڕۆشنبیرە پێشڕەوەکەی « خەڵک » دەگرێتەوە!

جگە لەوەی، ئەم زاراوانەیان، لە کاربەدەسە شۆڤێنیستەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « ئێران »ەوە وەرگرتووە، هەر لە بنچینەشدا هەڵەیە. چونکە، « ئێران » دەوڵەتێکی ناسیۆنال نییە، تەنیا یەک نەتەوەی تێدا بژی، بەڵکوو، دەوڵەتێکی تێریتۆریاڵە. واتە: دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمانە، لە چەن نیشتمان و گەلێکی جیاواز پێکهاتووە. هەر یەکێ لەو گەلانەش، بە گەلێکی سەربەخۆ دادەنرێن و بەشێکی گرنگ، لە نەتەوەکانی خۆیان پێکدێن. نەک وەک « فارس »ە شۆڤێنیستەکان دەڵێن و بە هەموو شێوەیە، پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن و دەیانەوێ، هەرچی چۆنێبێ، لە مێشکی ڕۆڵەکانی ئەو گەلانەی بئاخنن، کە لە « ئێران »دا، تەنیا هەر یەک نەتەوە هەیە، ئەویش « نەتەوەی ئێرانیی »یە.

لە ڕاستییدا، « ئێران » ناوی خاک و دەوڵەتە. لە ڕووی زمانەوانییەوە، بە هێچ جۆرێ ڕاست نییە، زاراوەی جوگرافیا و ئیتنیک تێکەڵاوکرێ. بەڵکوو دەتوانین، بڵێین: « ئێران »، وەک دەوڵەتێکی فرە نەتەوە و نیشتمان، لە ڕووی جوگرافیاوە، لە چەن وڵاتێکی جیاوازی وەک: « فارس، کوردستان، ئازربایجان، بلوژستان ... »، لە ڕووی ئیتنیکیشەوە، لە چەن گەلێکی جیاوازی وەک: « فارس، کورد، بلوژ، تاژیک، ئازەر، عەرەب ..... » پێکهاتووە، بە هەمووشیان دەگوترێ، « گەلانی ئێران »، نەک « میللەتی ئێران »، یا « گەلی ئێران »، یا « نەتەوەی ئێران ».

وەک چەن جارێکی دیکەش، لە هێندێ نووسیندا ڕوونمکردۆتەوە، ئەم زاراوەیە، لە لایەکەوە، ئیمپریالیزمی جیهان و لە لایەکی دیکەشەوە، کاربەدەسانی دەوڵەتە سۆسیالیستەکانی پێشوو دایاننناوە. چونکە، لە بنەڕەتدا، دانیان بە بوونی گەلەکانی بندەسیاندا نەناوە. وەک چەن گەلێکی سەربەخۆ، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ نەکردوون. لەبەرئەوە، هەر لەو ڕۆژەوە، ئەو دەوڵەتانە دامەزراون، هەرگیز نەیانگوتووە: گەلانی« سۆڤێت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا ... » بەڵکوو هەمیشە بە گەلی « سۆڤێت، چیکۆسلۆڤاکیا، یۆگۆسلاڤیا، ئەسیبویا ... » ناویانبردوون. تا لە کۆتاییدا، ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانە هەڵوەشانەوە و چەن دەوڵەتێکی ناسیۆنال، لە جێیان دامەزرا.

دیارە، سەرانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی «کوردستان »یش، هەر هەمان چاوبەستمان لەگەڵ دەکەن. جگە لە گەلەکانی خۆیان، بە هیچ شێوەیە، دان بە بوون و مافی گەلەکانی دیکەی بندەسیاندا نانێن. بۆیە، پێ دادەگرن و هەمیشە دەڵێن: گەلی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » و

زاراوەی گەلانی « تووركيا، ئێران، عێراق و سووريا » بەكار ناهێنن. بە داخەوە، زۆربەی كوردەكانی « ڕۆژهەلات »، لە لايەكەوە، لەبەرئەوەی، خۆيان بە « ئێرانيی » دەزانن، لە لايەكی ديكەشەوە، لەبەرئەوەی، دەوڵەتی داگيركەری « ئێران » نەيهێشتووە، زمانەكەی خۆيان بخوێنن و بە باشيی فێربن، لە زمانی كورديیدا، زۆر شارەزا نين، ئەو زاراوانە بە هەڵە بەكاردێنن، ديد و بۆچوونە شۆڤێنييەكانی نەتەوەی بالادەسی « فارس » دووبارەدەكەنەوە و زۆربـــــەيان، چ لە قسەكردن و چ لە نووسينيشدا، « ميللەتی ئێران »، يا « نەتەوەی ئێران » بەكاردێنن. تەنانەت، گەر هێنديكيان كورديزانێكی باشيشبن، ئەوا، لەبەرئەوەی ڕاهاتوون، هەمان هەڵەدەكەن و ئەو زاراوانە، بە شێوەيەكی نالەبار و نادرووست بەكاردێنن. هەر بۆ نموونە: هۆنەرێكی ناسراو و كورديزانێكی باشی وەك: « هێمن »، وەك هەموو كوردە نووســـــەرەكانی « ڕۆژهەلات »، هەم جياوازيی لە نێوان گەل و ميللەت، هەم جياوازيی لە نێوان گەل و « ميللەتانی ئێران »دا نەكردووە. ئەمەش، لەم چەن دێڕەدا دەردەكەوێ، كاتێ نووسيويێتی: (بەيانی دوو فڕۆكە هاتن و چەن نارنجۆكی پچووكيان بە شاردا دا، ئەرتەشی شاهەنشاهی، ئەو ئەرتەشەی لە كوشتنی ميللەتی ئێراندا لاسايی داگيركەرانی مەغوول و نازی دەكردەوە، تاوێكی بەربەرەكانی نەكرد و پێش ئەوەی لەشكری سوور بگاتە مەهاباد چەكی فڕێدا و وەك تۆوی هەرزن بلاوبوو.)«18،16»

« ح. ئەيوبزادە »، لە گوتاری « عەبباس وەلی و ناديمۆكراتيبوونی كورد ! »دا، زاراوە ئيتنيكەكانی تێكەڵكردووە و نووسيويێتی: (مەفهومێك كە كورد و گەلانی ديكەی ئێران لە ديموكراسی هەيانە لەگەڵ ئەوەی ئاغای وەلی و كەماليست و سەڵتەنەتخواز و ئاخوند و موجاهيد و توتاليتێرەكان لێی دەدوێن جياوازە. ديموكراسی بۆ كورد بە مانای **تێك شكاندنی دەسەلاتی** ناوەندييە كە نەتەوەی دەسەلاتدار، كورد و باقی نەتەوەكانی ديكەی ئێرانی لێ بێ بەش كردووە. ديموكراسی بە مانای بە رەسمی ناسينی بەرابەری مافی سياسی گەلی كوردە. ديموكراسی بۆ كورد تەنيا بە مانای بەرابەری مافی قانوونی و يەكسانی فەرد واتە تاكی كورد نييە. كورد دەيەوێ هەر وەكو نەتەوەی سەردەست مافی سياسی هەبێ. لە دەسەلاتدا بەشداربێ. وەكو نەتەوە بۆ خۆی و لە پێكەوە ژيانی هاوبەشدا بڕياردەر بێ و بۆ دياريكردنی چارەنووسی خۆی بڕيار بدا.)«3»

لێرەدا، زۆر بە ڕوونيی دەبينين: نووســـــەر، چەن زاراوەيەكی جياوازی وەك: « كورد و گەلانی ديكەی ئێران، نەتەوەی دەسەلاتدار، كورد و باقی نەتەوەكانی

دیکەی ئێرانی، گەلی کورد، کورد دەیەوێ هەر وەکو نەتەوەی سەردەست مافی سیاسی هەبێ، وەکو نەتەوە ... »ی، بۆ چەن گرووپێکی ئیتنیکی جیاواز بەکارهێناوە.
نووسەر، لەو چەن دێڕەی سەرەوەدا، جگە لەوەی، هەر دوو چەمکی « گەلانی ئێران » و « نەتەوەی دەسەلاتدار »ی، وەک پێویست بەکارهێناوە، هەر دوو زاراوەی گەل و نەتەوەی بۆ کورد و « گرووپە ئیتنیکەکانی دیکەی ئێران » تێکەڵکردووە و بە هەڵە بەکاریهێناون. بۆ؟ چونکە، وەک پێشتر باسمکرد، « ئێران »، لە چەن گەلێکی جیاواز پێکهاتووە. « گەل »یش تاکە و کۆکەی « گەلان »ە. واتە: « گەلانی ئێران »، کۆی « گەل » دەکا و زۆر لە جێی خۆیدا نووسراوە. هەروەها، « فارس »ەکان لە « ئێران »دا، تەنیا هەر بە « نەتەوە » دەژمێررێن و « گەل » نەبوون و نین! چونکە، نە نیشتمانەکەیان داگیر و دابەشکراوە، نە خۆشیان وەک نەتەوە لەتوپەتکراون، تا، هەر بەشێکیان وەک کورد، بە سەر دەوڵەتێکی داگیرکەردا بەخشرابێتەوە و ئەو بەشانەش، بە گەل بناسێنین!
بەڵام، کاتێ نووسیویێتی: « کورد و باقی نەتەوەکانی دیکەی ئێرانی » یا، « گەلی کورد »، لێرەدا، زاراوەی « نەتەوە »ی، لەگەڵ زاراوەی « گەل »دا تێکەڵاوکردووە. چونکە، جگە لە « فارس »، لە « ئێران »دا نەتەوەی دیکەی تێدا نییە. ئەو گرووپە ئیتنیکانەی دیکەش، هەموویان بە « گەل » دادەنرێن و هەر گەلێکیشیان، بەشێ لە « نەتەوە »کانی خۆیان پێکدێنن. هەروەها، جارێ کوردی بە « گەل » و جارێکی دیکەش، بە « نەتەوە » داناوە!

## پووختەی مەبەست :

با لەوە گەڕێین، هێندێ لەو زاراوانە، لە فەرهەنگی ڕامیاریی بە گشتیی و فەرهەنگی زمانی کوردییدا بە تایبەتیی، لەچاو فەرهەنگی ئاییندا، زۆر لە مێژ نین، بەکاردێنرێن، بەڵکوو، هەر زۆر نوێشن. چونکە، گەر زاراوەی « گەل »، یا « نەتەوە » بگرین، هەمووی سەد ساڵێ نابێ، بۆ ئەم مەبەستەی ئەوڕۆمان بەکاردێن!
گومانی تێدا نییە، نەک هەر لە زمانی کوردییدا، بەڵکوو، لە زمانی هەموو نەتەوەکانی جیهاندا، جیاوازییەکی تەواو و سنوور بۆ کێشراو، لە نێوان زاراوە ئیتنیکەکاندا هەیە. بۆیە، هەر یەکێ لەو زاراوانە، ناوێکی دیارییکراو و واتایەکی تایبەتییان هەیە. لێرەدا، تەنیا بۆ ڕوونکردنەوە، ئەو زاراوە ئیتنیکانە، لەگەڵ هێندێ زمانی دیکەدا بەراوردەکەم:

| | | |
|---|---|---|
| کوردیـــی | گەل | نەتەوە |
| عەرەبیـــی | شەعب | ئومە |
| ئینگلیزیی | People | Nation |
| ڕووسـیی | Narod | Natsia |
| سـویدیی | Folk | Nation |
| ئـەڵمانیی | Volk | Nation |
| فڕەنسیی | Peuple | La Natione |
| ئیسپانیی | Pueblo | Nacion |

هەڵبەتە، سەرانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « کوردستان »یش، زۆر بە باشیی دەزانن، چ جۆرە جیاوازییەکی گەورە و گرنگ، لە نێوان ئەو زاراوە ئیتنیکانەدا هەیە؟!! واتاکانیان چییە و چی دەگەیەنن؟!! بۆیە، هەر یەکێ لە پێکهاتە نەتەوەییەکانی، ئەو دەوڵەتە تێریتۆریالانەی خۆیان، بە ناوێکی تایبەتیی و زاراوەیەکی دیارییکراوەوە دەناسێنن، تا، لەگەڵ بەرژەوەندیی شۆڤێنیستانەی تایبەتیی خۆیاندا بگونجێ و ڕاژەی ئامانجە چەپەڵەکانیان بکا. بۆ نموونە:

هەمووی چەن ساڵێ لەمەوبەر بوو، « توورکە کەمالیی »یە ڕەگەزپەرستەکان، بە هیچ شێوەیە، ناوی کوردیان، لە دەوڵەتی « توورکیا »دا نەدەبرد و دانیان بە بوونی کورددا نەدەنا، بەڵکوو، بە « توورکی شاخاویی »یان دەناساندن! کەچیی، ئەوڕۆ دەڵێن: « کورد » هەیە و « کوردستان » نییە! لەگەڵ ئەوەشدا، دان بە ئەوەدا نانێن، کورد وەک گەلێکی جیاواز لە خۆیان بناسێنن!

« فارس »ەکان لە « ئێران »، کورد بە بەشێ لە « میللەتی ئێران » دەزانن و وەک گەلێکی سەربەخۆ لێی ناڕوانن. هەروەها، عەرەبەکانیش، لە هەر دوو دەوڵەتی تێریتۆریالی « سووریا » و « عێراق »دا، کورد بە کەمینەیەکی نەتەوەیی دادەنێن. واتە: خاکی نییە! تەنانەت، عەرەبەکانی ئەو دوو دەوڵەتە و هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکانی دیکەش، بە هەموو قوتابخانە ڕامیاریی و ڕێبازە ئیسلامییە جیاجیاکانیشیانەوە، هەر دوو دەوڵەتەکە، بە دوو دەوڵەتی عەرەبیی دەناسن. واتە: لە ڕووی جوگرافیاوە، خاکی « عێراق » و « سووریا »، بە بەشێ لە نیشتمانی عەرەب، لە ڕووی ئیتنیکیشەوە، دانیشتووانی هەر دوو دەوڵەتەکە، بە بەشێ لە نەتەوەی عەرەب دادەنێن. ئەمەشیان نەشاردۆتەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، لە هەموو بەرنامە، پێڕەو، پڕۆگرام، دەستووری پارت و دەوڵەتە عەرەبییەکاندا تۆماریانکردووە.

سەیر ئەوەیە، کاتێ « پارتی بەعس » نەما و ڕژێمەکەی « سەددام » ڕوخا، هەرچەندە، عەرەبەکانی « عێراق »، هەرچی چۆنێ بوو، بەوە قایلبوون، لە دەستووری کاتیی « عێراق »دا بنووسن: عەرەبی « عێراق »، بەشێ لە نەتەوەی عەرەب پێکدێنێ. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، قایل نەبوون، بنووسن: کوردی « باشووری کوردستان »، یا، کورد لە « عێراق »دا، بە بەشێ لە نەتەوەی کورد دادەنرێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کورد بە « نەتەوە » نازانن و بە بەشێ لە خۆیانی دادەنێن!

هەروەها، لێپرسراوانی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکە، هەموو گرووپە ئێتنیکەکانی دیکەش، هەر بە کەمینەی نەتەوەیی دەژمێرن. ئایا، ئەمە هەر وا بە خۆڕایی هاتووە؟!! نەخێر. چونکە، گەر بە کەمەنەتەوەیی دایان نەنێن و حسێبی « گەل »یان بۆ بکەن، هەڵبەتە دەبێ، دان بە مافی چارەنووسی نەتەوەییشیاندا بنێن. بەڵام، کەمینەی نەتەوەیی، جگە لە مافی ڕۆشنبیریی و هێندێ مافی هاووڵاتێتیی دیکە، هیچی دیکەی ناکەوێ.

هەڵەیەکی زۆر گەورە دەکەین، گەر زاراوە ئێتنیکەکانی میللەت، گەل و نەتەوە، بۆ گرووپە ئێتنیکەکانی هەر چوار دەوڵەتە فرە نەتەوە و نیشتمانەکانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » بەکاربێنین. چونکە، چ لە ڕووی زمانەوانیی، چ لە ڕووی ڕامیاریی و چ لە ڕووی ئێتنیکەوە، بە هیچ شێوەیە ڕاست نین و پێویستە، لە نووسین و بەرنامەی دەزگەکانی ڕاگەیاندندا بەکار نەهێنرێن. بەڵکوو دەبێ، لەبری ئەو زاراوانە، تەنیا هەر، زاراوەی کۆمەڵگە یا گەلانی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » بەکاربێنرێن! لە هەمان کاتیشدا نابێ، چەمکی نەتەوەی یەکەم، نەتەوەی دووەم و نەتەوەی سێیەم، لە هەر چوار دەوڵەتەکەدا بەکاربێنرێ. چونکە هەڵەیەکی گەورەیە و وەک ڕوونمکردەوە، لەو دەوڵەتانەدا، جگە لە « توورک و فارس » نەتەوەی دیکەی تێدا نییە!

جگە لەوەی، هەر وەک چۆن، زاراوەی گەلی « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا » ڕاست نییە و داگیرکەران، لە بەر جامی زاراوەی گەلی « سۆڤێت » وێنەیان لێ شتۆتەوە، هەروەها، زاراوەی گەلی « باشووری کوردستان »یش، هەر لەو ڕوانگەیەوە هاتووە و بە هەڵە بەکارهێنراوە. چونکە، تەنیا هەر گەلی کورد لە « باشوور » ناژی، بەڵکوو، چەن کەمینەیەکی نەتەوەییشی تێدا دەژی، لەبەرئەوەوە، ڕاستتر وایە، گەر ویستمان، باسی هەموو گرووپە ئێتنیکەکانی « کوردستان » بکەین، بنووسین: گەلی کورد و کەمینە نەتەوەییەکان لە « باشووری کوردستان ». یا، گەر ویستمان، تەنیا هەر باسی کورد بکەین، دەبێ، بنووسین: گەلی کورد لە « باشووری کوردستان ». یا، گەر هەر تەنیا،

مەبەستمان لە یەکێ لە کەمەنەتەوەییەکان، یا هەموویان بوو، دەبێ، ناوی ئەو کەمەنەتەوەییە بێنین و بۆ نموونە بڵێین: کەمەنەتەوەیی « عەرەب، توورکمان، کلدانیی و ئاشووریی » لە « باشووری کوردستان ».
هەروەها پێویستە، لە جیاتی زاراوەکانی « کەمەنەتەوەیی، میللەت، گەل و نەتەوە »کانی شاری « کەرکووک »یش، تەنیا گرووپە ئیتنیکەکان، یا پێکهاتە نەتەوەییەکان، یا دانیشتوان، یا خەڵکی شاری « کەرکووک » بەکاربێنین.
چونکە جگە لەوەی، « کەرکووک » شارێکی « کوردستان »ە، کوردیش لەو شارەدا، بەشێ لە گەلی کورد پێکدێنێ. بەڵام، گرووپە ئیتنیکەکانی دیکەی وەک: « توورکمان، ئاشوور، ئەرمەن و کلدان »، هەر کەمینەی نەتەوەیی و ئایینیی بوون، ژمارەشیان چەن زیادکا، هەر بە کەمینە دەمێننەوە. چونکە، ژمارە هیچ بایەخێکی نییە، بەڵکوو، خاک بڕیار لە سەر ئەو کێشەیە دەدا!
لەبەرئەوە دەبێ، بۆ ئەو گرووپە ئیتنیکانەی، چ لە « کوردستان » و چ لە « عێراق » دەژین، تەنیا هەر زاراوەی شیاو و پڕ بە پێستی خۆیان « کەمینەی نەتەوەیی » یا « کەمەنەتەوەیی »یان بۆ بەکاربێنرێ. چونکە، ئەوانە نەک هەر میللەت نین، بەڵکوو گەل و نەتەوەش نین! جا، گەر گەل، یا نەتەوە بوونایە، هەڵبەتە بۆیان هەبوو، داوای مافی چارەنووسی خۆیان بکەن و دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆشیان دامەزرێنن!
لەبەرئەوە، زاراوەی میللەت، نە لەبری گەلی کوردیی و نە لەبری « شەعب »ی عەرەبیی بەکار نایە. بەڵکوو پێویستە، گەل لەبری « شەعب » و نەتەوەش لەجیاتی « ئومە »ی عەرەبیی بەکاربێنرێن. باشتریش وایە، بۆ ئەو مەبەستە، میللەت بەکار نەهێنرێ، بەڵکوو، بۆ گرووپێکی ئایینیی بەکاربێنرێ، هەر وەک لە قورئاندا هاتووە!
دیارە، گەل و نەتەوەش، جیاوازییان هەیە. گەل: بە کوردی دانیشتووی، پارچەیەکی دیارییکراوی « کوردستان » دەگوترێ، وەک دەڵێین: گەلی کورد لە « باکوور، خۆرهەڵات، باشوور و خۆراوا »ی « کوردستان ». یا، گەلی کورد لە « توورکیا، ئێران، عێراق و سووریا ». چونکە، هەموو کورد، لە چوارچێوەی سنووری یەک دەوڵەتی یەکگرتوودا ناژین، کۆنەبوونەتەوە و لە یەکدی پچڕاون.
بەڵام، بە هەموو کوردی ناوەوە و دەرەوەی پارچەکانی « کوردستان »، یەک نەتەوە پێکدێنن. هەروەها، عەرەبەکانیش لە هەر وڵاتێکی عەرەبییدا، بە گەلی عەرەب ناودەبرێن، بە هەمووشیان یەک نەتەوە پێکدێنن.

**ستۆکهۆڵم ـ 2004. 07. 01**

* * *

سەرچاوەکان:

1. جەمال نەبەز، بیری نەتەوەی ی کوردی نە بیری " قەومیەت "ی ڕۆژهەلاتی و نە بیری " ناسیۆنالیزم "ی ڕۆژئاوایی یە، چاپی1، بنکەی چاپەمەنی ئازاد، ستۆکهۆلم، سوید، 1984.
2. حزب و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان لە شاری کەرکوک، « 2004. 05. 03 » ڕوونکردنەوە، « Kurdistanpost ».
3. ح. ئەیوب زادە، عەبباس وەلی و نا دیموکراتی بوونی کورد! 11 .05 .2004، سایتی KP
4. حەمەسەعید حەسەن، کۆتر و پلنگ، « 2003. 08. 10 »، سایتی KN
5. حەمەسەعید حەسەن، « نوێنەران »ی کورد، « 2004. 02. 23 »، سایتی KN
6. حوسێن محەمەد عەزیز، سێ سەرنجی زمانەوانیی، پەیام، ژمارە 8، یولی 1998.
7. حوسێن محەمەد عەزیز، سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چاپی1، چاپخانەی هەوالّ، سولەیمانیی، 1999.
8. دارا مەحموود، پشوویەک لە هەوارگەی کاروانە دووروودرێژەکەی مامۆستا « فاتیح ڕەسولّ »دا، مانگنامەی پەیام، ژمارە11، ئۆکتۆبەری1998.
9. دیوانی موفتی پێنجوینی، ـ مەلا عەبدوللای توتنچی، بەغدا، 1990.
10. ڕەفیق حیلمی، شعر و ئەدەبیاتی کورد، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپی2، چاپخانەی خوێندنی بالا، هەولێر، 1988.
11. ڕێکار ئەحمەد، پەیڤێک بۆ ئەو بەرێزەی کە هەموو حزبە کوردستانیەکان بە دەستکرد دەزانێت، « Kurdistanpost ».
12. عەزیزی ئیبراهیمی، ڕێنووس و ڕێزمانی کورد دستور زبان کردی با ترجمە فارسی، مرکز پخش: ماهاباد، سالی چاپ؟
13. قورئان.
14. نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، چاپی1، ئەلمانیا ـ بەرلین، 1997.
15. نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان ی ەکتری ئەشکێنن، چاپی1، ئەلمانیا ـ بەرلین، 1997.
16. هێمن، پاشەڕۆک، چاپی2، چاپخانەی پیرۆز، لە بلاوکراوەکانی سەییدیان، مهاباد، خاکەلێوەی 1362 هەتاوی.
17. د. عبدالوهاب حمید رشید، العراق المعاصر، انظمە الحکم و الاحزاب السیاسیە، الطبعە1، السوید ـ استوکهلم، 2001.
18. عصمت سیف الدولە، الدیمقراطیە و الوحدە العربیە، ندوە ازمە الدیمقراطیە فی الوطن العربی، ص 796 - 800.
19. محمد احمد خلف الله، التکوین التاریخی لمفاهیم الامە، القومیە، الوطنیە، الدولە و العلاقە بینها، ندوە القومیە العربیە و الاسلام، 1981.

# چەن سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینی و نەتەوەیی

## « خەلیل منەوەر »

ماوەی پتر لە سالێ دەبێ، لە سەر هەر دوو قوتابخانەی هۆنراوەی کلاسیک و نوێی کوردیی، پڕۆژەیەکی کۆڵینەوە و ڕەخنەی وێژەییم بە دەستەوەیە. تا ئەو ڕۆژەی پڕۆژەکە تەواودەبێ و چاپدەکرێ، هەوڵدەدەم، بە زنجیرە گوتارێ، هێندێکی لێ بڵاوکەمەوە.
بە داخەوە، زۆربەی ئەو کۆڵینەوە وێژەییانەی، دەربارەی ژیان و بەرهەمی هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد بڵاوکراونەتەوە، زۆربەی زۆری پێداهەڵدان و ستاییشکردن بووە، خاڵە لاواز و بەهێزەکانیان، وەک یەک، بە تەرازوویەکی ڕەخنەگرانە و دادپەروەرانە نەکێشاوە. بۆیە بە ئاشکرا دەبینین، چاوپۆشیی لە هێندێ لە کەموکوورییەکانیان کراوە، وەک ئەو هۆنەرانە، فریشتە بووبن و لە ئاسمانەوە بۆ کورد باریبن، لە ژیانی وێژەیی خۆیاندا، هیچ جۆرە هەڵەیەکیان نەکردبێ!
ئەز لێرەدا، تەنیا لەو کەموکورتییانە دەدوێم، کە پێوەندییان بە « ژیانی وێژەیی، ناوەڕۆکی بەرهەم، کێشەی زمان و هەڵوێستی نەتەوەیی »یانەوە هەیە. بە هیچ شێوەیە، پەنجە بۆ ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیان ڕا ناکێشم، چونکە، ئەو جۆرە شتانە، پێوەندیی بە ژیانی تایبەتیی خۆیانەوە هەیە، کەس بۆی نییە، لێیان بدوێ و ڕەخنەیان لێ بگرێ. لەبەرئەوەی، هەموو مرۆڤێ ئازادە، پێویستە چۆنی دەوێ، هەر بەو شێوەیەش بژی، گەر دەسەڵاتی هەبێ و بۆی بلوێ!

بەرهەمی « شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر »، یەکێ بوو، لەو بابەتانەی لە پرۆژەی کۆڵینەوەکەدا، بایەخی تایبەتیی پێ دراوە. لە ڕاستییدا، ئەوەی پتر سەرنجی ڕاکێشام، ئەو پێشەکییە سیوسێ لاپەڕەییە بوو، کە « مستەفا نەریمان » بۆی نووسیوە. چونکە، نووسەر کاتێ باسی ژیانی هۆنەری « خەلیل منەوەر » کردووە، چەن شتێکی وەک « هۆز، ئایین و نێوچە »ی تێکەڵاوکردووە. بۆیە، بە پێویستم زانی، چەن شتێ دەربارەی ئەو زاراوە « کۆمەڵایەتیی، ئایینیی و جوگرافیایی »یانە ڕوونکەمەوە.

« خەلیل منەوەر 1863-1923»، یەکێ لە ڕووناکبیر و هۆنەرە کوردەکانی نێوچەی گەرمیانی « باشووری کوردستان » بوو، بە هۆنەرێکی میللیی سەردەمەکەی خۆی دادەنرێ. گەلێ هۆنراوەی « ئایینیی، دڵداریی، کۆمەڵایەتیی و داستانەهۆنراوە »ی هەیە.

« مستەفا نەریمان »، کاتێ باسی ژیانی هۆنەری کردووە، لە چەن جێیەکدا، هۆز و ئایینیی لە یەکدی جیانەکردۆتەوە. بۆ نموونە نووسیوێتی: (« خەلیل منەوەر » بە بیروباوەڕ « کاکەیی » بووە، گەلێ باوەڕی بە خوا و پێغەمبەر بووە...)«15،3»

کاتێ، هەڵەی ئەو نووسەرانەی ڕاستکردۆتەوە، کە پێشتر لە سەر هۆنەریان نووسیوە، نووسیوێتی: (میرزا خەلیل پیرەمەوەنی داودە نییە بەڵکوو لە هۆزی کاکەیی یە.)«17،3»

لە شوێنێکی دیکەدا، باسی گوتارێکی خۆی کردووە و نووسیوێتی: (نووسەری ئەم پێشەکیی یە لە ژمارە « 16 » ساڵی « 1974 »ی گۆڤاری « بەیان »دا، بە ناونیشانی « شاعیری دەشتی گەرمیان خەلیل منەوەر »ەوە سێ لاپەڕەی لە سەر ئەم شاعیرە نووسیوە. بەڵام، لەوەدا بە هەڵەچووە، تا ئەو سەردەمە، بە تەواوەتی بۆی ساغ نەبوەوە، شاعیر لە هۆزی « کاکەیی »یە یان « داودە »یە، کە شیعرەکانی « عەبداڵ »ی دەسکەوت و دەستخەتی دیکەی شاعیری بینی، ئەوا بە تەواوەتی بۆی ساغ بوەوە.)«18،3»

دەربارەی ژیانەکەشی نووسیوێتی: (خەلیل کوڕی خضر کوڕی ئەحمەد کوڕی خەلیلە لە هۆزی « کاکەیی »یە ... تاد)«23،3»

کاتێ، باسی کۆتایی ژیانیشی کردووە، نووسیوێتی: (ڕوو ئەکاتە ناو هۆزی کاکەیی ...)«28،3»

لە پەراوێزی ژمارە «17»شدا، باسی « کاکەیی »یەکانی کردووە و نووسیوێتی: (کاکەیی: هۆزێکی ڕەسەنی کوردە لە عێراق و ئێراندا هەن، لە عێراقدا لە دەوروپشتی « خانەقی » و « کەرکووک » و « داقوق، تاوغ »

نیشتەجێن لە دێهاتەکانی تاوغ « عەرەب کۆیی، عەلی سەرای، تۆپزاوە، زانقر، مەتیق، لهێب، ئەلبو مەمەممەد » دائەنیشن. ئەم هۆزە ئایینێکی تایبەتیان هەیە، ڕەگ و ڕیشەی ئەگەڕێتەوە سەر ئایینە کۆنەکانی ئێران.)«3،31-32»
هەروەها، لە پەراوێزی ژمارە «31 »یشدا، دووبارە نووسیوێتی: (مەبەستی لە « ماچۆزوان »، هۆزی « کاکەیی »یە،)«3،33»
جا ئێستە با بزانین، ئەمانە چی دەگەیەنن؟!
یەکەم ـ نووسەر، جیاوازیی لە نێوان هۆز و ئاییندا نەکردووە.
دووەم ـ لە لایە جیاوازیی لە نێوان نێوچە و هۆز، لە لایەکی دیکەشەوە، جیاوازیی لە نێوان نێوچە و ئاییندا نەکردووە.
سێیەم ـ جارێ « کاکەیی » بە هۆز و جارێکی دیکەش، بە ئایینی ناوبردووە.
ئاشکرایە، هۆز و ئایین، دوو شتی جیاوازن. با لێرەدا، چەن ڕاستییەک، دەربارەی هۆز و ئایین ڕوونکەمەوە.(لە وولاتە دواکەوتووەکانی خۆرهەڵاتی نێوەند بە تایبەتیی و کیشوەری « ئاسیا » و « ئەفریکا » بە گشتیی، هەموو کۆمەڵێ لە خوارەوە بۆ سەرەوە، لە پچووکەوە بۆ گەورە، دوای تاکەکانی کۆمەڵ، لە چەن یەکەیەکی گرنگی سەرەکیی وەک: « خێزان، بنەماڵە، تیرە، هۆز و خێڵ » پێکهاتووە، تا بە کۆی هەموویان، گەل و نەتەوەیەکی دیارییکراو پێکدێنن.)«1،10»
جارێ با بزانین، هۆز چییە؟ لە چی پێکدێ؟ (وەک ئاشکرایە، بە چەن بنەماڵەیەکی دیارییکراو، تیرەیەک و بە چەن تیرەیەکیش، هۆزێکی دیارییکراو پێکدێنن. بۆ نموونە: هۆزی جاف، لە چەندین تیرەی وەک: « هاروونیی، ئیسماعیلیی، عەزیزیی، میکایلیی، تەرخانیی، شاتریی، تاوگۆزیی و گەلاڵی ... تاد » پێکهاتووە. ئەم تیرانە، هەموو لە نێو خۆیاندا، خۆیان بە خزمی یەکدی دەزانن، هێندێ بەرژەوەندیی تایبەتیی کۆیاندەکاتەوە، لە کاتی تەنگانەدا، داکۆکیی لە یەکدی دەکەن. کەواتە دەتوانین، بلێین: هۆز وەک ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیی وایە، زۆربەی پێوەندییەکانی خۆی، پتر لە سەر بنچینەی ڕەگەز، خوێن و پلەی خزمایەتیی دادەمەزرێنێ، هەموو تاکەکانی هۆزەکە، ئەرکی سەرشانی دیارییکراوی تایبەتیی خۆیان هەیە.)«1،11-12»
واتە: هۆز بە یەکەیەکی کۆمەڵایەتیی دادەنرێ، کە لە کۆمەڵێ تیرەی جیاواز پێکهاتووە، پێوەندیی نێوانیان، خۆی لە پێوەندیی خوێن و ژنوژنخوازییدا دەبینێ. هەموویان لە بنەڕەتدا، لە یەک بەرەباب و سەرچاوەوە کەوتوونەتەوە، هیچ پێوەندییەکی، بە باری ئایینییەوە نییە. کەچیی، لە هەمان کاتیشدا دەکرێ، ئەندامانی هۆزێکی دیارییکراو، لە سەر یەک ئایین بن.

لەو بارەیەوە، شارەزایەکی وەک « Hay » نووسیویّتی: (هۆز کۆمەڵێک، یاخود چەن کۆمەڵێکی یەککەوتەیە، کە بۆ پاراستنی ئەندامانی لە دەستدرێژیی دەرەکیی و بۆ پارێزگاریی دابونەریتی میللیی پێکهاتووە، برێک هۆز هەن، هەتا سەرکردەیەکی دانپێدانراویشیان نییە، هەندە هۆزێکیش هەن، کە چەن سەرۆکێکیان هەیە ..... هۆزە گەورەکان، بە سەر چەن لقێکدا دابەشدەکرێن.) «134،2»

هەروەها، « Rondot »یش دەربارەی هۆز نووسیویّتی: (جیهانێکی گچکەیە و لە هەناوی خۆی دەڕوانێت، ئامرازێکی بەرگرییە، دەزگەیەکی نەریتیی و پارێزکارە. کۆمەڵێکە، خۆی لە هاوچەشنەکانی بە مەزنتر دەزانێت.)«134،2»

گەورە و پچووکیی هۆزەکان، لاوازیی و بەهێزییان، پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە مێژووی ئەو هۆزە و سنووری جوگرافیای دەسەڵاتی هۆزەکەوە هەیە. هەڵبەتە، (تا درەختی هۆزێکی دیارییکراو، ڕەگی قووڵی، بە ناخی مێژووی گەلێکدا داچووبێ و مێژوویەکی دێرینی هەبێ، ئەوا، هۆزەکە پتر گەورە دەبێ، سنووری دیمۆگرافیا و جوگرافیای هۆزەکە، بەرفراوانتر و بەربڵاوتر دەبێ. بە پێچەوانەشەوە، ئەو هۆزانەی تازە دروسبوون، جگە لەوەی، بە تەمەن ساوا و بە ژمارە کەمن، زۆر پەلوپۆ ناهاویژن و لە نێوچەیەکی بەرتەسکی جوگرافیاییشدا دەژین.)«12،1»

بەڵام، ئایین بە پێوەندییەکی گیانیی دەژمێررێ. پێوەندییەکە، لە نێوان یەزدانی گەورە و تاکەتاکەی کۆمەڵگەی مرۆدا دروستدەبێ. ئەویش، لە ڕێی پەیامبەر و پەرتووکە ئایینییە پیرۆزە ئاسمانییەکانەوە پەیدادەبێ. وەک هۆز، هیچ جۆرە پێوەندییەکی ڕەگەز یا خوێن، ئەندامانی یەک ئایینیی دیارییکراو پێکەوە نابەستێ. هەروەها، پێویستی بە هیچ جۆرە سەرکردەیە نییە.

هۆز، لە نێوان کۆمەڵێکی دیارییکراو و لە نێو یەک نەتەوەی تایبەتییدا سەرهەڵدەدا. بە شێوەیەکی گشتیی، هۆزەکان لە یەک نێوچەی جوگرافیای دیارییکراودا دەژین. بەڵام، جاری وا هەیە، هۆزێ لە چەن نێوچەیەکی جیاوازدا نیشتەجێدەبێ، وەک لە نێو زۆربەی، هۆزە کوردەکاندا باوە.

بەڵام، ئایین سنووری هەموو « تیرە، هۆز، گەل، نەتەوە، نێوچە، وڵات و کیشوەر »ێ دەبڕێ، واتە: هۆز سنوورێکی تەسکی کۆمەڵایەتیی هەیە. ئایین بێ سنوورە و پێوەندیی بە « هەست، هۆش، باوەڕ و گیان »ەوە هەیە. لە نێو دڵ و دەرووندا دەژی، وەک هەوا وایە، بە هەموو « گوند، شار، نێوچە، وڵات و کیشوەر »ێکدا بڵاودەبێتەوە. لە نێو باوەڕی هەموو مرۆڤێکدا، ڕەگی قووڵی خۆی، بە شێوەیە لە شێوەکان دادەکوتێ. لەبەرئەوە، بە باوەڕێکی

ئینتێرناسیۆنالی گیانیی دادەنرێ. بەڵام، هۆز یەکەیەکی « کۆمەڵایەتیی ـ نەتەوەیی »یە. کاتێ، کۆمەڵگە بەرەو پێشکەوتن دەڕوا، پێوەندییە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان سەقامگیردەبێ، هۆز لە ئارادا نامێنێ و کۆتاییپێدێ. کەچیی، پێوەندیی ئایین، بە هیچ جۆرێ کۆتایی نایە. دەتوانم، بڵێم: ئایین لەگەڵ تەمەنی زەوی دایە، بە ژیان و مانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتییەوە بەسراوە، تا ئەم گەردوونەش بمێنێ، پێوەندیی ئایینیی، لە نێوان خەڵک و خوادا هەر دەمێنێ و کاری خۆی دەکا.

لە ڕاستییدا، « کاکەیی » هۆز نییە، بەڵکوو، ئایینێکی کۆنی کوردە، بە ئایینی « ئەهلی هەق » ناسراوە. هەڵگرانی ئەم باوەڕە، لە زۆر جێی « کوردستان »دا هەن، بە تایبەتیی لە ڕۆژهەڵات و باشووری « کوردستان »، چ لە بەشە گەرمیانەکەی و چ لە بەشە کوێستانەکەیدا بێ، بڵاوبوونەتەوە و دەژین. تا ئەوڕۆ و تا ڕادەیەکی زۆریش، پارێزگاریی ئایین و کەلتووری تایبەتیی خۆیان کردووە.

لەبەرئەوە، کوردێ بۆی هەیە، بە ئایین « کاکەیی » بێ و سەر بە هۆزێکی دیارییکراوی کوردیش بێ. بۆ نموونە: دەشێ « خەلیل منەوەر »، لە هۆزی « داودە » بووبێ، لە هەمان کاتیشدا، لە سەر باوەڕی ئایینی « کاکەیی » بووبێ.

ئەز پێموایە، « خەلیل منەوەر » لە هۆزی گەورەی « داودە » بووە. بەڵگەشمان ئەوەیە، کاتێ، مرۆڤێ لێی دەقەومێ، داوای یارمەتیی و کۆمەک، لە کەسەکانی نزیکی خۆی دەکا، ڕوو لە تیرە و هۆزەکەی دەکا، تا بە هانایەوە بێن، دەسی یارمەتیی بۆ درێژکەن، داڵدەی بدەن و بیپارێزن. ئەوەتە دەبینین، لە کاتی یەکەمین جەنگی جیهاندا، کاتێ باری « باشووری کوردستان »، بە تەواویی تێکچووە، هۆنەر پەرەوازەبووە، ڕووی لە خزم و هۆزەکەی خۆی کردووە. تەنانەت، لەو بارەیەوە، « مستەفا نەریمان » خۆی، پێی لەو ڕاستییە ناوە و نووسیوێتی: (شاعیری نەفس بەرز « خەلیل منەوەر »، نابێتە نۆکەر. برسێتی ئەو ساڵەش، تا بڵێی سەختبووە. لە برسانا، هاواری نەدارا ئەگەیشتە گەردشی گەردوون. شەڕی تورک و ئینگلیزیش، زیاتر تینئەسێنێت، سوپای تورک ئەداتە سەر خەڵکا و هەرچی شک بەرن، ڕای ئەماڵێ و ئەیبا. لەم بارودۆخە نالەبارەدا، ژن و منداڵەکانی میرزا « خەلیل »، لە برسانا ئەمرن. خۆیشی وەک شێت، دەفتەر و کتێبەکانی ئەداتە سەرشانا و ڕووئەکاتە ناوچەی « داودە »)«28،3» پاشان نووسیوێتی: (ڕووئەکاتە ناو هۆزی کاکەیی ... تاد)«28،3»

گەر نووسەر بینووسیایە، ڕووئەکاتە ناو هۆزەکانی « کاکەیی »، هێشتا هەر باشتربوو، واتاکەی گەلێ دەگۆڕا. چونکە، ئەو کاتە بۆمــــان دەردەکەوت، « کاکەیی »یەکان، لە چەن هۆزێکی جیاواز پێکهاتوون، هەمووشیان لە سەر باوەڕی « کاکەیی »ن. بەلام، کاتێ نووسیویێتی: هۆزی « کاکەیـــی »، واتە: « کاکەیی » هۆزە و هەر لەو تاکە هۆزەش پێکهاتووە. لە « کوردستـان »دا نەبیسراوە، هۆزێ، بە تەنیا ئایینێکی تایبەتیی هەبێ، لە ئایینی هۆزەکانی دیکەی کورد جیاوازبێ! تەنانەت، « یەزیدیی »یەکانیش وەک کورد، لە چەن تیرە و هۆزێ پێکهاتوون.
سەیر ئەوەیە، « خەلیل منەوەر »ی هۆنەر، نەک هەر لە نێوان هۆز و ئاییندا گیریخواردووە، بەلکوو، لە نێوان کورد و توورکمانیشدا، گرفتیان بۆ دروستکردووە. با بزانین چۆن؟
ئەو هۆنەرە کوردانەی، بە زمانەکانی دیکەی وەک : « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »، هۆنراوەیان گوتبێ، جا گەر تەنیا هەر، چەن هۆنراوەیەکیشیان، بە یەکێ لەو زمانانە هۆنیبێتەوە، وەک زۆربەی زۆری هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد، یا هەر تەنیا، بە یەکێ لەو زمانانە، هۆنراوەیان دانابێ، وەک هۆنەران: « جەمیل سدقی زەهاویی، ئەحمەد شەوقیی، بلند حەیدەریی ... تاد »، ئەوا نووسەر و ڕۆلەکانی ئەو گەلە، کاتێ هۆنراوەکانیان دەخوێننەوە، دەربارەیان دەنووسن و یادیاندەکەنەوە، بە هۆنەری خۆیان دادەنێن. چونکە، خۆپەرستیی نەتەوەیی لەوە دایە، هەموو گەل و نەتەوەکان، بە لای خۆیاندا دادەتاشن، چاو لە ڕاستیی دەنوقێنن. دەیانەوێ، لە سەر حسێبی ماندووبوون، بەرهەمی کەلە نووســەر و هۆنەرانی گەلانی دیکە، « مێژوو، هونەر، وێژە و کەلتـوور »ی نەتەوەیی خۆیان دەولەمەندکەن.
ئەز لام سەیر نییە، زۆربەی پەرتووکە « عەرەبیی، توورکیی و فارسیی »یەکان، بە ناوی « نووسەر، هۆنەر، زانا و مێژوونووس »ی کورد و گەلانی دیکەی موسولمان ئاخنرابن، بە یەکێ لە ڕۆلە بە ئەمەک و دلسۆزەکانی گەلەکانی خۆیانیان دانابن. بەلام، سەیر ئەوەیە، کەم کەس هەیە، نەزانێ، « ئیبن خەلەکان » کورد بووە و خەلکی گوندی « خەلەکان »ی سەر بە پارێزگـــەی « سولەیمانیی » بووە، کەچیی، هەر لەبەرئەوەی، زانایەکی لێهاتوو و هەلکەوتووبووە، عەرەبەکان بە عەرەبیی دادەنێن. جگە لەوەی، کوردێکی مەردی قارەمانی شۆڕشگێڕی وەک « شێخ مەحموودی حەفید »یشیان، هەر بە عەرەب داناوە، کە هەموو ژیانی خۆی، لە پێناوی مافی کورددا تێکۆشاوە و بەختکردووە!

لەبەرئەوە، دەبینین، توورکمانەکانی « باشووری کوردستان »یش دەیانەوێ، مێژوو و کەلتووریٚ بۆ خۆیان دروستکەن. بۆیە، هۆنەرێکی کوردی « کاکەیی » نێوچەی گەرمیانی وەک « خەلیل منەوەر »، بە توورکمان دادەنێن. با بزانین، چۆن؟

« مستەفا نەریمان » نووسیویێتی: (لە دوو ژمارەی گۆڤاری « قرداشلق ـ ئەلئەخاء »ی عەرەبیی و توورکمانیی سالٚی « 1971 »دا، مامۆستا « موسا زەکی مستەفا »، بە تورکمانیی بە ناونیشانی « لە شاعیرە وونبووەکانمان »، باسێکی دووردرێژی دەربارەی شاعیرمان نووسیوە، چەند پارچە شیعرێکی تورکمانیی شاعیری بلاوکردۆتەوە. نووسەر ببڕای ببڕای، پەنجەی بۆ ئەوە ڕا نەکێشاوە، کە ئەم شاعیرە کوردە و کاکەیی یە و شیعری بە کوردییش هەیە.)«18،3»

هەروەها، لە جێیەکی دیکەشدا نووسیویێتی: (دیسانەوە بە تورکمانیی، لە کتێبی « عراقدە تورکمن ادبیاتی اورنەکاری ـ چەند نموونەیەکە لە ئەدەبی تورکمانەکانی عێراق » مامۆستا « موحسین بەهجەت شاکیر »، لە باسی « شاعیری جەماوەردا »، ناوی « خەلیل منەوەر »ی بردووە و بە تورکمانی داناوە و پشتی بە سەرچاوە تورکمانییەکەی پێشوو بەستووە.)«18،3»

هەرچەندە، گومان لەوەدا نییە، « منەوەر » هۆنەرێکی کوردبووە، چونکە، باوەڕ ناکەم، هیچ توورکمانێ بتوانێ، یا بیەوێ، بەو شێوەیە، هەستی خۆی بەرانبەر جێژنی « نەورۆز » دەربڕێ. ئەوا ماوەی، دووهەزاروحەوتسەد ساڵ دەبێ، یادی جێژنی « نەورۆز »، لە دڵ و دەروونی هەموو کوردێکدا دەژی، مەگەر هەر کورد توانیبێتی، بەو شێوەیە، پارێزگاریی ئەو جێژنە نەتەوەییە بکا! جا گەر، یەکێکی وەک « منەوەر »، توورکمان بووایە، چ کارێکی بە « نەورۆز » هەبوو؟! بۆ لە هۆنراوەی « فەصل خەزان »دا، بە یازدە نیوەدێڕ، بە بەهاری « کوردستان » و « نەورۆز »ی کوردیدا هەڵدەدا و دەیگوت:

دۆستان وەهارەن، فەصل خەزانەن
فەصل گوڵزار و گرۆی یارانەن
یادی « نەورۆز » و عیدی « قوربانەن »
عیدی کاوە و گرۆی کوردانەن
یادی « فەرەیدون »، مەرد نەهەنگەن
یادی سواران، شێران جەنگەن
جەژنی مەلان و درەخت باغانەن
ساز و سەمتوری، دیدە مەستانەن «47،3»

هەر مەلێ نەغمێ ماچۆ بەر بەرێ وێش
زام زامداران سارێژ مۆ نەئێش
هەر گولێ ڕەنگێ، مەدەرۆ نیشان
نەڕەنگاوڕەنگش، عاشق مۆ حەۆران
تو خوا یاری جوان، قامەت عەرعەریی
سینە مەرمەڕیی، ئەبرۆ قەمەریی
یەک زەڕە وەفا، باوەرە وەکار
با بلمێ، هەردۆ بەرێ نام گوڵزار
با شادیی و خەنا، باوەڕمێ وە یاد
غەم ئی دونیا، بدرێم وە باد
خۆ من ئەسیری خاڵ و نەقشی تۆم
چە عەشقت ناویا، بەندە پاسای مۆم
من « میرزا خەلیل »، عاشق بە یارم
جە دیدارغار، خەیلێ بێزارم «3، 47-48»

نەک هەر توورکمانەکانی « باشووری کوردستان »، بەڵکوو هیچ گەل و نەتەوەیەکی دیکەش، مافی ئەوەی نییە، لە سەر حسێبی ئارەق و خوێنی کورد، مێژوویەکی پڕ لە درۆ و ساختە، بۆ خۆی دروستکا.
بەڵام لە ڕاستییدا، توورکمانەکان ناهەقیان نییە، ئەو ساختەکارییە بکەن. چونکە، هێندێ نووسەر و هۆنەری کورد، لە بەر هەر هۆیە بووبێ، پشتیان لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆیان کردووە، ڕاژەی زمان و وێژەی نەتەوەکانی دیکەیان کردووە. بۆیە، نەک هەر « خەلیل منەوەر »، کە گومان لە کوردێتی ناکرێ، لە چەن نێوچەیەکی « باشووری کوردستان » پتر، هیچ شوێنێکی دیکەی ئەم جیهانەی، بە چاوی خۆی نەدیوە، بە توورکمان ناودەبرێ. بەڵکوو، هەموو ئەو نووسەر و هۆنەرانەش، کە بە یەکێ یا پتر لە زمانە بیانییەکانی دیکە نووسیویانە، لە نیشتمانەکەی خۆیان باریانکردووە و سەری خۆیان هەڵگرتووە، گەر بە کوردیان دا نەنێن و بە ڕۆڵەیە لە ڕۆڵەکانی خۆیانی بژمێرن، دیسانەوە ناهەقیان ناگرم.
گەر ڕووناکبیر و هۆنەرێکی وەک: « منەوەر »، بۆ زمان و کەلتووری نەتەوەکەی خۆی، بە ڕاستیی « منەوەر » بووایە، لە ئاستی ڕاژەکردنی زمانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکمانیی »دا، « نامنەوەر » بووایە، هەڵبەتە ئەورۆ، ئەو نووسەرانە بە توورکمانیان نەدەژمارد، ئەم گێچەڵەشیان بە کورد نەدەکرد!

ئەگینا، هەر نووسەرێ بیەوێ، لە زمانێکی بیانیی دیارییکراوەوە، هۆنراوەیە یا نووسینێکی تایبەتیی وەرگێڕێ، ئایا، بۆ سەر زمانە نەتەوەییەکەی خۆی، یا، بۆ سەر زمانێکی دیکەی بیانیی وەردەگێڕێ؟!! ئەمە، مەگەر هەر لە هێندێ هۆنەری کوردی وەک « منەوەر » وەشابێتەوە! چونکە، یەکێ لەو بەرهەمانەی، هۆنەر بە دیاریی بۆی بەجێهێشتووین، ئەوەیە: (خۆشویستنی ئیمام عــەلی « خ. ل. »، لە دڵ و دەروونی مـیـرزا « خـەلیل »دا، تەواو ڕەگی داکـوتابوو، هاتبوو، سەد فەرموودەی پێشەوا « ئیمامی »، بە چوارییێن لە عەرەبییەوە گۆڕیوەتە سەر « تورکمانیی و فارسیی ».)
پاشان نووسیویێتی: (پێشکەشی کردووە بە زیرەکترین قوتابی و هاوڕێی دڵسۆزی ئەو سەردەمەی « محەمەد سەعید سلێمان یۆڵچی »)«**21،3**»
دوور نییە، وایزانیبێ، هەموو کورد لە زمانی عەرەبیی تێدەگەن، تەنیا توورکمان و فارسەکان تێی ناگەن، بۆیە، بۆ سەر ئەو دوو زمانەی وەرگێڕاوە!
دیارە، کەس لاری لەوە نییە، هەر نووسەرێ بیەوێ، فەرموودەکانی پەیامبەر، یا هەر بابەتێکی دیکەی « ئایین، مێژوو، هونەر، وێژە ... تاد » وەرگێڕێ.
بەڵام، لێرەدا ڕەخنەکە لەوە دایە، « خەلیل منەوەر »، بۆچی ئەو فەرموودانەی، بۆ سەر زمانی توورکمانیی و فارسیی وەرگێڕاوە؟ بۆچی بۆ سەر زمانە نەتەوەییە هەژارەکەی خۆی وەر نەگێڕاوە؟ ئایا زمانی کوردیی، بە زمانی نووسین و وێژە دانەناوە؟!
جا، لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە، گەر نووسەرێکی کورد، جارێکی دیکە بیەوێ، ئەو ئەرکە بکێشێ، سەرلەنوێ فەرموودەکانی ئیمام، لە توورکمانیی، یا لە فارسییەوە، بۆ سەر زمانی کوردیی وەرگێڕێتەوە، تا، بەرهەمی هۆنەرێکی وەک « خەلیل منەوەر »، لە فەوتان قوتارکا، یا، بە خوێنەرانی گەلەکەی خۆی بناسێنێ، ئەو کاتە دەبێ، بە بەرهەمێکی کوردییشی دانێ!!!
دوور نییە، هۆنەر، بەرهەمی بە هەر سێ زمانی « توورکمانیی، عەرەبیی و فارسیی »، لە زمانە نەتەوەییەکەی خۆی زیاتربێ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە، هەستی نەتەوەیی « خەلیل منەوەر »، زۆر لاوازبووە. بۆیە، وەک پێویست، ڕێزی لە زمان و وێژەی نەتەوەکەی خۆی نەگرتووە. جا، ئەوە هۆنەر لە « کوردستان »دا ژیاوە، بەو شێوەیە، هۆنراوەی بەو زمانە بیانییانە گوتووە، گەر وەک چەن هۆنەرێکی وەک: « نالیی و حاجی قادری کۆیی .. تاد »، لە دەرەوەی « کوردستان »، بە دەربەدەریی بژیایە، لەوانەیە، یەک ووشەی بە کوردیی نەنووسیایە؟!! بۆیە، لای من شتێکی هێندە سەیر نییە، گەر، هۆنەرێکی وەک: « خەلیل منەوەر »، هەستی نەتەوەیی هێندە لاوازبووبێ، لە

کاتێکدا کورد، بە هەموو شێوەیە، لە لایەن ئیمپراتۆریای « عوسمانیی » و ئیمپریالیزمی « بریتانیا »وە، بە خراپترین شێوە چەوسێنرابێتەوە، یەک لە دوای یەک، ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی، لە گۆمی فرمێسک و خوێندا نقومکرابێ، ڕێبەر و سەرکردەکانی گیرابن و دەربەدەرکرابن، یەک هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی نەگووتبێ، چ بە خراپ و چ بە چاک، چ لە دوورە و چ لە نزیکەوە، توخنی ئەو شۆڕشانە نەکەوتبێ، باسی ئازار و ژانەکانی، گەلەکەی نەکردبێ، تەنیا خەریکی هۆنراوەی « ئایینیی، دڵداریی، کۆمەڵایەتیی، هێرشکردن و لاواندنەوە » بووبێ! مەگەر هەر تەنیا، ئەو چامە دووردرێژەی، بۆ داستانی ڕووداوەکەی « موسڵ » گوتبێ، بە بۆنەی کوشتنی « سەیید ئەحمەدی بەرزنجیی و شێخ سەعیدی حەفید »ی برایەوە نووسیویەتی، «3،195-211» کەمێ بۆنی هۆنراوەی نیشتمانیی لێ بێ، ئەگینا، یەک هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی، بۆ خوێی چێشتیش بێ، نەهۆنیوەتەوە! ئەو داستانەش، پتر خۆی لە شێوەی لاواندنەوەدا دەبینێ، لە ڕوانگەیەکی ئایینییەوە گوتراوە، پتریش پلەوپایەی ئایینیی و کۆمەڵایەتیی، بنەماڵەی شێخانی « بەرزنجە »، ڕۆڵی سەرەکیی بینیوە، نەک لە ڕوانگەیەکی نەتەوەییەوە، ئەو کارەی کردبێ!
کاتێ توورکمانەکان، هۆنەرێکی وەک « خەلیل منەوەر » بە توورکمان دادەنێن، لە لایەکەوە دەڵێین، هەروا بە خۆڕایی ئەو کارەیان نەکردووە. چونکە، بۆچی چەن هۆنەرێکی وەک: « شێخ ڕەزا، ئەسیریی ... تاد » بە توورکمان دانانێن؟!
لە لایەکی دیکەشەوە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە، کەمینە و گەلەکانی، نێو چوارچێوەی هەر چوار دەوڵەتە داگیرکەرەکەی « کوردستان »، وەک گورگ، دەمیان لە لاکی نەتەوەی کورد ژەنیووە. دەیانەوێ، بە هەر نرخێ بێ، « ناوی کورد و مێژووەکەی، هونەر و وێژەکەی، شوێنەوار و کلتوورەکەی »، لە کوولەکەی تەپیشدا نەهێڵن! هەر یەکەیان، بەشێکی بۆ خۆی داگیرکا، ناسنامەی نووسەر و هۆنەرەکانمان بسڕنەوە و لە سەر خۆیانی تاپۆکەن، بە « عەرەب، توورک و فارس »یان دانێن. ئێمەش، وەک لە گوێی گادا نووستبین، زۆر بە شانازییەوە، بەرهەمی ئەو نووسەرانە، بەو زمانانە تۆماردەکەین، لێکدانەوە و کۆڵینەوەیان لە سەر دەنووسین، وا دەزانین، ئەو نووسەر و هۆنەرانە، بەو بەرهەمانەیان، کارێکی باشیان کردووە، کە ئاوڕیان لە زمانەکەی خۆیان نەداوەتەوە. یا ئێمە، ئەوڕۆ کارێکی باش بە ئەنجام دەگەیەنین!
جگە لەوەی، هەر هێندە بەس نییە، نووسەران و شارەزایانی کورد، بە زمانی کوردیی و بۆ ڕۆڵەکانی کوردی ڕوونکەنەوە، کە ئەو نووسەر و هۆنەرانە کورد

بوون. چونکه، ئێمەی کورد خۆمان، ئەو زانیارییانە دەزانین، بەڵکوو پێویستە، بە زمانی ئەو نەتەوانە بنووسرێ، هەڵەکانیان بۆ ڕاستکرێتەوە و ڕاستییان تێگەیەنرێ. ئەگینا، گەر کەسێ نەبێ، بە زمانی خۆیان وەڵامیان بداتەوە، ئەوا، ئەو درۆودەلەسانەی ئەوان، لە لاپەڕەکانی مێژوودا تۆماری دەکەن، سبەی لای نەوەکانی داهاتووی هەر دوو نەتەوەکە، وەک ڕاستییەکی مێژوویی لێدێ و دەچەسپێ، بەو شێوەیەش، مێژووی نەتەوەکەمان دەشێوێنن و بۆشیان سەردەگرێ!

« خەلیل منەوەر »، لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمان نەبووە و لە سەر ئایینی « کاکەیی » بووە، کەچیی، چەن هۆنراوەیەکی ئایینیی هۆنیوەتەوە. لە هۆنراوەکانیدا، لە یەزدان پاڕاوەتەوە، لە گوناهەکانی خۆشبێ. ستاییشی پەیامبەر و یارانی، پیروپیاوچاکانی ئیسلامی کردووە. ئەمەش: لە دوو گریمان بەدەر نییە:

یەکەم: هێندێ جار، ناموسوڵمانەکان لە گەلێ وولاتانی ئیسلامدا، بە دەس کاربەدەسە موسوڵمانەکانەوە چەوسێندراونەتەوە، ئازاردراون، لە کار و پیشەی خۆیان دوورخراونەتەوە. هۆنەریش بۆیە، ئەو پاڕانەوە و لالانەوانەی نووسیوە، بۆیە ستاییشی پەیامبەر و ئیمامی « عەلی » کردووە، تا، چاوپۆشیی لێ بکەن، ژیانی لێ تاڵ نەکەن. واتە: لە باوەڕەوە نەبووە،، بەڵکوو بەرتیلیداوە! چونکە، هیچ « کاکەیی »یەک، باوەڕی بە پەیامبەری ئیسلام نییە.

دووەم: یا لە باوەڕەوە بووە. بەڵام، باوەڕەکەی بایی هێندە نەبووە، واز لە ئایینە کۆنەکەی خۆی بێنێ، موسوڵمانێتیی خۆی ڕاگەیەنێ. واتە: دەسی بە قووڵفی هەر دوو ئایینەکەوە گرتووە، تا، هەم لای موسوڵمانەکان خۆشەویست بێ، هەم لە نێو هاوئایینەکانی خۆشیدا، نەفرەتی لێ نەکرێ، بۆ ئەوەی، لە کوردەکەی هەر دوو جێژن نەبێ! ئەگینا باوەڕ ناکەم، هیچ ناموسوڵمانێ، بەو شێوەیە، هۆنراوە بە سەر یەکێکی وەک پەیامبەری ئیسلام و یارانیدا هەڵدا! هۆنراوەی تایبەتیی، بۆ ئیمامی « عەلی » بلێ! با بزانین، لە« موناجات بەردەگاهی قازی ئەلحاجات »، لە چامە درێژە حەفتاوپێنج نیوەدێرییەکەیدا، بە چ شێوەیەکی جوان، هۆنراوەی بۆ پەیامبەر هۆنیوەتەوە، لێی پاڕاوەتەوە و گوتوویەتی:

ڕەحمان ئەلڕەحیم، ڕەحمان ئەلڕەحیم
بە نام یەزدان، ڕەحمان ئەلڕەحیم
قادر و قەههار، وەههاب و عەلیم
واجید و ماجید، حەکیم و سەلیم

صەبوور، سەتتار، عالم غەیبەن
خەڵقندەی ذی رۆح، بێ شک و ڕەیبەن
« سائر ئەلعیوب »، خاص و عەوامەن
رازق دەهەندەی، کوفر و ئیسلامەن
زینەت بەخش، نوور هەفت ئاسمانەن
« حەی لا یەموت »، هەم لا مەکانەن
نیگەهدارندەی، ماهی و بەقەرەن
رەونەق نومای، ئەوج چەرخ ئەخضەرەن
خودای لامەکا،ن حەی خەللاقەن
ئەووەڵ و ئاخر، موعطی ڕەززاقەن
خەڵق کەرد، خەللاق، « شەدید ئەلعقاب »
« محەمەد » جەنوور، ئادەم جە توراب
جە شەرافەتی، نەبیی مورسەل
سازا طەیر و جین و ئینسان و جەبەل
ئەمر کەرد وەعام، مەعبوود ئیلا
پەی « ئەشهەد ئەنە لا ئیلاهە ئیلا ئەڵڵا »
پەی شاهیدی، شان فەخر ئەنبیا
« محەمەد عەبد و ڕەسوله ئەڵڵا »
ئیمانم هەنەن، خواوەند یەکەن
محەمەد رەسوولی، بێ رەیب و شکەن
« خاتەم ئەلمورسەلین »، گشت پێغەمبەرەن
« شافیع ئەلئومە »، ڕۆژ مەحشەرەن
هەر بەو شێوەیە، لە سەر پێداهەڵدان و ستاییشی خۆی بەردەوامبووە و پێیدا ڕۆشتووە، تا لە پاشان گوتوویەتی:
خولاصە، جە نوور « ڕەسوول ئەلئەمین »
خەلق بی ذی رۆح، سەما تا زەمین
حەق بەوێش واتەن: « لەولاک لەولاک
یا ڕەسوول ئەڵڵا، ما خەلەقت ئەلئەفلاک »
دنیا فانییەن، نەدارۆ بەقا
فائیدەش نەوی، وە « ڕەسوول ئەڵڵا »
وەفات کەرد، رەوضەش جە ئەرضدا قەرار
ئەهل و بەیتیش بی، ئەسیر کوففار

پاشــان، هـاواری لێ هەســتــاوە، پەنـای بۆ بەر پـەروەردگـار بردووە، کـەسێ نەمـاوە، دامـێنـی نەگـرتـبێ، سـوێندی بە « یەزدانـی گـەورە، بە پـەیامـبـەر و یارانـی، هەموو پەیامبەران و پیاوچاکان، حەسەن و حوسێن، جەنگی ئەحەد و حونەین، فاتیـمە و خەدیجـە، غەوسی گـەیلانیی، سی جـزمەی قورئـان، ڕوگەی ئیسـلام و قودس، ڕۆژهـەلات و ڕۆژاوا، تیپی شێـخان و هاوڕێیانی ئەشکەوت، ڕۆژی هەینیی و مـانگی ڕەمـەزان، پێنج فــەرزە و خـدری زیندە، هـەر چوار ئاینزاکەی شافعیی، نەعمان، مالک و ئەحمـەد »، گەلێ ناو و شتی دیکە داوە، کەسێ یا شتێکی پیرۆز نەماوە، دەسی بە دامێنیانەوە نەگرتبێ، لە گۆڕی پڕ لە هێمنی خـۆیاندا، گیـانیانی ڕانەچڵـەکـاندبێ، هەمـوویانی بە گـژ خـودادا کـردووە، تا تکای بۆ بکەن و لە گـوناهـی خـۆشبێ، ڕووی لەو دەروازە گـەورەیە کردووە و گوتوویەتی:

یا ڕەب! بە حاجەت چار یار نەبی
عومەر و عوسمان و بووبەکر و عەلی
یا رەببی! بە حەق جەمع ئەنبیا
بە شەرافەتی سیلک ئەتقیا
بە ویرد و تەوحید، زومرەی ئەصفیا
بە صیدق ئیخلاص، گرۆی ئەولیا
بە شەرافەتی حەسەن و حوسەین
بە جەنگ و غەزای ئوحود و حونەین
بە ئەشک دیدەی، فاطیمەی زەهرا
بە صادق صیدق، خەدیجەی کوبرا
یا ڕەب! بە حاجەت ئەولادەی ڕەسوول
هەفتادودوو تەن، شەهید مەقتوول
یا ڕەب! بە حاجەت ئەو غەوث گەیلان
یا ڕەب! بە حاجەت سی جزمەی قورئان
یا ڕەب! بە حاجەت قیبلەگای لەطیف
بە شەرافەتی قودس شەریف

پاشان، کۆتایی بە « یا ڕەب »ەکەی هێناوە و گوتوویەتی:

یا ڕەب! بە عەدەد ڕەحمەتت تەمام
دروود بەر « محەمەد »، شای « خەیر ئەلئەنام »
ببەخشە گونای، ئەی بەندەی ئەحقەر
« خەلیل » مەخدوم، « خضر منەوەر »

ئیـدی، هـەروا بەو شـێـوەیە، پاڕانەوە دووڕودرێژەکـە خـۆی، بەم دوو دێڕە هۆنراوەیە کۆتایی پێ هێناوە و گوتوویەتی:

هەر کەس ئی کتا،ب جارێ بوانۆ
فاتیحە بە ڕوح، ڕەسوول بکیانۆ
هەزاران درووود، هەزاران سەلام
زما بەر محەمەد، عەلەیهی ئەلسەلام « 42-37،3»

**ستۆکهۆلم**
**1999. 01. 21**

* * *

---

## تێبینی:

ئەم گوتارە، تا ئێستە، دوو جار بلاوکراوەتەوە:
یەکەمین جار: گۆڤاری ئێستا، ژمارە 20، کوردستان ـ سولەیمانیی، 1999.
دووەمین جار: گۆڤاری یارسان، ژمارە1، سوید، 2000.

### سەرچاوەکان:

1. حوسێن محەمەد عەزیز، ڕۆلی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چاپی یەکەم، چاپخانەی میدیا، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1997، ل100.
2. مارتین ڤان برونەسن، ئاغا و شێخ و دەولەت، کوردۆ لە ئالمانییەوە کردوویە بە کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، بنکەی چاپەمەنی ڕۆژ، سوید، 1996، ل 536
3. هەردەوێل کاکەیی، مصطفی نەریمان، شاعیری چەوساوەکان خەلیل منەوەر، چاپی یەکەم، دار الحریە للطباعە، بغداد، 1984، ل 219.

# « مەلای گەورە »
# چەپکێ هەڵوێست و باوەڕ

هۆنەری ناسراوی کورد « مەلای گەورە »، ناوی « مەلا محەمەدی مەلا عەبدوڵلای مەلا ئەسعەد » بووە، لە نێوان ساڵەکانی « **1876- 1943** »ز.دا ژیاوە. بنەماڵەکەیان بە « جەلیزادە » ناویدەرکردووە. مەلایەکی « زانا، دانا، نووسەر و هۆنەر » بووە. خەڵکی زۆر ڕێزیان لێ گرتووە، خۆشیانویستووە، زۆر بە پەرۆشەوە، گوێیان لە ئامۆژگاریی و قسەکانی گرتووە. لە مزگەوت، جگە لە گوتارە ئایینییەکانی، (بابەتی زانیاریی و وێژەیی و کۆمەڵایەتیی بەرفراوانی وای دێنایە پێش، بە تایبەتیی، شێوە شیرینەکەی خۆی، زۆر لە مامۆستا و فەرمانبەر و لاوی خوێندەوار، گەر بەرۆژووش نەبوونایە، تا ئەوەی هەندێ مامۆستای « دیان ـ مەسیحیی » بۆ گوێگرتن و سوودبینین دەچوون. ئاخاوتنەکانی دەربڕینێکبووە، لە هەست و ئاوات و ئامانجیان هانیدەدان، کە پێویستە لە خەوڕاپەڕن و بێنە مەیدانی خەبات و تێکۆشان، تا بگەن بە کاروانی گەلانی ئازاد و پێشکەوتووان. دەیگوت: « بە یەکگرتنێکی پتەوی برایانەی هەموو چین و توێژێکی کۆمەڵ، بە هەوڵ و کردەوەی بەردەوامی دڵسۆزانە دەتوانین، نەتەوەی کوردمان لە ژیانی ژێردەستیی و هەژاریی ڕزگارکەین.»)«**20**»

« مەلای گەورە »، مەلایەکی « کوردپەروەر، ئازا، بە ویژدان و بە هەڵوێست » بووە. داکۆکیی لە هەژاران و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی کردووە.(ڕووی لە کاسبکاران و کرێکاران دەکرد، دەیگوت: « هەمووتان لای یەزدان وەک یەکن. هەقتانە بە خۆتان بنازن، ئیش و کار و ڕەنجی پڕ سوود، مایەی سەربڵندیی و شانازیی یە، تاکوو زیاتر تەکانبدەن و لە ناو کۆمەڵدا، هەست بە کەم نرخی نەکەن.«)«**20**»

هەروەها، خەڵکی بۆ خوێندن و زانست هانداوە، کاتێ خوێندنگەش، لە شارۆچکەی « کۆیە » کراوەتەوە، (ساڵی « 1926 »، نەک کوڕ، بەڵکوو، کچی خۆشی « نەجیبە »ی لەگەڵ کوڕان ناردە قوتابخانە، کە ئەوسا بەڵکوو ئێستاش، کچ ناردن بۆ قوتابخانەی کوڕان، هەنگاوێکی زۆر فیداکارانەیە، بە تایبەتیی بۆ زانایەکی ئاییینی.)«49»

جا گەر، دوو زانای وەک « مەلای گەورە »، بەو شێوەیە و پێش هەموو کەسێ دەسپێشخەریی نەکردایە، هەڵبەتە، ئەوڕۆ ئەو ڕێز و پایەی نەدەبوو، کچانی کوردیش، بەو شێوەیە پێش نەدەکەوتن! هەروەها، داکۆکیی لە مافی ژنان کردووە، ئەمەش، زۆر بە ڕوونیی، لە هۆنراوەی « ئازادبوونی ژن ـ 149 »دا دەردەکەوێ.

« مەلای گەورە »، زۆربەی هۆنراوەکانی، بۆ کێشە و باسی کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی تەرخانکردووە. زۆر بە دەگمەن، هۆنراوەی ڕۆمانسیی گوتووە. لەوانەیە، تەنیا هەر ئەم دوو هۆنراوە ڕۆمانسییەی « تا کەی لە غەمت، بەم حاڵە ژینم مەحاڵە » هۆنیبێتەوە. «176،164»

هەرگیز، بە لای باسکردنی سروشتدا نەچووە. سەیر ئەوەیە، خۆی پیاوێکی ئایینیی بووە، کەچیی، تەنیا یەک هۆنراوەی ئایینیی چییە، نییەتی و لە ستاییشی « یەزدان، پەیامبەر و پیاوچاکان »دا، هیچی نەنووسیوە!

هەرچەندە، خۆی مەلا و زانایەکی گەورەی ئایینیی بووە، بەڵام، هەرگیز باوەڕی بە نووشتە و دەنگۆی پڕوپووچ نەبووە. ئەمەش، لە « فڕی فڕی، قەل فڕی »دا، زۆر بە ئاشکرا دەردەکەوێ، کاتێ بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانەی جوان فەرموویەتی:

( « فڕی فڕی ... بە فکرم هاتەوە ... کەری دەجالی فڕی » کەری وا هۆڕوهۆپ، گوێ ئەوەندە درێژ، حەفتاهەزار جوو لە بن سێبەری گوێی ڕادەوەستێ، شەقاوی لە مەدی نەزەر، بە چل ڕۆژ هەموو دونیا پێ دەگەڕێ، خسووسەن نەڕەدێوێکی وەک دەجالی سواربووە. ئەمما، نازانم، جوولەکەکان کو لەگەڵ ئەم کەرە دەردەچن ...!)«81»

پاشان فەرموویەتی: (پێویستە، مرۆڤ ئاگای لە لاق و دەستی خۆی بێ،، وە ئیللا تێدەکەوێ ... بەڵێ، ئەگەر ئیمڕۆ بڵێین: فڕی فڕی ژیریی فڕی، زانست و زانین لە ناو کوردان فڕی، وایە ... خێرا دەستهەڵبڕە، هیچ ڕامەوەستە، نە زانست، نە ژیریی، نە بیر، نە ڕەخنە و دادگاییکردن، لە ناو موسوڵمانان بە تایبەتیی لە ناو کوردان، ئەوانی سەر بە شێخانن، نەماوە، فڕی، ڕۆشتووە، لام وایە، نایەتەوە.)«83»

هەروەها، زۆر بە توندیی، دژی دواکەوتوویی و دەسبڕینی، هێندێ لە مەلا و شێخەکانی « کوردستان » بووە. بۆیە، چەندین هۆنراوەی وەک: « هەتا شێخێ لە کوردستان بمێنێ ـ**104**، دەڵێن باران بە ئەمری شێخان دەبارێ ـ **117**، ئامۆژگاریی ـ**125**، عیسا لە ئاسمان ـ**148**، تۆی شێخی ـ**154**، تەریق ـ**156**، سوێندت بۆ دەخۆم ـ**157**، جەنابی شێخ ـ**160**، مەمنوونی شێخ ـ **161**، بەسییە بۆ خاتری خوا ـ**166**، تۆ خەلیفەی ـ**167**، شۆڕەژن ـــ **169** »، دژی ئەو جۆرە کەسە دەسبڕ و نەزانانە داناوە، بە ڕاشکاویی، خەڵکی لێ ئاگادارکردوونەتەوە و لێی دوورخستوونەتەوە. بۆ نموونە: لە هۆنراوەی « هەتا شێخێ لە کوردستان بمێنێ »، بە بیست نیوەدێڕ هۆنراوە فەرموویەتی:

هەتا شێخێ لە « کوردستان » بمێنێ
ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ
تەریقی قادریی و نەقشبەندیی
بە بایدا، ڕەونەق و ئاهەنگی کوردیی

پاشان، درێژەی بە هۆنراوەکەی داوە و فەرموویەتی:

بە ڕیشی پان و پرچی پڕ لە ئەسپێ
بناغەی ئیشی کوردان، چۆن دەچەسپێ
بە کەشکۆڵ و سواڵ و فەقر و زیللەت
مەحاڵە کاکی خۆم، تەشکیلی دەوڵەت

دواتریش فەرموویەتی:

لە بەر قەولی پڕوپوچی ئەمانە
لە دەست کوردان، نەما غەیری هەمانە
لە بەر تەزویری وان، شێخانی بەدبەخت
گەلی کورد نابنە ساحێب ڕایەت و تەخت «**106ـ104**»

لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ کۆچیدواییکردووە، خەمێکی زۆر ئەستوور، سەرانسەری « کوردستان »ی مەزنی داگرتووە. چاوی زۆربەی زۆری ڕۆڵەکانی کورد، بۆی گریاوە. چەندین نووسەر و هۆنەری وەک: (بێژەن لە لایەن « ژ.ک. »، پیرەمێردی نەمر، دلزار، محەمەد تۆفیق وردیی، ئەنوەر سەیید ئەحمەد، حاجی میرزا عەبدوللای خادیم، مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا محەمەدی نوور و ... تاد ) گەرمەشینیان بۆ گێڕاوە، هۆنراوەی بەهێزیان بۆ داناوە. بۆ نموونە: « بێژەن » لە « ڕۆژهەلاتی کوردستان »ەوە، بە هۆنراوەیەکی سیوپێنج نیوەدێڕیی گوتوویەتی:

ڕۆحی وەک تەیرێکی قودسیی، هەڵفڕی بۆ نێو بەهەشت
کورد هەموو ڕەشپۆش و گریانە، لە سەر کێوان و دەشت «14»

« ئەنوەر سەیید ئەحمەد »یش گوتوویەتی:
دووبارە، ئەوا لەشکری غەم هێرشی هێنا
تا زەبری دەستی دا نەوەشان، وازی نەهێنا
کوردینە! وەرن، با بگرین، ڕۆژی گرینە
جان و جگەرم، پڕ لە خەم و دەرد و برینە

دواتریش گوتوویەتی:
فەخری هەموو کوردی بوو، جەلیزادە سەراسەر
عالی سیفەت و موحتەرەم و پاک و منەوەر «180»

هەرچەندە، « مەلای گەورە » کەڵەپیاوێکی زیرەک، پاک و دڵسۆز بووە، بەڵام، لەو سەردەمەدا، زۆر سەری لە کاری ڕامیاریی دەر نەچووە. چونکە، لە سەرەتای کاردا، زۆر بە هەڵەدا چووە، باوەڕێکی تەواویی، بە ئینگلیزەکان کردووە، دژی توورکە « عوسمانیی »یەکان، پشتگیریی ئینگلیزی کردووە و هاوکاریی لەگەڵدا کردوون. جگە لەوەی، ستەم و زۆرداریی، توورکەکانی « عوسمانیی » بە چاوی خۆی دیوە، وای زانیوە، لە سایەی ئینگلیزدا، کورد بە ئازادیی و « کوردستان »یش بە سەربەخۆیی دەگا! بۆیە، ئینگلیزەکان ڕێزیان لێ گرتووە. (لە سەردەمی ئینگلیزدا، لە ساڵی « 1919ز. » بوو بە قازیی وە ساڵی « 1924ز. » هەڵبژێررا بە ئەندام لە ئەنجوومەنی دامەزراندنی عێراق.)«8»

هەرچەندە، « مەلای گەورە » یەکێ لە دامەزرێنەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بووە، بەڵام، لەگەڵ ئەوشدا، (کاتی ئەندامێتیی لەو ئەنجوومەنەدا، بە هەموو توانایەکییەوە، ماف و بەرژەوەندیی نەتەوایەتیی کوردی، دلێرانە خستۆتە بەر چاو وە ئەندامێکی کارامە و دیار و لێهاتوو بووە.)«9»

هەروەها، بەشداریی لە دەنگداندا کردووە، دژی توورکەکان خەڵکی هانداوە، دەنگ بۆ « عێراق » بدەن، تا ولایەتی « مووسڵ » بە « عێراق »ەوە ببەسرێتەوە. ئەوە لە کاتێکدا دەبووایە، وەک هاوخوێن و هاوزمانەکانی دیکەی هەر دوو شاری « کەرکووک » و « سولەیمانیی »، هەستە نەتەوەییەکەی پاڵی پێوە بنایە، داوای سەربەخۆیی تەواو و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی، لە « باشووری کوردستان »دا بکردایە!

دەربارەی پێوەندیی « مەلای گەورە » و « شێخ مەحموودی بەرزنجیی » لە لایەک و پێوەندیی نێوان خۆی و « ئینگلیز »ەکان لە لایەکی دیکەوە، لە هێندێ

وتووێژ و دەکومێنتی مێژوویی ئینگلیزەکان خۆیاندا دەردەکەوێ. با بزانین، شێوەی ئەو پێوەندییانە چۆن بوون؟ بەپێی سەرچاوە مێژوویی و هۆنراوەکانی « مەلای گەورە » خۆشی بێ، وا دەردەکەوێ، هیچ جۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ شۆڕشە چەکدارییەکەی « شێخ مەحموودی حەفید »دا نەبووبێ. بەڵام، کاتێ ئینگلیزەکان ویستوویانە، بە خراپ لە سەر « شێخ مەحموود » بدوێن، « مەلای گەورە » داکۆکیی لێ کردووە. ئەمەش، پتر لەو دانیشتنەدا دەردەکەوێ، کە ئینگلیزەکان ڕووی دەمیان، لە « مەلای گەورە » کردووە و گوتوویانە: (تێ ناگەین، « شێخ » لە بەر چی، ئەو هەراوئاژاوە بە خۆڕایی بەرپادەکا؟ « مەلای گەورە »ش دەڵێ: ئەگەر « شێخ مەحموود »، وڵاتی ئێوەی ژێردەستکردبا و تێیدا ڕەزیلبوونایە، ئەوەتان پێ خۆشدەبوو؟ ڕازیدەبوون؟!! شۆڕشتان نەدەکرد؟!! دەڵێن: بەڵێ. دە کەوابوو، « شێخ مەحموود »یش ئەوها.)«25»

سەیر ئەوەیە، لە دەکومێنتێکی ساڵی « 1920 »ی « وەزارەتی هیند »دا، لێپرسراوی ڕامیاریی نێوچەکە، دەربارەی بیر و ڕاکانی « مەلای گەورە »، پیاوە ناودارەکانی « هەولێر » و « کۆیە »، نەک هەر پشتگیریی « شێخ مەحموود » ناکەن، بەڵکوو دژایەتیی « جەنەڕاڵ شەریف پاشا »شیان کردووە و گوتوویانە: (ئەشرافەکان، دژی حاکمی کوردی ڕادەوەستن، وە ناشیانەوێ، چ پەیوەندییان، لەگەڵ شەریف « پاشاکەی ناوبراو »دا ببێ.)«55»

هەروەها، کاتێ باسی دانانی دادوەرێکی کوردیان، لە « کوردستان » کردووە، « مەلای گەورە » بە هیچ جۆرێ، باسی « شێخ مەحموود »ی نەکردووە! پاشان، لێپرسراوی « بریتانیا » گوتوویەتی: (بە هەر بارێک مەلا محەمەد بە تەواوی ڕشتبوو لە سەر ئەو ڕایەی کە دەبێ، حاکمێکی کوردی دابنرێ. لە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە ئەو کێ بۆ ئەو پایە هەڵدەبژێرێ؟ گوتی: لە شوێنی یەکەمدا، یەکێک لە « بنەماڵەی بابان » دەبێ هەڵبژێردرێ و دامەزرێت. چونکە، ئەو خێزانە باشووریە وە ئەو تەقدیری ئەوە دەکات، کە ئەو پایە پیاوی لێوەشاوەی گەرمکە. ڕای وایە، ئەو حاکمە دەبێ، لە « بریتانیا »شەوە پەسەند بکرێ، من بێ گومانم، کە مەلا محەمەد بیر لە « حەمدی بەگی بابان » دەکاتەوە.)«57-58»

هەروەها، لە دەکومێنتێکی دیکەی ڕۆژی « 07 .03 .1920 »دا، دەربارەی دانانی دادوەرێکی کورد گوتوویەتی: (مەلا محەمەد و جەمیل ئاغا، بە توندی ڕایانسپارد، بۆ پێویستی دانانی حاکمێکی کوردی، وە گوتیان: وا دەخوازێ ئەو دانانەش « شکلی »بێ. هەڵبژێراوی ئەم پایەیە دەسەڵاتی ڕاستەقینەی

نەبێ بەڵکوو ئەفسەرانی سیاسی بەریتانی ئەوان حاکمی ڕاستەقینە بن لە کاتێکدا کە وا دەبێ نوێنەری سەرەکی میللەت ئەو حاکمە کوردیەبێ لەوەش زیاتر ئەگەر لە هەر کاتێکا بێ توانایی لەو حاکمە دەرکەوت، دەبێ بگۆڕدرێ بە پیاوێکی لێوەشاوەتر ئەوان قایل نەبوون لە ســـــەر حوکمی پشتاوپشت « وراثی » بەڵکوو لە سەر توانا و تێبووەتی بێ،
« ئەفسەرە سیاسییەکە دەڵێ »: لە مەلا محەمەدم پرسی کەوا ئەو کەسەی لای وایە بۆ ئەو پایە بەرپرسیارە بشێ؟ ئەو وەڵامی دایەوە هەر وەک من چاوەنۆڕم دەکرد « حەمدی بەگی بابان » کە لە ناو کوردەکان زیاتر لە هەموو کەس بۆ ئەو پایە تواناترە.)
پاشان نووسیوێتی: (مەلا محەمەد گوتی: کە حەمدی بەگ پیاوێکی گەلێ دەوڵەمەندە ئەگەر کار پێویستی کرد دەتوانێ بە خۆڕایی « بلا مقابل » خزمەت بکا.)«**59**»
ئەم هەموو دەمەتەقێ، پرسپێکردن و تەگبیرکردنانە، لە کاتێکدا ڕوویداوە، کە « شێخ مەحموود » و لەشکرەکەی، لە جەنگی « دەربەندی بازیان »دا شکاون. « شێخ »یش بە برینداریی گیراوە و ڕەوانەی « هیندستان » کراوە. لە کاتێکدا بووە، کە زۆربەی زۆری کورد، داوای گەڕانەوەی « شێخ مەحموود »یان کردووە. لە کاتێکدا بووە، هێندێ لە هۆنەرە گەورەکانی ئەو سەردەمەی کوردی وەک: « حەمدیی، کەمالیی، شێخ نووریی، بێخوود ... تاد »، هۆنراوەیان بۆ « شێخ » گوتووە. کەچیی، « مەلای گەورە »، لەگەڵ ئەوەشدا، هۆنراوەی بۆ مردنی « سەعد زەغلوول » داناوە! «**146**» نەک هەر هۆنراوەیەکیشی بۆ « شێخ مەحموود » نەگوتووە، بەڵکوو، لە بەر هەر هۆیەکیش بووبێ، پیاوە ناودار و ناسراوەکانی ئەو نیوچەیە، لە سەروو هەمووشیانەوە « مەلای گەورە »، لەبری ئەوەی لە ئینگلیز بگەیەنن، باری نەتەوەیی و ڕامیاریی « کوردستان » ئارام نابێتەوە، گەر « شێخ مەحموود » بەرەڵلا نەکەن، نەگەڕێتەوە و لەگەڵی ڕێک نەکەون، ئەوا بە هیچ شێوەیە، کێشەی کورد لە « باشوور » چارەسەر ناکرێ. بەڵام، ئەوان نەک هەر ئەوەیان داوا نەکردووە، بەڵکوو، بە هیچ شێوەیەکیش باسیان نەکردووە و یەکێکی دیکەیان بۆ شوێنەکەی پێشنیازکردووە! کەچیی، ڕۆژگاریش سەلماندی، هەم ئەو پیاوانە هەڵەبوون، هەم « حەمدیی بەگ » پیاوی ئەوە نەبوو، جێی « شێخ مەحموود » بگرێتەوە، هەم ئینگلیزەکانیش، لە ناچاریی و لە ژێر گوشاری کۆمەڵانی خەڵکی کورددا، « شێخ مەحموود »یان لە « هیندستان » هێنایەوە و زۆر بە ڕێزەوە، کاروباری « کوردستان »یان پێ سپاردەوە!

بەڵام، کاتێ « مەلای گـــــــەورە »، بەرنامە چەوت و درۆکانی ئیمریالیزمی « بریتانیا »ی بۆ دەرکەوتووە، بە تەواویی، لە نیازی ئینگلیزەکان گەیشتووە، ئیدی پەشیمانبۆتەوە. بۆیە، هەستی خۆی بە هۆنراوەیەک دەربڕیوە و فەرموویەتی:

سووری موززەردی چاوشین، نەکەی بە ئومێدی بی
ئەوەل بە قووەتی خۆت، دووەم بە عەونی ڕەبی
عیلم و عەمەل خۆیەتی، جەهل و تەمبەڵی مەرگە
پۆست و زەرگان فرێدەن، وەعدەی تۆپ و تفەنگە «143-142»

هەروەها، « مەلای گەورە » لەگەڵ شا « فەیسەڵی یەکەم »یشدا، پێوەندییەکی باشی هەبووە. زۆر ڕێزی لە پایەی « ئایینیی، کۆمەلایەتیی و زیرەکیی » گرتووە. گوایە ویستوویەتی، لە سەر دەسی « مەلای گەورە »دا، فێری عەرەبییەکی باش ببێ و زانیاریی ئایینیی خۆی پترکا! بۆیە، کاتێ سەردانی کردووە، شا « فەیسەڵ » گوتوویەتی: (« دەمەوێ، زانیاریی خۆم لە ئایین و زمانی عەرەبییدا، لای بەڕێزتان تەواوکەم. » ئیتر، هەر لەو دیتنەدا بڕیار دەدرێ، کە لە هاوینی داهاتوودا، سێ مانگ بێتە « کۆیە ».)«26»

هەڵبەتە، وا پێویستیکردووە، شوێنی حەوانەوە و خوێندنی تایبەتیی، بۆ ئامادەکرێ، تا شیاوی حەوانەوە و خوێندنی شایانە بێ! بۆیە (شا« فەیسەڵ » چەند هەزار ڕووپیەکی نارد، ئەو شوێنەی پێ دروست بکرێ)«26»

بەڵێ، ئەو خوێندنگەیە، ساڵی « **1925** » لە مزگەوتی « مەلا ئەسعەد » دامەزرا و تەواوییشبوو. کەچیی، (مەلیک « فەیسەڵ » لە بەر ئەرکی سیاسی و کاروباری دەوڵەتی نەیتوانی بێت بۆ کۆیە، زیاتریش گیروگرفتی« استیفتای ویلایەتی موسڵ »، دەرفەتی نەدا نامەیەکی عوزرخوای و کۆمەڵێک کتێبی بە دیاری نارد بۆ مەلای گەورە لەگەڵ ئەوەشـــــدا مەلای گەورە بە نەهاتنی مەلیک دڵگیر دەبێ.)«26»

ئەم هەواڵەی لێرەدا، نووسەر باسیکردووە، قسەیەکی « سەددام حوسێن »م بیردەخاتەوە، کاتێ گوتی: « دەبێ، لە ماوەی شەش مانگدا، فێری زمانی کوردیی بم. » سەیر ئەوەیە، سەرانی داگیرکەران، هەر کاتێ توانایان نەبوو بێ، یا بارەکە لەبار نەبووبێ، یا پێویستی نەکردبێ، بە چەک و کوشتنوبڕین، کێشەکان بەلادائەن، گەر کارێکیان بە کورد هەبووبێ، ئەوا، دەمی پیاوە گەورەکانی کوردیان چەورکردووە، یا، پیاوە ناودارەکانی کوردیان، بە ناوی ئایین و بەڵێنی درۆوە هەڵخەڵەتاندووە! بۆیە، شا « فەیسەڵ » هەر لە خۆیەوە، ئەو قسانەی نەکردووە. بەڵکوو، هەر لە سەرەتاوە بڕیاریداوە، سەردانی

شارۆچکەی « کۆیە » نەکا و پارەکەشی بۆ بنێرێ، تا لە نیازپاکیی ئەو دڵنیابن. بەڵام، ئایا ئەوە بە بیری کێدا دێ، شای دەوڵەتێکی وەک: « عێراق »، بەو هەموو دەسەڵات و گەورەییەوە، ڕوو لە کوێرە شـــــارۆچکەیەکی وەک: « کۆیە » بکا، تا لە سەر دەستی مەلایەکی کوردی وەک « مەلای گەورە »دا، زانیاریی خۆی لە زمانی عەرەبیی و ئاییندا پەرەپێبدا؟! بۆچیی، لە « بەغدا » یا لە نێو هەموو گەلی عەرەبی « عێراق »دا، پیاوێ، مامۆستایە یا مەلایەکی وای تێدا نەبووە، تا زمانی عەرەبیی بزانێ و لە بنچینەکانی ئایینی ئیسلام شارەزابێ؟!! ئەمە گەر شتێ بگەیەنێ، تەنیا هەر ئەوەیە، نووسەرانی کورد، زۆر خۆشباوەڕن، ئەو قسە و ڕووداوانە، بە شانازییەوە دەگێڕنەوە و تۆماری دەکەن. چونکە، لەو ڕۆژەوە دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دامەزراوە، گەر لاپەڕەکانی مێژووی گفت و بەڵێنەکانی، سەرانی ئەو دەوڵەتە بۆ کورد هەڵدەینەوە، بە هەزاران پەیمانی دەمیی و تۆمارکراو دەبینین، کە هەر هەموویان، لە درۆ و هەڵخەڵەتاندن بەولاوە، هیچی دیکە نەبوون و نین! ڕاستییەکەی ئەوە بووە، شا « فەیسەڵ » تەنیا قسەی هەڵڕشتووە، ئەگینا، هەر باوەڕیشی بە ئایین نەبووە!
هەرچەندە، « مەلای گەورە » وەک خۆی و وەک بنەماڵەکەی، لە ڕووی « ئایین، دەسەڵات، زمان، وێژە و نیشتمانپەروەریی »یەوە، لە نێو خەڵکی نێوچەکە و هەموو « کوردستان »یشدا، ناو و ناوبانگ، ڕێزێکی تایبەتییان هەبووە. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو هەموو ڕێزەی شا « فەیسەڵ » لەوی گرتووە، هێندەی دیکە، لە نێو تیرە و هۆز و کۆمەڵانی خەڵکی کورددا، ڕێزی پتر و پلەوپایەی بەهێزتر کردووە. شا « فەیسەڵ »یش، ئەم کارەی بۆیە کردووە، چونکە، پێویستی بە ناو و ناوبانگ و دەنگی ئەو هەبووە. مەبەسیشی، تەنیا ئەوەبووە، سەرنجی بە لای خۆیدا ڕاکێشێ، لە ڕێی « مەلا »شەوە، زۆربەی دەنگی کوردەکانی نێوچەی « کۆیە » و « هەولێر » مسۆگەرکا، تا لە کاتی پرۆسێسی دەنگداندا « ڕیفراندۆم »، سەرانی تیرە و هۆزەکانی بۆ قایلکا و وا لە خەڵکی بکا، دەنگ بۆ « عێراق » بدەن! بەڵام، « مەلای گەورە » و دەوروبەرەکەی، هێندە لە کاری ڕامیارییدا، وریا و زیرەک نەبوون، تا هەست بەو پلانەی شا « فەیسەڵ » بکەن. بەڵکوو، شا « فەیسەڵ » لە ژێر پەردەی ئاییندا توانیوێتی، هەڵیانخەڵەتێنێ و ئامانجەکانی خۆی بەدیبێنێ!
لەبەرئەوە، چ « شا فەیسەڵ » و چ « مەلای گەورە »ش، هەر دووکیان کەڵکیان لە یەکدی وەرگرتووە! کەواتە دەتوانم، بڵێم: « مەلای گەورە » دەستێکی باڵای، لە یەکلاکردنەوەی پرۆسێسی دەنگدانەکەدا هەبووە، کارێکی زۆری، لە خەڵکی

نێـوچەکـە کـردووە، تا ویلایـەتی « مـووسڵ »، بـە « عـێـراقی عـەرەبیی »یەوە گرێدەن!
وا پێدەچێ، ئەوەی لەو کاتانەدا، بە بیری « مەلای گەورە »دا نەهاتبێ، کێشە رەواکەی کورد بووە! چونکە، ئەو کـاتەی شا « فـەیسـەڵ » لە « هـەولێر » بووە. « مـەلای گـەورە » خـۆی لەوێ بووە، قـسـەکـانی لە عـەرەبییـیـەوە، بۆ خـەڵکی کردووە بە کوردیی.
جگە لەوەش، خـۆشی پتـر، جـەخـتی لە سـەر رۆڵی ئیسـلام کـردووە، بە هیچ جـۆرێکیش، باسی مـافـەکـانی کوردی نەکـردووە. بەڵگەشمـان بۆ ئەمـە، لەو گفـتوگـۆیەی نێوان « سـەبیح نەشئـەت » و « مەلای گـەورە »دا دەردەکەوێ.
کاتێ، (صەبیح نەشئەت کە وەزیرێکی کورد بوو دێتە لای و پێی دەڵێ: قوربان لەم بارەدا هەرچی بفەرمووی جێبەجێدەکرێ، فرسـەتیش هەمـوو جاران ناگەڕێتـەوە، چ ئارەزوویەکت هەیە مەلیک بۆتی رەوادەبینێ، مـەلای گەورە پێی دەڵێتـەوە: صـەبیـح من لەگـەڵ خـستنە سـەر موسـڵم بۆ عێـراق. لە باوەڕەوە دەدوێم، رای خـۆشم بە پارەی هەمـوو دونیا نافرۆشم، ئاخۆ دەبێ من تەمـا و ئارەزووی چیم هـەبێ؟ ئەگـــەر لە دوارۆژدا بەپێی هـەڵکەوتی زەمـــانـە مراجـەعەیەکی حوکوومـەتم کرد لەو مـەسڵـەحەتەی هەیتم وا دەزانم، پێویست نییە گومـان بەرم بۆ ئەوەی لەم پەڕی دەخـرێتە بەر چاو. صـەبیح نەشئـەت چەندێکی پێ دادەگرێ لە سەر هێندێ کە مەلای گەورە تەکلیفێک بخاتەڕوو بەڵام مەلای گەورە نایسەلمێنێ.)«**27-28**»
هەڵبەتە، گومانی تێدا نییە، « مەلای گـەورە » لەوە گەورەتر بووە، داوای پارە، یا دەسکەوتێکی دیکەی تایبـەتیی، بـۆ خـۆی بکا. بەڵام، ئایا بـۆچیی بە هـیچ جـۆرێ، داوای مـافـەکـانی کـوردی نەکـردووە؟!! خـۆ مـەرج نییـە، « سـەبیح نەشئەت » تەنیا مەبەستی هەر پارە یا پلەوپایە بووبێ! بەڵام دوور نییە، وەک شالیارێکی کورد، هەر هێندەی توانیبێ، بە « مەلای گەورە » بڵێ!
یا، « مـەلای گـەورە » وایزانیـبێ، هـەر کاتێ کـێشـەی ویلایەتی « مـووسڵ » چارەسـەرکرا، لە تووركـەکـانیـان سـەندەوە و بە « عـێراق »یانـەوە لکان، ئەو کاتە، کێشەی کوردیش، زۆر بە ئاسانیی چارەسـەردەکرێ. واتە: گـەر بەپێتی ئەم کردارانە، کێشەکانی لە بیری خۆیدا ڕیزکردبێ: « هیچ، گرنگ، گرنگتر و گرنگترین » لە پێشدا، « مـەلای گەورە » کێشـەی ویلایەتی « مویسڵ »ی، بە پلەی « گـرنگـترین » داناوە. پاشـان، بیـری لە کـێشـەی کـورد « گـرنگـتـر » کـردۆتەوە. لە دواییشـدا، نەک هـەر « گـرنگـتـر و گـرنگ »ەکـەی لەدەسچـووە، بەڵکوو، « هیچ »یشی دەس نەکەوتووە!

جگە لەوەی، کاتێ ساڵی « 1926ز. »، کۆمیتەیەک لە « کۆمەڵەی نەتەوەکان » سازکراوە و ڕووی لە شاری « هەولێر » کردووە، بۆ ئەوەی، پرس بە خەڵکی بکەن و ڕایان وەرگرن: ئایا، ویلایەتی « مووسڵ »، لەگەڵ « توورکیا »دا بمێنێتەوە، یا بخرێتە سەر « عێراق »؟ بۆ ئەم مەبەستەش، پتر ڕای پیاوە ناسراو و زاناکانی کوردیان وەرگرتووە. سەرۆکی کۆمیتەکە، ڕووی لە « مەلای گەورە » کردووە و لەو بارەیەوە لێی پرسیوە. « مەلای گەورە »ش، لە بری ئەوەی، باسی مافەکانی گەلی کورد بکا، گوتوویەتی: (ئێمە، بەرژەوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتیمان لەگەڵ برای عەرەب لە عێراقدا بە تینترە، ئێمە بە برایەتیەکی هاوتایی لەگەڵ ئەوانمان پێ خۆشترە، بژین.)«30»

ئەمە خۆی لە خۆیدا، لە لایەکەوە، لاوازیی هەستی نەتەوەیی کورد پیشاندەدا. لە لایەکی دیکەشەوە، نیشانەی ئەوەیە، کورد خۆی هیچ کاتێ، یەکڕەنگ و یەکدەنگ نەبووە، یەکگرتوو نەبووە. « کوردستان » لە ژێر باری دواکەوتووی سیستێمی بنەماڵە و خێڵەکییدا ناڵاندوێتی. هەر نێوچەیەک بۆ خۆی سەربەخۆ بووە، بە دەس تیرە و هۆزێکەوە بووە. هەر کۆمەڵێکیش لە ئاوازێکی تایبەتیی خوێندووە. هەر هەمووشیان، بەپێی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان، دەنگیان هەڵبڕیوە و ڕەفتاریاننواندووە. واتە: کورد خۆی هیچ نەبووە! بۆیە، لێپرسراوانی « بریتانیا » و عەرەبەکان، زۆر بە ئاسانیی توانیویانە، « باشووری کوردستان »، بە « عێراقی عەرەبیی »یەوە جوتباقەکەن. ئەوە لە کاتێکدا بووە، زۆربەی زۆری گەل و نەتەوەکانی نێوچەکە و جیهان، بە مافە ڕەواکانی خۆیان گەیشتوون و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان دامەزراندووە!

لەگەڵ هەموو ئەو ڕاستییانەشدا، « مەلای گەورە »، بە یەکێ لە پیاوە هەرە ڕووناکبیر و مەزنەکانی سەردەمی خۆی دەژمێررێ. هەستێکی خاوێنی نیشتمانپەروەریی ساکاری خۆڕسکیی، لە ناخی دڵ و دەروونیدا، ڕەگی قووڵی داکوتابوو. پتر لە ژێر کارتێکردنی، بیر و بۆچوونی ڕێبازی « حاجی قادری کۆیی » نەمردا بووە. بیر و ڕاکانی خۆی، لە چوارچێوەی هۆنراوە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانیدا دارشتووە. بۆیە، جگە لەو هۆنراوانەی بە تایبەتیی، بۆ کوردی نووسیوە و مۆرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانییان پێوە دیارە، لە هەموو هۆنراوەکانی دیکەشیدا، شوێنپەنجەی ئەو دید و بۆچوونەی، بە ئاشکرا پێوە دیارە. لە هەر بابەتێکی ژیانی کۆمەڵگەی کورد دوابێ، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ڕەگی بنچینەیی گرفتەکەی، بۆ دواکەوتوویی و بندەسیی کورد گێڕاوەتەوە. لەبەرئەوە، زۆر بایەخی بە هۆنراوەی نەتەوەیی داوە. گەلێ هۆنراوەی نیشتمانیی وەک: « من یەخەی خۆم لە بۆیە دائەڕم، لایەلایە،

ئاهوناڵە، ئەگەر عیزت دەوێ، ئاواتی دوارۆژ، ئەم میللەتە، منیش هەر وەکوو غاندیی، بە تەما نیم لە میللەتی کورد، هەناسەی نەوتاویی، ژیانی وا بە ئالا، ئەم خاکە، ئێمە کوردین، لە بەینی تورک و ئێران ... » هۆنیوەتەوە.
« مەلای گەورە »، وەک زۆربەی زۆری، هۆنەرە نیشتمانپەروەرەکانی پێش خۆی، بە شێوەیەکی زۆر چاک لەوە گەیشتووە، یەکێ لە هۆ هەرە گرنگەکانی دواکەوتوویی و بندەسیی نەتەوەی کورد، بۆ « ناکۆکیی، دووبەرەکیی، جەنگی نێوخۆ، نۆکەریی و ناپاکیی » دەگەڕێتەوە. بۆیە، لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا، جەختی لە سەر یەکێتیی و برایەتیی کورد و کورد کردووە. بەشی زۆری هۆنراوەکانی، بۆنی هەستێکی پیرۆز و نیشتمانپەروەرییەکی بێ گەردیان لێ دێ، لە کزەی جەرگێکی هەڵقرچاوەوە هەڵقووڵاون، بە دەنگێکی نزم و لەرزۆکەوە، هاواری لە کوردان کردووە، واز لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی بێنن، بۆ خۆیان بژین، هەوڵ بۆ ئازادیی و سەربەخۆیی بدەن.
بۆ نموونە: بە بۆنەی لە سێدارەدانی سەرکردەکانی شۆڕشی « باکووری کوردستان »ەوە، ساڵی « **1926** »، هۆنراوەی « من یەخەی خۆم لە بۆیە دائەدڕم »ی، بە بیستوحەوت دێڕە هۆنراوە هۆنیوەتەوە. هۆنەر، دەردی دڵی خۆی هەڵڕشتووە و گوتوویەتی:

من یەخەی خۆم، لە بۆیە دادەدڕم
ئێوە نابن بە هیچ و من دەمرم
دەبێ، من کەیفی چیم بە دونیا بێ
قەومی من، وا ڕەزیل و ڕیسوا بێ
بێ کەس و بێ دەر و فەقیر و هەژار
بێ سەر و سەرفراز و بێ سەردار
ئەوی ڕێگای لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خوا، لە ئەلحەد و گۆڕی
میللەتی وا فەقیر و بەستەزمان
بە قسەی ئەو کەسانە، چۆن هەڵخەڵەتان
قوڕی کام جێ، بگرمەوە بۆتان
بۆ برایانی « جەزیر » و « بۆتان »
خمی دونیا بکەین بە سەر خۆمان
بۆ عەزیزانی « ئەرزەڕۆم » و « وان »
ناوی کوردیی نەما، لە نێو تورکان
پەتی تورکان و گەردنی کوردان

ئێوە هەرچەندە، قەومێکی زۆرن
فائیدەی چی، کە توخمی خۆخۆرن
وا دەزانن، کە کوردەگەل زیندوون
وا دەبینم، عەلەلعموم مردوون
وا ڕەزیل و زەبوون و بێ دەسەڵات
ڕەبی ئەو قەومە، بۆچی وای لێهات
زۆر نەچوو، پاش « سەلاح »ی ئەیوبیی
قەومی کورد، کەوتە دەوری مەنکووبیی
چ عەشیرەت و چ ئەهلی شارستان
لە هەموو تول و عەرزی « کوردستان »
بوونە یەخسیر و نۆکەری ئەم و ئەو
باری خەڵکی دەبەن، بە ڕۆژ و بە شەو
لە سەر ئەو حاڵەش، یەکتری دەکوژن
خوێنی یەکدی، میسالی شیر دەمژن
دەرحەق یەک، ئەوەندە زۆر دەوەرن
کەلەکەی یەک، بە شیری دەم دەبڕن
بە زگێ تێر و بە دوو زگان برسی
هیچ لە چاکە و خراپە ناپرسی
جاهیل و بێ کەمال و شەرمی حزور
« ئەبغەض » خەڵقی خوا، فەقیر و فەخور
حەیفە بۆ غیرەتی « سەلاحەدین »
ئەو کەسانە بڵێن: ئەمەش کوردین
وا مەزانن، کە میللەتی کوردی
بە زەلیلی بژیت و نامەردی
ئەوی کورد بێ، لە نەسلی باب « ئادەم »
ئیشەکی تورک و گوێدرێژی عەجەم
حەزدەکەی، پێت بڵێم، چییە کورد
عاقڵیی و چاپوکیی و جەوانمەردیی
میللەتێکە، لە فەوقی تورک و عەجەم
ساحێبی حەزم و ڕەزم و بەزم و کەرەم
لاوەکان، قەدری ئەسڵی خۆ دەگرن
پیرەکان، با لە زیللەتا بمرن

خاسەنەو باوەکانی مەکتەبی کۆ
دەبنە پشت و پەناهی میللەتی خۆ
ئێوە، ئەولاد و جەرگ و ناوی منن
ئێوە، نووری گلێنەی چاوی منن
عومری خۆتان، مەبەن بە خۆڕایی
تێبکۆشن، بە عیلم و ئازایی «97- 99»

هەروەها، لە هۆنراوەی « ئاهوناڵە »دا، خەم و پەژارەی خۆی، بەرانبەر نەزانین، نەخوێنەواریی و ڕەوشتی خراپی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی دەربڕیوە و بە بە بیستویەک دێڕە هۆنراوەی گوتوویەتی:

هەتا دەمرم، لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم، هاوار بە ماڵم
بە زۆریی جاهیل و نەخوێندەوارن
لە لای نەوعی بەشەر، بێ قەدر و خوارن
کەسێ قەدری، لە لای خزمان نەمێنێ
لە لای بێگانە، قەدری چی دەمێنێ
لەگەڵ یەک، بەدڕەوشت و بەدنیهادن
لە بۆیە وا، کەساد و بێ مرادن
لە عیلم و مەعریفەت، دوورن بە کوللیی
خەیاڵی خاوە، لایان فکری میللیی
حەسودن، بۆیە بازاڕیان کەسادە
نەزانن، بۆیە تاعەتیان فەسادە «101»

دیسانەوە، لە هۆنراوەی « ئەگەر عیزت دەوێ »دا، باسی یەکێتیی و تەبایی ڕیزەکانی کوردی کردووە و بە پەنجا دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەگەر عیزت دەوێ، هەستی بە هیممەت
بە فکر و سەبر و تەدبیر و کیاسەت
ئەبێ، میللەت هەموو یەکبن، لەگەڵ یەک
لە ئەربابی قەڵەم، تا خاوەنی چەک
ئەگەر کوردێک، ئیهانەتکەن، لە « بەسرە »
هەموو بێنە خرۆش و جۆش و نەعرە
هەتا حەقی نەسێنن، ڕا نەوەستن
لە بەر بێ ئیتیفاقیی، خوار و پەستن
پاشان فەرموویەتی:

فرێیدەن « منتشا » و بەرماڵ و کەشکۆڵ «1»
تەرککەن، تەپڵ و ڕەقس و خدمەت و شۆڵ
وەکوو شێر، وەرنە مەیدانی جەرائەت
بە غیرەتبن، بە غیرەتبن، بە غیرەت
تفەنگ و تۆپ و تەیارە پەیاکەن
بە عیزی دین و دونیا، ڕوو لە خوا کەن
دواتریش فەرموویەتی:
وولاتێکتان هەیە، پڕ کان و مەعدەن
بە بێڵ و پێمەڕە، دوو قولتی لێدەن
دەزانن، ناوی ئەرزی چی تێدایە
وەلێ، مەوقوفی عیلمی کیمیایە
هەتا ئەو عیلمە، زۆر چاک نەخوێنن
دەبێ، هەر پاقلە و سلقێ بچێنن
مەلای نادان، بە عینوانی شەریعەت
حەرامیکرد لە تۆ، عیلمی تەبیعەت
لە بۆیە، هەرچی لەو خاکە بە دەرکەوێ
لە ڕادیۆم و لە زێڕ و باقر و نەوت
هەمووی کەوتۆتە ژێردەستی فەرەنگان
چیا و چۆلان دەنۆرن، وەک پڵینگان
تەماشاکەن، چیایان چۆن دەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە، هەر بەرماڵ بە کۆڵن
خوریی و مازیی و کەتیرە و چەوت و گروان
وەکوو سیچکە و گلێخە و ڕۆنی قەزوان
دەخیلوبم، نەکەن، بیدەن لە دەست خۆ
وە ئیللا وا بزانن، ڕۆح و دەرچوو
هەتاکوو نەبنە خاوەندی سەنائیع
هەموو ئینعامی خوا دەڕوا بە زایع
لە کۆتاییشدا، ڕووی لە ڕۆڵەکانی کورد کردووە و فەرموویەتی:
گرینی من لە بۆ تۆیە، وە ئیللا
تەماعم پێت نییە، حاشا وەکەللا
ئەتۆ چۆنێ بژی، من هەر مەلامە
ئیتر بەسییە برام، خەتمی کەلامە «112-107»

لە هۆنراوەی « منیش هەر وەکوو غاندیی »دا، جارێکی دیکەش، لە ناکۆکیی و دووبەرەکیی دواوە و بە چواردە دێڕە هۆنراوە فەرموویەتی:

منیش هەر وەکوو « غاندیی »
هەناسە سارد و ماندیی
لە قەومی کورد و هیندیی
هەرچی خێر بوو، نەماندی
چەندی لە قەومی کوردیی
تێدەفکرم، بە وردیی
بە هیچ وەجهێکی نەمدی
ئاساری ئیتیحادیی
قەومێکی وا لە یەک دوور
بێ ڕابیتە و بێ شعوور
تاڵ و تیژ و تفت و سوور
خۆبەخۆیی ئەعادی
نەبوون و نینە و نابن
مەگەر « جاوەیی » وا بن «129»

لە هۆنراوەی « بە تەما نیم لە میللەتی کوردی »یدا، هەر دەڵێی، پێش شەست حەفتا ساڵ لەمەوبەر، پێشبینی ئەوڕۆی « کوردستان »ی گەورە بە گشتیی و « باشوور »ی بەتایبەتیی کردووە. خەسڵەتەکانی کورد و سەرکردەکانی باش ناسیوە. بۆیە، بە بیستویەک دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

بە تەما نیم، لە میللەتی کوردی
لە سەر ئەم ئەرزە، پاشی چەندی دی
کەسەکی وا، ببێتە ساحێبی ناو
خاوەنی ئیعتیبار و ئاو و بەراو
وەک تەفەکور دەکەم، لە فکری وان
هەر لە « کۆ »وە، هەتاکوو « مووش » و « وان »
بە تەمامی دەڵێی، هەموو مردوون
پاک لە خاکی مەزە، لە تاروو چوون
هەموو بەدخواه و دوژمنی یەکدین
با وجودی کە قەومەکن یەک دین
ڕوئەسایان، بە کوللیی بێ عیلمن
دز و قولاپ و بێ حەیا و شەرمن

عولەماكانیان، هەر دەڵێی وەحشین
شێخەكانیان، بە حیلە وەک ڕێوین
پاک لەگەڵ یەكتری، لە دڵ پیسن
بە فرۆفێڵ و كەید و تەلبیسن
عەرەب و تورک و دەوڵەتی « ئێران »
دابەشیانكرد، وولاتی كوردان
كوردی بێ تالع و فەقیر و ڕەزیل
دەربەدەربوون، سەفیل و خوار و زەلیل
ساحێبی موڵک و ماڵی خۆ نینە
قوڕ بە سەر، كاسەلێسی خەڵكینە
دواتریش، توانج و پلاری، لەو كوردانە گرتووە، كە پۆستی بەرزی دەوڵەتیان هەبووە. چونكە، هیچیان بۆ كورد نەكردووە، بۆیە فەرموویەتی:
نائیبی چی ...! وەزیری چی ...! هەیهات!
ئاو و عەردمان، هەموو لە دەست دەرهات
لە سەر ئەم زیللەتەش، جەنابی شێخ
دەگەڕێتن، بە تەپڵ و دومبک و مێخ
دەعوەتی خەڵک ئەكا، لە بۆ تۆبە
دڵی پڕ ئاگرە، وەكوو سۆبە «130-131»
لە هۆنراوەی « هەناسەی نەوتاویی »دا، زۆر بە ڕاشكاویی، باسێكی خاكی « كوردستان »، كانەكانی ژێر زەویی، چاوچنۆكیی دەوڵەتە زلهێزەكانی جیهان، دابەشكردنی نیشتمان، نەوت، بایەخی خاک و خۆڵی نیشتمانەكەی خۆمانی بۆ كردووین و بە چلوهەشت دێڕە هۆنراوە فەرموویەتی:
یا ڕەبی! بە لوتف و جود و ئیحسان
لوتفێكی بكەی، لە حەقی كوردان
قەومێكی فەقیر و ناتەوانا
بێ پەروەر و بێ پیاوی زانا
پاشان، باسی دەوڵەمەندیی خاكی « كوردستان »ی كردووە و گوتوویەتی:
خاكێكی هەیە، وولاتی كوردی
ئیكسیرە، وەلێ لە چنگی مردی
خاكێكی ئەوەندە پاک و ڕەنگین
قەومێكی ئەوەندە فەقیر و بێ تین
ئەی كاكی نەفامی گەوجی ملهوڕ!

بنوارە، لە دەوری « بابەگوڕگوڕ »
ئەو قووەتە چی بوو، چۆن بە دەرکەوت
چۆن هەر دەکوڵێ، مەنابیعی نەوت
ئەو نەوتە بوو، ئاگری هەڵایساند
چەند دەوڵەت و تاج و تەختی فەوتاند
بۆ ئەو نەوتە بوو، کە چواردە میلیۆن
عەسکەر لە « فەڕەنگ » و نەسلی مەیموون
بۆی هاتە نزاع و حەرب و کوشتن
تاکوو بە مەرامی خۆ گەیشتن
ئەو نەوتە چ بوو .... حەیاتی تۆ بوو
وەی خۆڵ بە سەر، ئەویش ئەوا چوو
ئەی کوردی نەفامی خانەوێران
وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران
ئێستێکە، گەلێ مەعادنی دی
پەنهانە، لە ئەندەروونی عاردی
وەک مەعدەنی زێڕ و زیو و سەردەف
تۆش لێدە لە تەپڵ و دنبک و دەف
دواتریش، باسی پارچەپارچەبوونی نەتەوەی کوردی کردووە، زۆر شانازیی بە خاکی « کوردستان »مکەی خۆیەوە کردووە و فەرموویەتی:
ئەم میللەتە گەورە و عەزیمە
سێ پارچەکراوە، بۆتە قیمە
قسمێکی لە جەوری تورکی غەدار
هاواری دەکاتە، چەرخی دەوار
قسمێکی لە ژێری نیری « ئێران »
سووتاوە هەناوی، بۆتە بریان
قسمێکی لە ترسی سووری چاوشین «2»
کەوتۆتە لیباسی ماتەم و شین
دەوجا، وەرە سەیری ئەم حیسابە
ئەم « لالە »، چلۆن دەبێتە « یابە »
ئەم موڵکە بە قیمەت و وەسیعە
بۆچی دەدرێ بە کاکی « شیعە »
قوڵتێکی لە دەوری « بابەگوڕگوڕ »

نایدەم بە منارەکەی ئیمامی دور
بستێ لە وولات و موڵکی کوردیی
نایدەم بە مەرقەدی « سەهرەوەردیی » «3»
دواتریش، باسی باری نالەباری کوردی کردووە و فەرموویەتی:
هەر وەختە لە داخی ئێوە بمرم
ڕۆییوە، قەرار و هۆش و سەبرم
چ بکەم؟ چ بڵێم، لە تاوی کوردان؟
ئاگر دەگرێ، دڵم لە دەردان
چارەی چییە، خوایە تۆ دەزانی؟
خۆت عالمی زاهیر و نیهانی
ئەو زوڵمە، قەبوڵ نەکەی خودایە
ئەسڵەن، ئەمەلم بە کەس نەمایە
لوتفی تووە، مەلجەء و پەناهم
ڕەحمێکی بە کورد بکەی، ئیلاهم
وەک دێتە دڵم، خەیاڵی نەوتێ
هەندە نامێنێ، جەرگم بسووتێ
قەومێ، کە فەقیر و ناتەوان بێ
قەومێ، کە زەلیل و بێ زوبان بێ
ئەڵبەتە، خراتری بە سەر دێ
جێی ناکەنەوە، لە شار و دێ
وەک بزنی گڕو دەبێ، دەریکەن
نابێ، تخونی بێر و مەڕی کەن
تا ئێوە لە حەق ئێکدی خرابن
بەدخواه و حەسوود و ناتەبابن
تا ئێوە، لە هەق ئێکدی بە کەیدەن
هەر ژێر چەپەلۆکی عەمر و زەیدن «134- 139»
لە هۆنراوەی « ئەم خاکە »دا، بە سی دێڕەهۆنراوە، لە گەلێ باسی گرنگی وەک: داگیرکردنی « کوردستان » و بەعەرەبکردن دواو. سەرەتا فەرموویەتی:
ئەم خاکە، دایکی تۆیە، کەوتە دەستی ئەجنەبی
ئەی کوردی ساحێب غیرەت! تۆ چلۆن ڕازی دەبی
بۆ خۆت ئەوا دەبینی، دوژمن ئەرزت دەکێڵێ
پاش چەند ساڵێکی دی، هیچت بە دەست ناهێڵێ

دوایی، باسی هێندێ سەرکردەی وەک: « ڕەزاخانی پەهلەویی ئێران، مستەفا کەمالی تورکیا، شا فەیسەڵی عێراق، بەچەسەقاوی ئەفگانستان »ی کردووە، کە چۆن دەسیان بە سەر کار و باری ڕامیاریی و دەوڵەتدا گرتووە، کوردیش لەو ناوەدا، لە کاروان بەجێماوە و فەرموویەتی:

ئێوەش ئەگەر پیاو بان، چشتەکو لە دەست دەهات
کەسێ غیرەت بنوێنێ، خودا تەوفیقی دەدات
ئێوە « ئەحقەر ئەلناس »ن، ئیمڕۆ لە بەینی ئومەم
قسمێ بەندی تورکن، هێندێ خادمی عەجەم
ئێوەن بێ قەدر و قیمەت، بێ عەسکەر و بێ عەلەم
بێ تاج و تەخت و دەوڵەت، ژێردەستی کوللی عالەم
چونکە نانخۆری خەڵکی، لە سەر موڵک و ماڵی خۆت
خاکت هەموو مەعدەنە، خۆت فەقیر و ڕووتوقووت
تا کەی وەکوو گا، جووتی لە ژێر نیری زیللەتی
سەد حەیف و سەد مخابن، لای خۆت ئەتۆش میللەتی

دوای ئەوەی، باسی داگیرکەری ئینگلیزیشی کردووە، داوای لە ڕۆڵەکانی کورد کردووە، هەر هیچ نەبێ، منداڵەکانیان بە شیری کوردایەتیی بەخێوکەن و بە هەستی نیشتمانپەروەریی پەروەردەیانکەن. بۆیە فەرموویەتی:

دەماغی مناڵەکان پڕکەن، لە حوبی وەتەن
تەربیەتیان باش بدەن، مىللییەتیان فێربکەن «**142- 145**»

« مەلای گەورە »، لەگەڵ ئەو هەموو هەستە خاوێن و بەرزە نەتەوەییەی هەیبووە، لەگەڵ ئەو هەموو هۆنراوە جوان و نیشتمانییانەی دایناون، هێشتا زۆر بایەخی بە بزووتنەوەی ڕامیاریی و چەکداریی نەتەوەکەی نەداوە. چونکە، چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشی خوێناویی و جەنگی قارەمانانە، لە میانەی هێزەکانی کورد بە سەرکردایەتیی « شێخ مەحموود » و سوپای ئینگلیز و لەشکری دەوڵەتی « عێراق »دا ڕوویداوە، کەچیی، لەو بارەیەوە، دەنگی لێوە نەهاتووە! لە کاتێکدا، هەموومان دەزانین، کەم هۆنەری کورد هەیە، لەو سەردەمەدا ژیابێ، شیوەنی بۆ شەهیدانی ڕۆژی ڕەشی « شەشی سێپتێمبەری **1930** » نەکردبێ. کەم هۆنەری کورد هەیە، هۆنراوەی بۆ شەهیدانی ئەو ڕۆژە و قارەمانانی دیکەی وەک: « چوار ئەفسەرەکە، مەحموود جەودەت ... تاد » نەگوتبێ. کەم هۆنەری کورد هەیە، هۆنراوەی بۆ شۆڕشەکانی « ئارارت، دەرسیم، سمکۆ، شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی، شێخ مەحموودی بەرزنجیی » نەهۆنیبێتەوە.

بەڵام، « مەلای گەورە »، تەنیا هەر ساڵی « **1926** »، هۆنراوەی « من یەخەی خۆم، لە بۆیە دائەدڕم » بۆ « شێخ سەعیدی پیران » و هاوەڵەکانی گوتووە. ساڵی « **1930** »یش، بە هۆنراوەی « ژیانی وا بە ئالام »، باسی لەشکرکێشیی سوپای « عێراق »ی، بۆ سەر نێوچەی « بارزان » کردووە و بە نۆزدە دێڕ هۆنراوە فەرموویەتی:

بەڵێ، ئەم شینە، شینی قەومی کوردە
قیامەت ڕابووە، لەم دار و بەردە
ئەوا، « یابە »ش لە هەق کوردان بەخۆکەوت
تفو لەم میللەتەی بەدبەخت و دەم چەوت
لە مانگێ زێترە، جەیشی « عێراقیی »
بە ئەسبابی جیدال و تەمتراقیی
هجومی کردە سەر « بارزان »ی مسکین
بە تەیارە و بە شەستیر و بە ژبلین
لە جێی لالە و گڵۆکی سووری « نیسان »
لە سەر کێوان، ڕژاندی خوێنی کوردان
ئەوی دەستیانکەوێ، منداڵە یا ژن
لە خاکیدا سەروبنیان دەنێژن
ئەوانەی پیر و پشت کوڕ و زەعیفن
لە ئەشکەوتان دەڵێی « ئەسحابی کەهفن »
ئەوانەی مەردی جەنگین میسلی کێوی
بزربوون کە دەرز و قەڵشی کێوی
هەزار منداڵ و ژنیان سەربڕیوە
هەزار کیژی عەفیفیان زگ دڕیوە
بە بۆمبا خان و مانیان بوو بە وێران
مەڕ و ماڵیان هەموو ڕۆیی بە تالان «**141-140**»

**ستۆکهۆڵم**
**2000. 09. 11**

* * *

**تێبینی:**

1. « منتشا » تەورێکی پچکۆلەیە، دەروێش هەڵیدەگرێ.
2. سووری چاوشین، مەبەسی لە ئینگلیز بووە.
3. « شێخ عومەری سەهرەوەردیی » شێخی سۆفیگەریی و زانای شافیعیی، لە نێوان ساڵەکانی « 1153 - 1191 » ژیاوە و ئێستەش، گۆڕەکەی هەر لە « بەغدا »یە.
4. ئەم گوتارەم، بۆ دەزگەی « سەردەم » نارد، ماوەی پتر لە ساڵێ لەوێ مایەوە. بەڵام، بڵاو نەکرایەوە. کاتێ چووم، سۆراغێکی بزانم، گوتیان: گوتارەکە ونبووە! ئیدی لەو ڕۆژەوە، هیچ جۆرە بابەتێکم، بۆ ئەو دەزگە وێژەیی و کەلتوورییە گەورە بەرزەی کورد نەناردووە. ئاخر، کەس بیستوویەتی، دەزگەیەکی وا گەورە، ئەو هەموو کارمەندە ڕووناکبیر، نووسەر و هۆنەرە، لە سەری بژین، ئینجا، گوتار دیار نەمێنێ؟!!

**سەرچاوە :**

عەبدولخالق عەلادین، مەلای گەورە زانا و ئەدیب و شاعیر، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، کوردستان ـ هەولێر، 1994 .

# « موفتیی »

# کورد و مەرد

هۆنەری گەورەی خەمخواری کورد، ناوی « مەلا عەبدولڵلای توتنچیی کوڕی مەلا کەریمی بێستانە »، بە « موفتیی پێنجوینیی » ناوی دەرکردووە، لە نێوان ساڵەکانی « 1881 - 1952 »ز. دا ژیاوە. جگە لە هۆنراوە « نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیی... »یەکانی، چەندین هۆنراوەی دیکەی وەک: « خوێندن، مەکتەب، مەکتەبی پێنجوێن، سێبەری مەکتەب ... »ی، بۆ هاندانی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان داناوە، کە بخوێنن و ڕوو لە زانست و زانیاریی بکەن.

« موفتیی »، وەک هۆنەرێکی کلاسیکیی کورد، هەرچەندە هۆنراوەکانی، لە ڕووی ناوەڕۆک و واتاوە، پایەیەکی بڵند و جێیەکی تایبەتییان هەیە، چونکە، هۆنەر بایەخێکی زۆری، بە بابەتی گرنگ و ناوەڕۆک داوە، هۆنراوەی بۆ کۆمەڵانی ڕەشوڕووتی نەتەوەکەی نووسیوە، تا ڕەشەخەڵکەکە، بە شێوەیەکی ئاسان، لە هۆنراوەکانی تێبگەن. بە هۆشیان بێنێتەوە و گۆڕانکارییەک، لە ژیانیاندا بەدیبێنێ. بەڵام، لە ڕووی هونەری هۆنراوەگوتنەوە، هۆنراوەکانی هێندێ ساکار و لاوازن. کەچیی، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی هۆنراوەکانی، بە کوردییەکی پەتیی هۆنیوەتەوە. بە زمانێکی « ئاسان، پاراو، سفتوسۆڵ و بێ گرێوگۆڵ » دارِشتووە. بە شێوەیەکی شیرین و ڕەوان دەریبڕیوە. زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گوتوون، زۆربەی ڕووداوە گرنگەکانی، ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگەی کوردەواریی سەردەمەکەی خۆی، وەک فیلمێکی سینەما، بە شێوازێکی جوان و ڕێکوپێک تۆمارکردووە. هەر لەبەرئەوەشە، هێز و پێزێکی ئەوتۆیان پەیداکردووە، بە شێوەیە، زۆر بە ئاسانیی، جێی خۆیان لە نێو دڵ و دەروونی خوێنەر و جەماوەری کورددا کردۆتەوە. بۆیە، خەڵکی بە تاسەوە، باوەشی دڵسۆزییان بۆ هۆنراوەکانی کردۆتەوە، لەبەریانکردووە و لە بۆنە جیاوازەکاندا، وەک پەندێ گوتوویانەتەوە.

هۆنراوەکانی « موفتیی » هۆنەر، لە گەلێ ڕووەوە، لە هۆنراوەکانی « قانیع »ی هاوڕێی دەچێ. وەک هێلکەیەکی دووزەردێنە وان، یەک گیان بوون و لە دوو جەستەدا بوون. لە ڕووی بابەت و واتاوە، زۆربەی هۆنراوەکانیان، لە یەک بابەت دەدوێن و لە دوو فۆرمی جیاوازدا داڕێژراون. جا بۆ وانەبن؟ ئەدی هەر دووکیان، هەوای سازگاری یەک نیشتمانیان هەڵ نەمژیوە؟ هەر دووکیان، بە بۆنی « هەلاڵە، نێرگز و بەیبوون »، مێشکیان پاراونەبووە؟ هەر دووکیان، بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی، دیمەنە جوانە دلفرێنەکانی « کوردستان »ەکەیان، سەریان مەست نەبووە؟ هەر دووکیان، تابلۆ شیرینەکانی سەیرانگەکانی وولاتەکەیان، لە نێو شانەکانی مێشکیاندا، ڕەنگیان نەکێشراوە؟ لە دڵ و دەروونی هەر دووکیاندا، پۆنگی نەخواردۆتەوە؟ لە بەهاری تەمەنی تافی لاویی و جوانیاندا، کانیاوی هۆنراوەیان نەتەقیوەتەوە؟

بەڵێ، « موفتیی » هێندە نەتەوەکەی خۆی خۆشویستووە، هێندە ڕێزی خشڵی دار و زێڕی بەردی نیشتمانەکەی گرتووە و لای ئازیزبووە، چۆن بولبولی خۆشئاوان، دارستانی مەنگ و چڕوپڕ، بە چریکەی موزیکی ئەفسوناویی پڕ دەکا، دڵداریی لەگەڵ پەڕەی ناسکی گوڵ دەکا، ئەویش بەو شێوەیە، دڵداریی لەگەڵ چیمەنی سەوزی خاکی شیرین و خەڵکی بە ئەمەکی بێ دەرەتانی نیشتمانەکەیدا کردووە، شەیدای گەوهەری تۆز و سوورمەی خاکوخۆڵەکەی بووە و گۆرانیی بۆ چڕیوە. بۆیە چەندین هۆنراوەی هەر بە ناوی « وەتەن »ەوە داناوە. لە هۆنراوەی « بۆ نیشتمان »دا، بە بیستوهەشت نیوەدێڕ گوتوویەتی:

مودەتێکە من بە مەخفی، شیوەن و گریان ئەکەم
هەر خەیاڵی خاک و قەومی، میللەتی کوردان ئەکەم
ڕوو بە سەحرا سەر ئەنێم و قوڕ ئەپێوم پڕ بە دڵ
بێ خەبەر وا تێئەگەن، من بێ خەمم، سەیران ئەکەم
ئاوی چەشمەی چاوەکانم، وا بە هەوری خەم تەقی
شۆخیی و یادی بە زۆری، ئاوەکەی « سیروان » ئەکەم
هێندە غەرقی شینم و خەرقەم بە شینیی کردەبەر
قیمەتی پیرۆزە بێ شک، زووبەزوو هەرزان ئەکەم
بۆ کەسێکی عاشق خاکی وەتەن، گەر بێتە لام
گەر کەبابی مەڕ نەبێ، جەرگ و دڵم بریان ئەکەم
من ئەگەر، لافی ئەدیبی وا لە سەرما بۆ تەماع
کەی برای خاک و وەتەن، مەیلی تیرباران ئەکەم
دەوڵەمەندی خێڵی کوردیی، خێر و قوربانی ئەکەن

من کە بێ پارەم، سەرم بۆ قەومەکەم قوربان ئەکەم
بێت و گەر دەرچم لە خاکا، ڕوو بە گەرما بۆ ئەچم
ڕوو لە شاخ و بەردی شۆخی، خاکی « هەورامان » ئەکەم
ئەم دڵی خەمناکە، چونکە هەر هەوای بەرزی ئەوێ
جاربەجارێ، یادی سەوزی گەردنی « گاڕان » ئەکەم 1
داخی داخانم، « کەلی خان »م لەدەستچوو 2
ئێستە وەک « جاف »ی لەمەو بەر، ئارەزووی کوێستان ئەکەم
کۆمەڵی تیپی وەنەوشە و قارچک و ڕێواسەکەی
بۆ دەروونی لەتلەتم، دەرمانی وەک « لوقمان » ئەکەم
من کە دارمازووم ببێ، تا هەژدە بەر بگرێ بەڕیز
تازە بۆ فکری گوڵاڵە و داری « هیندستان » ئەکەم
دەردەکانم بێ سەر و سامانە، چاری ناکرێ
بەم قسە و باسانە، ئەم دەردانە من دەرمان ئەکەم
« موفتیی »، بۆ ئەم خێڵە یا ئەم خاکە، تا ماوی بڵێ:
قوڕ بە هەر دوو دەست، لە تەوقی سەر هەتا دامان ئەکەم «56-57»

« موفتیی » وەک هۆنەرێکی کورد، لە سەرتاسەری « کوردستان »ی مەزندا، ناو و ناوبانگی دەرکردووە. هەر وەک چۆن « مستەفا بەگی کوردیی »، لە باخە بەرینە ڕازاوەکەی وێژەی کوردییدا، تەنیا هەر بە هۆنراوەی ڕۆمانسیی، تاجی شای هۆنەرانی لە سەر ناوە، هەر بەو چەشنەش، « موفتیی »، بە هۆنراوەی نیشتمانیی، لووتکەی چیای بەرز و سەرکەشەکانی، هۆنراوەی کوردیی لێ گرتووین. بۆیە، بە یەکێ لە هۆنەرە نیشتمانپەروەرەکانی کورد ناسراوە. هەمیشە لەگەڵ ژان و ئازاری نەتەوەکەیدا ژیاوە، لە زۆربەی هۆنراوەکانیدا، ویست و ئارەزووەکانی، کۆمەڵانی خەڵکی دەربڕیوە.
بەڵام، ئەوەی « موفتیی » بلیمەت، لە هۆنەرە کلاسیکییەکانی دیکەی کورد جیادەکاتەوە، ئەوەیە: « موفتیی » تەنانەت بۆ بێ تاقەتیش بووبێ، هۆنراوەیەکی ڕۆمانسیی نەگوتووە، سەری خۆی بە پێداهەڵدان و باسی جوانیی ژنانەوە نەیەشاندووە! کاتی خۆی، بە باسکردنی سروشتەوە نەکوشتووە! بۆیە، بەو جۆرە لە هۆنراوەی « عەیبە »دا، بە شازدە نیوەدێڕ فەرموویەتی:
عەیبە شاعر، لەم زەمانە، یاری زوڵف و شانە بێ
یا سوپاسی، قامەتی گوڵزاری، ڕووی جانانە بێ
هەر کەسێ، لافی ئەدیبیی، وا لە سەریا بۆ تەماع

حەیفە ئەشعاری، خەرافیی یا قسەی ئەفسانە بێ
شاعیریی بیکەی بە کوردیی، یانی: خاوەن هۆش و بیر
چۆن ئەبێ، هوشیار و زانا، هۆنەری لەرزانە بێ
هەر ئەدیبێ، خووی لە سەر خاڵ و خەت و ئەگریجە بوو
من لە حەق داوائەکەم، خوا بیبرِێ، با هەر نەبێ
پیاو کەسێکە، بۆ ژیان و جیفە، تا ئاخر نەفەس 3
نۆکەری شێخ و غولامی بەگلەر و ئاغا نەبێ
خۆشەویستی خوایە، هەر کەسێ قاچ و شان، دەسی خۆی
تووشی زەحمەت کات و لای کەس، ملکەچ و ڕیسوا نەبێ
لە کۆتاییشدا گوتوویەتی:
تێگەیشتوو، هەر ئەناڵێنێ لە ژێر باری خەما
بێ مەراقیی بۆ کەسێکە، سەرسەریی و دێوانە بێ
« موفتیی »، هەر چەند تۆ کە هۆنەر نیت و ناوت هۆنەرە
تا وەکوو مردن، ژیانت ژینی ئینسانانە بێ «95»
هەروەها، هۆنراوەی « پرِیەتی سندوقی دڵ »ی، لە ساڵی « 1939 »دا، بە سیودوو نیوەدێرِ هۆنراوە ڕازاندۆتەوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:
پرِیەتی سندوقی دڵ، دایم هەتا دووسەد هەزار
گەوهەری پرِ قیمەتی، ئەشعاری شۆخی خۆش شعار
سەرفی ناکەم من، لە بازاڕی پرِوپووچا بە هیچ
یەعنی زوڵف و پەرچەم و خاڵ و خەتی ڕووی گوڵعوزار «95»
« موفتیی »ش، وەک هۆنەرانی پێش خۆی، دەنگی بڵندکردۆتەوە، لەو باوەڕەدا بووە، نابێ، هۆنەر هەر تەنیا باسی « خونچەی دەم، لێوی قەیتانیی، چاوی ڕەش، کوڵمی گەش، خەتی سەوز، خاڵی سەر کۆنا، پەرچەمی درێژ و زوڵفی ئاڵۆز » بکا. بۆیە، لە هۆنراوەی « ئۆخەی »دا گوتوویەتی:
پێویستە، لە سەر شاعیری ئەم عەسرە لەمەولا
خامۆشی بکا، باسی دەم و چاو و خەت و خاڵ
لام وایە، گەلێ عەیبە، لە بۆ پیاوی بە قیمەت
ناوبردنی بەرموور و مل و بازن و خرِخاڵ «61»

---

1. چیایەکە لە نێوان « مەریوان » و « سنە » دایە.
2. چیایەکە لە نزیک « بانە »یە.
3. جیفە: پیس و گڵاو.

« موفتیی »، تەنیا هەر شێتوشەیدای زێدەکەی خۆی بووە، هۆنراوەی بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی گوتووە. هەر بۆ ئەویش ژیاوە، خۆی بۆ ماندووکردووە، گەرمەشینی بۆ گێڕاوە، شانازیی پێوە کردووە. بۆیە، لە هۆنراوەی « لە ڕێی نیشتمان »دا، زۆر بە ڕاشکاویی، بە سیوچوار نیوەدێڕ هۆنراوە، هەستی خۆی دەربڕیوە و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

هەر منم شێتم بە تەنیا، بوومە خەمخواری وەتەن
وا لە سەر شانم بە دایم، بار و سەرباری وەتەن
شین و گریانم نەدی، بێ دەرد و خەم، بێ کاسبیی
نایەڵێ ساکن ببێ دڵ، ئێش و ئازاری وەتەن
هەر بە ئومێدە، لە سوبحا پێکەنینی خونچە بێ
بولبولێکم عاشق و شەیدای، گوڵزاری وەتەن
سەر بە قوربانی کەسێ بێ، قەدری خاکی لا ببێ
نایەوێ ژین و ئەکا ڕۆحی، فیداکاری وەتەن
زیکری من غەیری وەتەن، حەرفێ لە دڵما ڕێیی نەما
یا ڕەبی هیچ کەس نەبینم، وا گرفتاری وەتەن «68»

یا، لە هۆنراوەی « ئەی وەتەن »دا، ڕووی لە دایکی نیشتمان کردووە، بە دە دێڕ هۆنراوە، باسی داماویی، کەساسیی و بێ کەسیی نیشتمانەکەی کردووە. لە دەس دواکەوتوویی و سەرانی کورد ناڵاندوویەتی و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

ئەی وەتەن! من تێئەگەم، بۆ شین و زاریی کارتە
بۆ نەبوونی عیلمی بەرزی گەورە و سەردارتە
ئاخوداخ و ئاهی سەردی تۆ، سەبەب ئەم دووانەیە
خۆپەسەندیی و غایەویستیی، گەورەکانی شارتە

پاشان، بەم دێڕە کۆتایی بە هۆنراوەکە هێناوە و گوتوویەتی:

گەر ئەپرسی حاڵی « موفتیی »، ئاهوناڵەی بۆ چییە؟
عاشقی دەشتودەر و شەیدای بەرد و دارتە «51»

بۆیە هێندێ جار، تووشی دەردەسەریی، خۆشاردنەوە، گرتن، دوورخستنەوە و هەژاریی بووە. کەچیی لەو کاتانەشدا، « کوردستان »ەکەی بیر نەچۆتەوە. دڵی بۆ یاری شیرینی نیشتمان، جۆشیخواردووە، وەک مەنجەڵی سەر ئاگر قوڵپیداوە. فرمێسکی خوێنینی بۆ ڕشتووە. یادی بستەبستی وڵاتەکەی کردۆتەوە. هۆنراوەی بە سۆز و ئاگرینی بۆ هۆنیوەتەوە. بۆیە، دوای ئەوەی دەربەدەریشکراوە، بە ورەیەکی بەرز و پۆڵایینەوە، بەڵێنی بۆ نوێکردۆتەوە، لە هۆنراوەی « بۆ تۆیە وەتەن »دا، بە یازدە دێڕ و لە سەرەتادا گوتوویەتی:

بۆ تۆیە وەتەن، من لە وەتەن تووناکراوم
دێوانە سیفەت ژینمە، بەدناویە ناوم
پاشان، لە باری دەروونی خۆی دواوە، لە خوڕەی خوێنی گەشی کانیاوی چاوی، خۆشەویستەکەی ئاگادارکردۆتەوە و گوتوویەتی:
شەو تاکوو سەحەر، شیوەن و زاریمە هەتا کەی
بڕوانە خوڕەی خوێنی گەشی، چەشمەی چاوم
لە کۆتاییشدا، دووبارە سوێندی بۆ دڵدارەکەی خواردووە، پەیمانی بۆ نوێ کردۆتەوە. بە شانازییەوە، خەمە گەورەکەی خۆی، لە جێی خۆراکی ڕۆژانە داناوە. پلار و توانج کاری تێ نەکردووە، قووڕی نیشتمانەکەی، لە تاجی بیانیی لا پیرۆزتربووە. بۆیە گوتوویەتی:
قەستەم بە چیا و شاخ و هەموو دەشت و نزارت
قەهر و خەمی تۆم نانە، لەگەڵ گۆشت و پڵاوم
نایدەم، بە کشت پارچە قوماشی هەموو دنیا
نانێکی بەڕوی تاڵ و لەگەڵ شاڵی دڕاوم
جێی بەرد و پلارم، لە هەموو لاوە لە سەر تۆ
بێ عاریی و سەرسەختییە، بەم جۆرە کە ماوم
« موفتیی »، لە قووڕی سوور و ڕەش و شین بە سەراکە
ئەوساکە ئەڵێم: خاوەنی سەد تاج و کڵاوم «**71-70**»
« موفتیی »، لە هۆنراوەی « بۆ گۆڤاری هەڵاڵە »ی ساڵی « **1946** »دا، بە دە چوارینە، دڵخۆشیی خۆی دەربڕیوە، کە لە سەردەمی کۆماری « مهاباد »دا، بە زمانی کوردیی، گۆڤار دەرچووە. دەربارەی « شەهیدان » گوتوویەتی:
بیری بدە ئەی کوردە، کە چەن ساڵە لەبەرچی
خوێن و شەرەفت، لای ئەمە و ئەو پاکی حەڵاڵە
خوێناوی شەهیدانە، کە ئەڕژێ لە کەژ و کێو
وا تێ مەگە، ئەو سوورە، هەموو لالەیی ئاڵە
لە کۆتاییشدا، دەربارەی زمان گوتوویەتی:
ئەی کوردە، زمانی عەرەبیی و فارسیی و توورکیی
لێی لادە، بە ڕەسمیی مەدوێ، تازە بەتاڵە
ڕەببی نەنەوێ، دەستی قەومی کاکی ....
ڕزگارتئەکا، کاکە لە گریان و لە ناڵە «**82-81**»
دەتوانم، بە ڕاشکاویی بڵێم: زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی، لە « گرفتە نەتەوەیی، کێشە ڕامیاریی و ڕەوشتە کۆمەڵایەتیی »یەکان دەدوێ.

لەبەرئەوە، هیچ گومانی تێدا نییە و شتێکی بەڵگە نەویستە، «موفتیی» هۆنەرێکی گەورەی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری شۆڕشگێڕی، کورد و سەردەمەکەی خۆی بووە. دژی «زۆرداریی نێوخۆ، جیاوازیی چینایەتیی، چەوساندنەوەی ژنان، کوشتنوبڕین، تالانوبڕۆ» ڕاوەستاوە. سەری بۆ کەس دانەنەواندووە، دەسی لە کەس پان نەکردۆتەوە. گەورەیی لای ئەو، ڕەوشتی بەرزبووە. خاوەنی هەڵویستێکی بێ گەرد و مەردانە بووە. هەرگیز، لە بیروباوەڕی خۆی پەشیمان نەبۆتەوە. دەسی یارمەتیی بۆ چەوسێنەران و داگیرکەرانی «کوردستان» درێژ نەکردووە. دژی داگیرکەری ئینگلیز بووە. بەلام، لە هەمان کاتیشدا، چاک و خراپی لە یەکدی جیاکردۆتەوە.
هەروەها، دژی چەوسانەوەی چینایەتیی خەباتیکردووە، پەردەی لە ڕووی، کرداره چەپەڵەکانی، «شێخ، مەلا و دەرەبەگ»ەکانی کورد هەڵماڵیوە. کاتێکیش بە تەواویی، لە هەموو شتێ تێگەیشتووە، خۆی لە قوژبنی تەکیە، مزگەوت و دیوەخانەکان دزیوەتەوە، دژی دەسەلاتی «کۆمەلایەتیی، ئایینیی و ئابووریی»یان ڕاوەستاوە. بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی، بە یازدە شەشینە، لە هۆنراوەی «گەورەیەک»دا، باوەڕی خۆی دەربڕیوە. ئەز لێرەدا و لەم بوارەدا، تەنیا ئەم هۆنراوەیە، وەک نموونەی مشتێ، لە خەرواری بەرهەمەکانی دێنمەوە. چونکە، لە گەڵێ ڕووەوە، لە زۆربەی زۆری دەرد و مەینەتییەکانی، ژیانی کۆمەڵی کوردەواریی دواوە و گوتوویەتی:

گەورەیەک، بۆ کەس نەبێ سێبەری
خۆم بۆ بگێڕم، لە دەوری سەری
بە وشکیی، بۆچی بم بە مەیتەری
وەختێ دەرکەوێ، هەستم لە بەری
هەر بۆ خۆی داییم، هەوڵی ژیان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، چاوی لە فەقیر نەبێ
دەربەست ژیانی، جوان و پیر نەبێ
کەس لە پولێکی، دەسی گیر نەبێ
جەرگی بۆ میللەت، وێنەی قیر نەبێ
مێمڵ بە ماڵ و دوژمن بە جان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، داییم خەمخوارت نەبێ
مەرهەمی ئێش و ئازارت نەبێ
جێگای تەنگانە و هاوارت نەبێ
حەکیمی جەستەی، بیمارت نەبێ
ئەگەر خاوەنی، خاکی « ئێران » بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، چاکتر لە باب نەبێ بۆت
ڕزگارت نەکا، لە بەند و لە کۆت
جارێ نەپرسێ، هاوار و ڕۆڕۆت
کەڵکێکی نەبێ، بۆ منداڵ و خۆت
ڕەنجی هەر بۆ خۆی، بۆ بەرگ و نان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، وەک خۆی نەڕوانێتە من
خۆی پلاوخۆر بێ و من نانی هەرزن
سەرباقی ئەوەش، تالان و کوشتن
ڕیشەی سەربەستیم، دەربێنێ لە بن
هەر خۆی قەڵەوکا و شان و مل پان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، سەرم بەردەبازی بێ
جەرگم نێچیری، چنگی بازی بێ
بە سەرما تانجی، دەرگای نازی بێ
نەشبینم جارێ، دڵنەوازی بێ
ڕەفتاری باشی، ئێش و سووتان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، ژینی بە خوێن مژین بێ
زیادە نانی خۆی، بە نانبڕین بێ
هێندە بێ ڕەحم و ویژدان و دین بێ
عالەم لە جەوری دڵ، پڕ برین بێ

ڕۆژبەڕۆژ، باری دەردی گران بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، نیوەی لە ڕەنجی ساڵت
بسێنێ، لە دەس خۆت و ماڵت
هێشتا بە زەیی، نەیە بە حاڵت
بە دار و بە شەق، بشکێنێ باڵت
چاویشی لە دەس، شوان و سەپان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، ساتێ لە ژێر دەستی ئەو
ئارامم نەبێ، بێ خۆراک و خەو
پاسەوانی بم، بە ڕۆژ و بە شەو
جوێن و شەقیش بێ، بەراتەکەی ئەو
ئەگەر شۆرەتی، وەک سلێمان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، ئێش و نۆشێکی نەبێ
ڕوویەکی خۆش و گەشێکی نەبێ
بۆ حاڵی بچووک، هۆشێکی نەبێ
دڵێکی گەرم و جۆشێکی نەبێ
گەر ئەسکەندەری شاهی جیهان بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ

گەورەیەک، لەلەی مناڵەکەی بم
خۆڵڕێژی حەوش و ناو ماڵەکەی بم
پێشمەرگەی خۆی و هی خاڵەکەی بم
بێ بەش لە نان و چەتاڵەکەی بم
ئەگەر، « ڕۆستەم »ی « مازەندەران » بێ
یا خوا ئەو گەورە، بەشی نەمان بێ «84-86»

تۆ بڵێی، هۆنەر و نیشتمانپەروەرێکی وەک: « موفتیی »، هێندە ئەویندارى نیشتمانە بریندارەکەی بووبێ، کاتێ کۆماری « کوردستان » لە « مهاباد »

دامەزرابێ، هەروا ڕووداوێکی کتوپڕیی و کەم بایەخ بووبێ، هیچ ڕۆڵێکی لە ژیانی تایبەتیی و نەتەوەیی هۆنەردا وازی نەکردبێ؟ تۆ بڵێی، لە دوورەوە تەماشای ڕووداوەکانی کردبێ، هۆنراوەی بۆ نەهۆنیبێتەوە و لە قووڵایی دڵەوە، گۆرانیی شادمانیی بۆ نەچڕیبێ؟ بەڵێ، « موفتیی » هۆنەر، یەکێ لەو هۆنەرە کوردپەروەرە دڵسۆزانە بووە، سەردانی پێتەختی کۆمارەکەی کردووە. لە نزیکەوە، ئاگاداری ڕووداوەکان بووە. تێکەڵی نووسەر، هۆنەر، ڕامیار و ڕووناکبیران بووە، گەلێ هۆنراوەی ناسک وەک پەڕەی گوڵ، شیرین وەک هەنگوین، سپی و جوان وەک دانەی مرواریی، بۆ کۆمارە ساوا تاقانەکەی، بۆ پێشەوا بلیمەت و زاناکەی، بۆ ئاڵا بەرزە ڕەنگینەکەی دارشتووە. وەک تاکە ترۆپکی ترووسکەی هیوای ئاپێندەی نەتەوەکەی، بە گەشبینییەوە لێی ڕوانیوە!

با بزانین، لە هۆنراوەی « ئۆخەی »دا، چ جۆرە ئۆخەیەکی بۆ کردووین؟! بە چ شێوەیە، دامەزراندنی کۆمارەکە، ئاوپرژێینی دڵ و دەروونی کردووە؟! تەماشاکەن، تا بزانن، چۆن دڵەی منداڵی پێکەنیوە و گڕوگاڵیکردووە؟ چەن بە شێوەیەکی جوان و ڕەوان، بە سێ نیوەدێڕ هۆنراوە، هەستی پۆنگخواردووی خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

ئەمڕۆ، کە لە خۆشیی وەتەنم هەر وەکوو منداڵ
دڵ پێئەکەنێ ئێستە، کە کەوتۆتە گڕوگاڵ
بۆ خزمەتی ئاڵایە، کە سەوزە و سپییە و سوور
ئەیکەم بە فیدای قەوم و کەس، ڕۆح و سەر و ماڵ
ئەو دوو گوڵەکەنمەی، کە حەیاتی من و تۆیە
یەک سەد ئەبڕێ، پشت بە خوا پاییزی ئەم ساڵ
نووکی قەڵەمیش، نێزەیە بۆ سینەی ناحەز
پێی وەرئەگرین حەق، چ بە خەروار و چ بە مسقاڵ «61»

یا کاتێ، ڕووی لە « سابڵاخ »ی، ڕووگەکەی ژینی کردووە، ویستوویەتی، بە ئاوی زەمزەمی حەوزەکەی « بۆکان »، تینوێتی چەن ساڵەی بشکێنێ، خۆری سەرکەوتنی کورد، هەموو کونوقوژبنێکی نیشتمانەکەی ڕۆشنکردۆتەوە، ئا لەو کاتانەدا، هۆنراوەی « بۆ کۆماری مەهاباد » گوتووە و گوتوویەتی:

قیبلەکەی ژینم ئەڵێم: « سابڵاخ »ە، من ڕووی تێئەکەم
حەوزەکەی « بۆکان »ە لای من، تازە ئاوی زەمزەمم
وا سەری هێنادەرێ، ڕۆژی من و قەومی زەلیل
وەک بیابان ڕوونە یەکسەر، خاکی تاریک و تەمم «63»

دیارە، گەر « موفتیی » هێندە شانازیی، بە کۆمارەکەوە نەکردایە، بە جێژنی خۆی دانەنایە، هەڵبەتە، هەزار مردووی ئازیزی لێ بڕۆشتایە، پرسەی بۆ دا نەدەنان، جێژنەکەشی، لە خۆی و هاوزمانەکانی نەدەشێوان! بۆیە، زۆر بە گەرمییەوە گوتوویەتی:

هەزار مردووی عەزیزم مردبێ، ئەمڕۆ دڵم شادە
کە بیستم قەومەکەم، قیسمێک چوڕ و سەربەست و ئازادە «64»

هەڵبەتە، کوێستانی دڵە گەورەکەی « موفتیی »، هێندەی نەبردووە، پەڵەی بەفری خەم و پەژارەی ڕەشبووبێتەوە. چونکە بیستوویەتی، ڕۆژی سەرمای زستانی کورد، بە ڕووزەردیی هەڵدێ، تارای بووکێنی بەهاری خۆشیی هەڵداوەتەوە، گوڵی سەربەستیشی، لە باخی هیوای کوردا گەشاوەتەوە. بۆیە، « موفتیی » بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنراوەی « بە هیوام »، وەک پەلکەزێڕینەی پرچی ئایشێ و فاتمە هۆنیوەتەوە و گوتوویەتی:

وەختە کوێستانی دڵم، بەفری خەمی ڕەشبێتەوە
وا ژیان و ژینی من، دووبارە ڕێکئەخرێتەوە «67»

یا کاتێ، لە هۆنراوەی « مژدە »ی ساڵی « **1945** »دا، بە هەشت پێنجینە، سەرەمەستەکەی بە کێش و سەرەوای « کورد » هۆشمەنکردووە، بە دڵ خۆشییەوە، مژدەی بە هەموو لایە داوە، گوایە ئیدی لە سایەی کۆماردا، ناوی کورد وەک گەوهەری شەوچراخ دەدرەوشێتەوە. کورد لە ژێر باری گرانی بندەسییدا نامێنێ، لە دەس کوردقڕان ڕزگاریدەبێ، تاجی سەربەخۆیی لە سەر دەنێ. ئیدی، هەروا پێیدا هاتووە، تا لە ستاییشی پێشەوادا گوتوویەتی:

هەر بژی « قازی محەمەد »، هەر بژی کوردی نەبەرد
هەر بژی قەومێ، کە ناترسێ لە کوشتار و لە دەرد
ڕوو ئەکاتە لەشکری دوژمن، بە گۆچان و بە بەرد
پەشمە لای دیلیی، نزار و شاخی بەرز و دەشت و هەرد
ڕائەماڵێ پۆلی دوژمن، هێرش و لافاوی کورد «66»

جا گەر هۆنەرێ، بەو شێوەیە، شێتوشەیدای نیشتمانەکەی بووبێ، دیارە، لە دەردە سەرەکییەکانی کۆمەڵەکەی دەکۆڵێتەوە، یەکیەک دەسنیشانیاندەکا. پاشان، چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوە. لای هۆنەرێکی کوردپەروەری وەک: « موفتیی »، وەک هەموو هۆنەر و ڕووناکبیرە دڵسۆزەکانی دیکەی کورد، ئەو نەخۆشییە کوشندەیەی، لە ڕیزی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا بینراوە، پتر خۆی لە « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی »دا نواندووە. بۆیە، « موفتیی » وەک هۆنەرێکی نەتەوەیی و شۆڕشگێڕ، دەربارەی ناکۆکیی و دووبەرەکیی،

چەن جارێ هۆنراوەی هۆنیوەتەوە، ئەفرەتی لەو خەسڵەتە خراپانە کردووە، بە هۆی یەکەمی هەموو « نەگبەتیی، بەڵا، ژێردەسیی و دواکەوتن »ێکی داناوە. لەبەرئەوە، لە هۆنراوەی « نەبەردی »یدا، بە سی نیـوەدێڕ هۆنراوە، باسی ئازایەتیی کوردی کردووە. بەڵام، داخی بۆ دواکەوتوویی و خۆخۆرییان هەڵکێشاوە و گوتوویەتی:

بۆ نەبەردیی و چاونەترسیی، فەرقی سەد ئەڵمانە کورد
بۆ شەڕ و دەعوای حەقیقەت، شێری ڕووی مەیدانە کورد
بەحسی ئازایی، هەتا ساڵێک بنووسم هەر کەمە
من ئەزانم، چی بنووسم، پاکی سەد چەندانە کورد

داخەکەم، بێ عیلمن و خۆخۆرن و خوێنڕێژی یەک
هەر خەریکی تاو و قووچ و کوشتن و تاڵانە کورد
خزمەتی خەڵقی بە ڕۆح و سەر، هەتا مردن ئەکەن
ڕەعیەتێکی بارەبەر، گوێگر، هەموو ملپانە کورد

بێ سەر و سەردارن و دوشمن بە ڕۆحی یەکترن
بۆیە پەرپووت و زەلیل و وێڵ و سەرگەردانە کورد
ڕادیۆ ئەیخاتە گوێم، زەوق و نەشیدی عالەمێ
عوود و تار و زەوق و شەوقی شیوەن و گریانە کورد

بۆ برینی دەستی بێ چارە و فەقیر و هیچ نەزان
چەندە وەستای پرچ و ڕیش و ڕشتنی چاوانە کورد
ئەجنەبی ئەمڕۆ، لە سەر تەختی هەوا جەولان ئەکا
سەنعەتی ماکینەجاتی، جەلبیی و زیندانە کورد

گەر ئەپرسی، باعیسی ئەم جەلب و سەرگەردانییە
تەکیە گووڕێژ و کسکچی خانەقای شێخانە کورد

یا خەریکی مێزەر و ڕیش و عەبا و جببەیە
بێ سەودا و بێ دەنگ، بە دایم ئیشی چاونووسانە کورد
هیچ نەما یەکسەر، کە نەیکەن جەلبی ئەرز و ئاسمان
کەشفی ئەرز و ئاسمانی، زەرگ و دەفلێدانە کورد

هەر بە تیفلی، فێری سنعەتیان نەکردین پێی بژین
تەقنە و سواڵیان نیشاندایـن، بۆیەماڵوێرانە کورد
نوێژ و ڕۆژ و بوو بە کارمان، فیکری عیلمی بێ سەمەر
بۆیە ئێستەش هەر خەریکی، سواڵی ناو کووچانە کورد

کاکە! با بەسبێ، خەیاڵی میللیی و فیکری عەبەس
هەر سەرێ ئەمڕۆ ئەبینی، گۆی شەقی مەیدانە کورد
« موفتیی »، گەر ئەقڵت هەبێ، هەوڵی ژیانت چاترە
سەد ئەوەندەی تر بڵێی، هەر دەردی بێ دەرمانە کورد «72-73»
« موفتیی »، لە هەشت پێنجینەدا، لە سەر هۆنراوەیەکی « ئەحمەد موختار جاف »، دەربارەی ناکۆکیی گوتوویەتی:
گەلێ چاتر لە ژینە، ئافەت و تاعوون و مردنتان
هەتا وا ناحەزی یەک بن، لە بۆ یەک ڕێگە گرتنتان
بە هیچ نابن، هەتا وابن، لە یەک تالان و کوشتنتان
بخوێنن، چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و سەعاتێ، عەینی قەڵغان و سوپەرتانە «87»
« موفتیی »، لە هۆنراوەی « چەند ساڵ لەمەوبەر »دا بە بیست دێڕ گوتوویەتی:
ئێمە لەبەرچی، بە زەحمەت ئەژین
مردووپەرستین، هەم زیندووکوژین
بە ناهەق، خوێنی یەکتر ئەمژین
یەکیەتی بۆ باخ، ناکەین بە پەرژین «150»
دیارە، « موفتیی » زۆر بە وردیی و بە تەواویی، ڕەگی گوولیی و دەردی دێرینی کوشندەی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و خۆخۆریی » کوردی دەسنیشانکردووە. گەلێ جاریش، لە ئەنجامی ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییەدا، خۆفرۆشیی و نیشتمانفرۆشیی ڕوویداوە و ڕووشدەدا. بۆیە هۆنەر، دەربارەی ناپاکیی، لە نێو ڕیزەکانی کۆمەڵی کورددا، لە پێنجینەیەکدا لە سەر هۆنراوەیەکی « گیوی موکریانیی »، نەفرەتی لە ناپاکان کردووە و گوتوویەتی:
لەعنەت لە کەسێ بێ، بە وەتەن خائن و ناپاک
ڕۆحێکی نەبێ، بەرز و دڵێکی گەش و ڕووناک
هەقبێژم و هەقنووسم و بێ ترس و چالاک
« کوردێکی دلێرم، لە هەموو گەردشێ بێ باک
ڕۆڵێکی وەفادارم و پڕ عەزم و سوباتم » «92»

هەرچەندە، گومانی تێدا نییە، « موفتیی » هۆنەرێکی نیشتمانپەروەری کورد بووە. هەمیشە لەگەڵ ژان و ئازاری ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیدا ژیاوە. بەڵام، لە گەر بڵێم: زۆربەی هۆنراوە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانی، لە کوورەی هەست و سۆزێکی خاوێنەوە هەڵقوڵاوە، هوشیاریی ڕامیاریی لاوازبووە، بە هەڵەدا نەچووم. گەر داگیرکەریش، کارێکی باشی لەگەڵ ڕۆڵەکانی گەلەکەی، یا نێوچەکەیدا کردبێ، بێ ئەوەی لێکیدابێتەوە، کە ئەو داگیرکەرە، بە هەموو شێوەیە گەلەکەی دەچەوسێنێتەوە، سامانی نیشتمانەکەی تاڵاندەکا، ئیدی بۆ دەسکەوتێکی کەم، ستاییشیکردووە و هۆنراوەی بۆ گوتووە. بۆ نموونە: کاتێ، ساڵی « **1955** »، کاربەدەسانی دەوڵەت، کارەبایان بۆ شارۆچکەی « پێنجوێن » ڕاکێشاوە، « موفتیی » هۆنراوەی « پێنجوین مژدە بێ »ی، بە سیازدە چوارینە هۆنیوەتەوە. دوای ئەوەی، باسێکی جوانی « پێنجوین »ی کردووە، ئینجا ستاییشی « باییز ئاغا »ی قایمقامی « هەڵەبجە » و « جەلال خالید بەگ »ی موتەسەڕیفی « سولەیمانیی » کردووە. پاشان، سوپاسێکی گەرمیی، « وەسیی و مەلیک »ی ئەو سەردەمەی « عێراق »یشی کردووە و گوتوویەتی:

وەسیی و مەلیکمان، خۆشەویستی گشت
بۆ « عێراق »، بە جووت بوون بە پەنا و پشت
سێبەری ئەوان، « پێنجوین » بۆ تۆش هات
شەو بوو، لە ناکاو ڕۆژمان لێ هەڵات **«107»**

پاشان گوتوویەتی:

وەسیی و مەلیکمان، خۆشبن هەتا سەر
باخی ئومێدمان، یەکیەک دێتە بەر
ئاخ! چەم و شیوی پڕ لە مێش و مار
جوان دائەپۆشرا، ئەکرا بە گوڵزار **«108»**

« موفتیی »ش وەک « ئەسیریی »، بە بیست دێڕەهۆنراوە، لە هـــــــۆنراوەی « لەمەولا »دا، دژی بەکارهێنانی چەک دواوە و گوتوویەتی:

کوردە! لەمەولا، هۆشێ بێنەسەر
لادە لە بەزمی بێهوودە و سەمەر
تا ئێستە ئاخر، بە جەنگ و بە شەڕ
چی کەوتە دەستت، بە غەیری زەرەر؟
ئەم ڕۆژە ڕۆژی، عەقڵ و زەمانە
نەک ڕۆژی شەڕی، تیر و کەوانە

پاشان گوتوویەتی:
گەر لە هۆزەکەت، پیاوی ژیرت بێ
ڕەنگە ئارەزووی، دڵ دەسگیرت بێ
دواتریش گوتوویەتی:
کوردە! بە زاتی خوای تاک و تەنیا
ناگەیتە هەوار، بە هەراوهوریا
بزن بەخێوکەی، لە دەشت و سەحرا
چاکترە لە شەڕ، بۆ دین و دنیا «55-54»

« موفتیی »، لە هۆنراوەی « بۆ گەلی کورد »یشدا، بە بیستوهەشت نیوەدێڕ، دژی جەنگی دەرەوە و نێوخۆ هەڵوێستی وەرگرتووە و گوتوویەتی:

هەر قەومە، قەولی سەفەربەریەتی
ئەم کوردە، داییم شەڕ لە سەریەتی
یا بە چەپۆکی دوژمن، پەشێوە
پۆلێ لە زیندان، پۆلێ لە کێوە
یا هەر خۆبەخۆ، ئەنیشنە یەک
داری یەکێتیی، دەردێنن لە ڕەگ
ئەم داخە، ئاخۆ کەی سامانی بێ؟
ئەم دەردە، ئاخۆ کەی دەرمانی بێ؟
لە کوردستانا، دەمانچە و تفەنگ
خۆزگە نەمئەبیست، نەمئەدی بە ڕەنگ
وەختێ کە ئەچین، پاسیان بۆ ئەبڕین
بۆ ئەوەی، دز و جەردەی پێ بگرین
کەچیی هەر خۆمان، ئەبین بە جەردە
چەتەیی ئەکەین، لەم کێو و هەردە
هەزار کارئەکەین، لە دیهات و شار
بە هۆی « پاس »ەوە، ون و نادیار
ئەو بێ چارانەی، کەوا ئەکوژرێن
پاسدار ئەیکوژن، بەڵکوو نەناسرێن
ئەگەر تا ئەوەی، چەتەی ناودارە
ڕاووڕووت ئەکا، بۆ پوول و پارە
خۆی هاوارئەکا، من فلان کەسم
چیت پێیە و بێنە، زوو بیدە دەسم

یا بڕێک حەیوان، ئەداتە بەردەم
ئەیانداتەوە، بە قیمەتێ کەم
ئاخ ئەمدی، تفەنگ کۆئەکرایەوە
شەڕ و کوشتن و شین ببڕایەوە
فەقیریش بۆ خۆی، ئەحەسایەوە
منالی سیسیش، ئەگەشایەوە «74-75»

مەگەر «موفتیی»، پلەوپایەی شارۆچکەی «پێنجوێن»ی زانیبێ. چونکە، زێدی خوی بووە، بۆ یەکەم جار لە ژیاندا، هەر لەوێ چاوی هەڵێناوە. هەڵبەتە، قەدری زێڕیش، لای زێڕینگەرە!

بۆیە هۆنەر، بێ بووکی سەر چیای «پێنجوین»، ئارامی نەگرتووە. بێ سەیرانگەی بەهەشتی «پێنجوێن»، تاوێ نەسرەوتووە. بێ دەشت و دەری ڕازاوەی زەرد و سووری «پێنجوێن»، هەرگیز ژیانی نەبووە. بەڵکوو، لە مەرگ نزیکبۆتەوە. تەنانەت، بە خاکی «لوبنان»یشی نەگۆڕیوەتەوە!

بۆیە، بە بۆنەی بوومەلەرزەکەی ساڵی «**1947**»ەوە، لە هۆنراوەی «شیوەنێک بۆ پێنجوێن»دا، بە پەنجاوهەشت نیوەدێڕ، شیوەنی بۆ کردووە و گوتوویەتی:

«پێنجوین» بەبێ تۆ، نزیکە مەرگم
«لوبنان» شکێن بووی، داخی بە جەرگم
تازە بووکێ بووی، بە سەر چیاوە
ئەهاتنە سەیرت، لەم لاو لەو لاوە
پارچە ئەرزێ بووی، لە پارچەی بەهەشت
زەرد و سوور و شین، کەژ و کێو و دەشت
سەیرانگەی پۆلی گەنجی، «عێراق» بووی
لەم سەردەمەدا، بۆ خۆشیی تاک بووی
جێگەی هەزاران، بێ نان و ئاو بووی
هەرچەند ناحیە بووی، شاری تەواو بووی
«پێنجوین» بەبێ تۆ، نزیکە مەرگم
«لوبنان» شکێن بووی، داخی بە جەرگم
بۆ هەوای ساف و ئاوی ساردی تۆ
ئەکەم هەتا هەم، شیوەن و ڕۆڕۆ
میوەی بەهەشت بوو، تامی میوەکەت
کەوسەر بوو، کانیی و چەم و شیوەکەت
«ئێران» و «عێراق»، چاویان لە تۆ بوو

مردووش لە ناوتا، بە ڕەنگ و بۆ بوو
سەد دڵی سیست، گەشئەکردەوە
سەد خەمت، لە بیر من ئەبردەوە
شاری غەزنە بووی، بێجگە لە خۆشیت
خۆشیی بوو، سەرپاک دەرد و نەخۆشیت
« پێنجوین » بەبێ تۆ، نزیکە مەرگم
« لوبنان » شکێن بووی، داخی بە جەرگم « 115-116 »

« موفتیی »، یەکێ لەو هۆنەرە پێشکەوتووخوازنەی کورد بوو، کە باوەڕێکی تەواویی، بە مافی ژنان هەبوو. هەمیشە هانیداون، بخوێنن، تێکۆشن و داکۆکیی لە مافە ڕەواکانی خۆیان بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، وەک مرۆڤێکی ژیر و بلیمەت، زۆر باش زانیوێتی، هەموو ژنێ وەک یەک نییە، وەک چۆن، لە نێو پیاواندا، چاک و خراپ هەیە، لە نێو ژنانیشدا، هەر بەو شێوەیە، باش و خراپی تێدا هەیە. بۆیە، لە هۆنراوەی « ژنی باش »دا، ساڵی « 1940 »، بە بیستودوو نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

گەر خودا بیدا بە چاکیی، دەوڵەتی شاهانە ژن
نیعمەتێکە، وەک بەهەشت و هاودەمی پیاوانە ژن
بۆ دڵێکی بێ خەم و شەخسێکی بێ دەرد و ئەلەم
گەوهەرێکی شەوچراغی، ژوور و بەرهەیوانە ژن
گەر، کەموکوڕییت لە ماڵیشا هەبێ، باکت نەبێ
بۆ کەموکوڕیی، ترازووی کۆمەڵی خێزانە ژن
ژن لە لای پیاوی نەزان و سەرسەریی، نرخی نییە
بۆ ژیانی کۆمەڵی، باشتر لە میر و خانە ژن
بۆ سوپاسی باسی چاکیی، چی بەیانکەم هەر کەمە
جووت و ئاش و نان و بەرگ و باخچە و بێستانە ژن
باعیسی ئارامی قەلب و مەرهەمی دەرد و برین
بۆ هەموو دەردێ، دەوابەخشێکە وەک « لوقمان »ە ژن
دەوڵەتێکی پڕ لە شەوق و زەوقە، داییم بۆ بەشەر
نیعمەتێکی خۆشەویستیی و بێ سەر و سامانە ژن
کەی گوڵ و گوڵزاری باخاتی ئیرەم، وەک ئەو ئەبێ
باخی ساحێب زیننەت و پڕ لوئلوئی مەرجانە ژن
بۆ کەسێ نووری « سولەیمان »ی، لە قەلبابێ یەقین
پایە مەحکەمکردنی هەق، دین و هەم ئیمانە ژن

زۆرتری عەیشی بەهەشتی ـ حور ئەلعەین ـ کچن
لەززەت و خۆشیی بەیاناتی، لە ناو قورئانە ژن
بێتو گەر، مولکی کەماڵ و گەنجی حوسنی یەککەوێ
گەر دووسەد گەنجی لە سەر دانێی، ئەڵێم: هەرزانە ژن «156»

ئاخر، «موفتیی» هۆنەرێکی ڕاستگۆبووە، باوەڕێکی تەواوی، بە ڕیالیزم هەبووە، وەک هێندێ خوێندەوار و ڕووناکبیری پەڕگیر نەبووە، هەموو ژنێ بە باش بزانێ. چونکە، لە هیچ جێیەکی ئەم جیهانەدا و لە نێو هیچ جۆرە گیانلەبەرێکیشدا، هەموو ڕەگەزەکان، وەک یەک باش نین، بەڵکوو، چاک و خراپیان تێدا هەڵدەکەوێ. ئەمەش یاسای سروشتە و کەس ناتوانێ، نکوولیی لێ بکا. بۆیە، هۆنەر هەر وەک چۆن زانیویێتی، ژنی باش هەیە و بە هۆنراوە بە سەریدا هەڵداوە، هەروەها زانیویشێتی، ژنی خراپ هەیە و بە هۆنراوە، خەسڵەتەکانی دەسنیشانکردووە. ئەوەتە، لێرەدا هۆنەر، وەک وەڵامی کۆمەڵانی خەڵکی دابێتەوە، نەبا لۆمەیبکەن و پێی بڵێن: ئاخر، تۆ کە هێندە، بە سەر ژناندا هەڵدەدەی، خۆ هەموویان هەر باش نین؟!! لەبەرئەوە، لە هۆنراوەی «ژنی خراپ»دا، زۆر بە ڕاشکاویی و بە شێوەیەکی جوان، لە ژنی خراپ دواوە و بە شازدە نیوەدێڕ گوتوویەتی:

گەر، خودا نەیدا بە چاکیی، دوژمنی ئینسانە ژن
مار و دووپشک و پڵنگی شاخی «هەورامان»ە ژن
گەر، گڵۆپی دووسەدیش هەڵکەی، لە ماڵ و مەتبەقا
دووکەڵی حەوش و حەسار و ژوور و بەرهەیوانە ژن
تۆ ـ دە ـ پەیداکەی لە ڕۆژا، ئەو بە ـ سی ـ داناکەوێ
هەر خەریکی قاووچ و قوچ و بردن و تاڵانە ژن
گەر، نەخۆشیت نەبێ، سیلداریی و دڵ پڕ لە خەم
چۆتە ناو جەرگت بە داییمیی، ئێش و دەرد و ژانە ژن
گەر، لەگەڵ ئەودا بەهەشتت پێ بدەن، لێی ڕائەکەی
تا وەکوو مردن عەزیزم، دەردی بێ دەرمانە ژن
گەرچی، شێوەی شۆخ و شەنگ و دوورکوژ و پڕ عیشوەبێ
تۆ، لە بەر چاو و دڵت، شێوەی وەکوو شەیتانە ژن
بۆ خراپیی ئەو، قەڵەم ئەشکێ و زمانیش کوڵ ئەبێ
قابیزیش ڕازیی نەبێ، هەر ئێشی گیانکێشانە ژن
هەر بژی «موفتیی»، کەوا داییم لە ڕێی ڕاستیی ئەڕۆی
هەر بڵێ، تا مردنت دەرد و بەڵای ئینسانە ژن «157»

گومانی تێدا نییە، زمان بە یەکێ لە کۆڵەکە هەرە گەورە و گرنگەکانی بوونی نەتەوە دادەنرێ. لەبەرئەوە، هەر نەتەوەیەک، پارێزگاریی زمانی نەتەوەیی خۆی نەکا، وەک پێویست، ڕاژەی نەکا و پێشی نەخا، ئەوا ئەو نەتەوەیە، هەست و هۆشی نەتەوەیی لاوازە، کەمتەرخەمییدەکا، یا نەخۆشییەکی دەروونیی هەیە! « موفتیی » هۆنەر، یەکێ لەو هۆنەرە نەتەوەپەروەر و نیشتمانپەروەرانەی کورد بووە، ئەم ڕاستییەی، زۆر بە باشیی زانیوە. بۆیە، زۆر خەمی زمانی کوردیی خواردووە و بۆی بە پەرۆشبووە! ئەوەتە دەبینین: ساڵی « **1946** »، بە هۆنراوەیەکی چل نیوەدێڕیی و لە ژێر ناوی « ناساندن »دا، لە لایەکەوە، دەربارەی پێوەندیی زمانی کوردیی و ئایین، وەڵامی ئەو مەلا نەزان و بیانییپەرستانەی دەداتەوە، کە ڕێزی زمانەکەی خۆیان نەگرتووە. لە لایەکی دیکەشەوە، لەگەڵ زمانەکانی « عەرەبیی، فارسیی و توورکیی »دا، بەراوردیکردووە و زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

ئێستەش بە کوردیی، تەفسیری قورئان
کفرە لای گەلێ، نەفام و نەزان
بەڵام، بە توورکیی یان بە فارسیی
گەشکەدارئەبن، بۆیان بنووسی
وا عەرەبییمان، کۆڵەکەی دینە
توورکیی و فارسیی، بۆچ وا شیرینە؟
« ضەرب ئەلەئەل »ێک، هەبوو لە ناومان
ئەمانخوێندەوە، ڕوون ئەبوو چاومان
عەرەبیی گەوهەر، توورکیی زۆر هونەر
فارسیی شەکەر، کوردیی تڕی کەر
ژیشک بێچووی خۆی، لا شل و نەرمە
کەچیی بێچووی من، مشاری سەرمە
ئەو تێیگەیاندین، هوشیاری کردین
ئەم نەزانینەی، لە سەر لابردین *
هەر کەسێ کەسە، حەرفێکی بەسە
گەورەمە هەر کەس، کە فریادڕەسە
دوژمنیش پەیکوڵ، دەربێنێ لە پێم
گەر خاسی نەڵێم، ئەبێ چی بڵێم «169-168»

---

*مەبەستی ئینگیز بووە.

« موفتیی »، وەک زۆربەی هەرە زۆری هۆنەرەکانی دیکەی کورد، زۆر باش زانیویتی، چەن نەخۆشییەکی کوشندەی وەک: « ئیرەیی، ڕکوکینە، ناکۆکیی، دواکەوتوویی ... » لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا بڵاوبۆتەوە، ڕەگی دڵ و دەروونی قرتاندوون، چونکە وەک دەڵێن: « کورد زیندووگێی مردووپەرستە ».
بۆیە، هەر لە کۆنەوە، ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە، زۆر ڕێزی پیاوی « خوێندەوار، ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر، هونەرمەند، ڕامیار، زانا و دانا »یان نەگرتووە، تا لە ژیاندا بوون، یارمەتییان نەداون، گوێیان لێ نەگرتوون و بە قسەیان نەکردوون. کەچیی، کاتێکیش مردوون، ئینجا، بۆیان گریاون و خەفەتیان بۆ خواردوون! لەبەرئەوە، لە هۆنراوەی « ئەڵقەلەگوێ »دا، بە بیستوچوار دێڕ، دەردی دڵی خۆی هەڵڕشتووە و لە کۆتاییەکەشیدا گوتوویەتی:

پیاوی گەورەمان، نایەتە بەر دڵ
تاکوو ئەو ڕۆژەی، ئەچێتە ژێر گڵ
ئینجا بۆی ئەگرین، بە جۆش و بە کوڵ
گۆڕەکەی ئەکەین، بە باخچە و بە گوڵ
« موفتیی »، قسەی تۆ ساغە و ڕووبەڕوو
حورمەتی زیندووش، بگرە نەک مردوو
بازێ کە بەربوو، لە دەستت دەرچوو
بۆ مردوو مەگری، بگری بۆ زیندوو **«202»**

هەروەها، لە هۆنراوەی « زانا بێ نرخە »شدا، چاوی لە « بێکەس »ی هۆنەر کردووە و بە سیویەک نیوەدێڕ گوتوویەتی:

داخەکەم، ڕۆژی هەوەڵ نەمزانی، ڕێگەی وەحشییان
بگرم و لێی لا نەدەم، دێوانە بم، شێت و نەزان
هێندە وەحش و سەرسەریی بووم، هەوڵی زانستم ئەدا
نەم ئەزانی، لێم ئەبێتە دەرد و ناسۆری گیان
شەرتە، تا ماوم، لەمەولا بیری زانستیی نەکەم
هێندە کەربم، بێنە سەرم، دەستەدەستە پیر و جوان **«195»**

لە هەمان کاتیشدا، « موفتیی »، وەک هێندێ هۆنەری دیکەی کورد، شانازیی بە هۆنەریی خۆی و هۆنراوەکانییەوە کردووە و گوتوویەتی:

لە بەر تاڵیی زەمـــانە و شەربەتی ئەشعاری شیرینم
هەتا ئەم دوو تەعامەم بێ، خەیاڵی شەکر و چا ناکەم **«79»**

* * *

---

سەرچاوە: موفتی پێنجوینی، دیوان، چاپی1، بەغدا، 1990.

# « ئەسیریی »
# فەیلەسوف و هۆنەری نیشتمانپەروەری کورد

« ئەسیریی » هۆنەر، ناوی « شێخ عەبدولخالقی شێخ حوسێنی نەقشبەندیی » بووە. سالی « **1895** »، لە شارە نەوتاویی و گڕگرتووەکەی « کەرکووک » لەدایکبووە و سالی « **1962** » کۆچیدواییکردووە. نازناوی « ئەسیریی »شی لە « ئیبنولئەسیر »ەوە وەرگرتووە، کە کوردێکی زانا و مێژوونووسێکی هاوچەرخی « سەلاحەدینی ئەیوبیی » بووە. «**13**»

« ئەسیریی »، لە سەرەتای لاوێتیدا، وەک پیشەی زۆربەی زۆری هۆنەرەکانی دیکەی کورد، پتر هۆنراوەی ڕۆمانسیی گوتووە. بەلام، کاتێ سەردانی چەن شارێکی گرنگی وەک: « ئەستەنبوڵ، ئەنقەرە و بێروت »ی کردووە، بە چاوی خۆی، سەربەخۆیی، ئازادیی و پێشکەوتنی ئەو گەلانەی دیوە، ئیدی بە جارێ گۆڕاوە، بەری چاوی ڕۆشنتربۆتەوە، ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانتربووە، بە تەواویی، بیری لە باری ژێردەسیی، چەوساندنەوە و دواکەوتوویی نەتەوەکەی کردۆتەوە، هۆکانی دەسنیشانکردووە و یەکبەیەک لێی کۆڵیونەتەوە. دوای ئەوە وازی لە ڕێبازی ڕۆمانسیی هێناوە و تەنانەت، هەر هۆنراوەیەکی لە سەردەمی گەنجێتیشدا هۆنیوەتەوە، هەمووی سوتاندووە. ئیدی بەو شێوەیە، هەموو ژیانی وێژەیی خۆی، تەنیا بۆ هۆنراوەی نیشتمانیی، ئایینیی و زانستانە تەرخانکردووە. گۆرانیی، بۆ جوانیی سروشتی دلفرێنی نیشتمانەکەی چڕیوە. لەگەڵ ئاهونزولەی هەژاراندا کڕوزاوەتەوە. دەردی هەژاریی و دواکەوتوویی کوردانی زڕاندووە. دژی دوژمنان و داگیرکەرانی کوردستان، دەنگی بەرز کردۆتەوە. بە گەورە پیاوان و دەسڕەنگینەکانی نەتەوەکەیدا هەڵیداوە. گەرمەشینی بۆ شەهید و سەردارانی کورد کردووە.

« ئەسیریی »، لەو سەردەمەی تێیدا ژیاوە، لە بواری هونەری هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانییدا، دوای « حاجی قادری کۆیی »، لە ڕیزی هۆنەرە نیشتمانپەروەرەکانی وەک: « بێکەس » و « قانع » دادەنرێ. وەک هۆنەرێکی شۆڕشگێڕی کوردپەروەر، زۆر بە ئاسانیی، جێی خۆی لە ڕیزی کاروانی وێژەی کوردییدا کردۆتەوە. هێندە بە شێوەیەکی ژیرانە و زانستانە، هۆنراوەکانی داڕشتووە، بیری لە باری دواکەوتوویی نەتەوەکەی کردۆتەوە، ئامۆژگاریی پڕ بە کەڵکی پێشکەشکردوون. بۆیە، هێندێ کەس پێیان وابووە، « ئەسیریی »، جگە لەوەی هۆنەرێکی گەورەبووە، وەک فەیلەسوفێکی کوردیش وابووە. ئاخر، گەر زۆر بە قووڵیی، لە هەموو دیاردەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی، ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی، پلانی پاشەڕۆژ و گەلێ شتی دیکەی نەکۆڵیایەتەوە، هەڵبەتە، ساڵی « **1925** »، واتە: هەشتا ساڵ لەمەوبەر، دەربارەی چەکهەڵگرتن و شۆڕشی چەکداریی، هۆنراوەی « بۆ زانین »ی، بە سیازدە دێڕ نەدەگوت و دژی بەکارهێنانی چەک نەدەبوو، کە ئەوڕۆ بۆ مان دەرکەوتووە، نەتەوەکەمان لە هەموو پارچەکانی « کوردستان » و لە سەراسەری مێژووی نەتەوەیی نوێشماندا، زیانێکی گەورەی لێ بینیوە. بۆیە، دید و بۆچوونەکانی، وەک نەخشی بەرد وابوون و بە تەواویی جێی خۆیان گرتووە. هەرچەندە، ئەم هۆنراوەیە، لە ڕووی هونەری هۆنراوەوە، بە شێوەیەکی ساکار نووسراوە، بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، بە زمانێکی ئاسان، بۆچوونەکانی خۆی دەربڕیوە، بیرێکی بەرز و وردەکارییەکی جوانی تێدایە، بە تایبەتیی کاتێ گوتوویەتی:

کوردە! چ فائیدەی هەیە ئەم خەنجەرە
ئەم فیشەک و ئەسلیحە و وەروەرە
باری مەکە ئاسن و باروت لە خۆت
باری گران، لایەق گا و کەرە
بەس بخۆ نانی جۆ، لە پێکە کڵاش
سواری کەر و حەچە برۆ و وا وەرە
ڕووت و ڕەزیل بی، بەمە خوا ئەمری کرد؟
بەسیەتی ئەم گەوجییە، زوو هەڵگرە
عیلم و مەعاریف، ئەوەتا بەشدەکەن
هەڵسە، وەرە حیسسەی خۆت وەرگرە
سواری سیلاحی خۆ دەبن « ئەورووپا »
سەیری تەیارە بکە، عیبرەت گرە

گەر، نەفرۆشێ بە تۆ ماڵ ئەجنەبی
ڕووت دەمێنێ، لە قسەم گوێگرە
میللەتێ نەتوانێ، بکا دەرزیێ
ئیشی پەرێشانییە، ئەو بێ فەڕە
فێری عیلم بە، لە هەچی جێ ببێ
گەرچی لە « چین »، گوفتەی پێغەمبەرە
کاکە فەقێ! تۆ بچۆرە مەکتەبێ
سەعیبکە، ڕێگە بە مەقسەد بەرە
چونکە، موسڵمانی حەقت پێ دەڵێم
دەرسی علوومی ئەجانب وەرگرە
فرسەتە، ئەم وەقتی جوانییە، برا
مەسخەرە و کەیف و خورافات هەڵگرە
کوردە! « ئەسیریی » قسەی حەق دەڵێ
تەربییەی حیکمەتی لێ وەرگرە «106-105»
یا، گەر بەو شێوەیە، بۆ نیشتمان و نەتەوەکەی خۆی نەسووتایە، هەڵبەتە، لە هۆنراوەی « بۆ مودیری کائینات »، بە هەژدە نیوەدێڕ نەیدەگوت:
داییم، لە فیکر و زیکری خەیاڵاتی میللەتم
بۆیە، وا کز و مەلوول و بەسۆز و حەسرەتم
پاشان، درێژە بە هۆنراوەکەی داوە و گوتوویەتی:
هەرچەند، کە تووشی تەهلوکەیێ بم لە ڕێی وەتەن
دەمدەم، زیاد ئەبێ شەرەف و شان و عیززەتم
چارەی تۆ، ئینتیباهێک و عیلم و مەعاریفە
چارەی منیش، فیداتیبکەم نەقد و سەروەتم «40»
یا، بەو وردیی و دڵسۆزییەوە، ساڵی « 1925 »، سنووری « کوردستان »ەکەی دەسنیشان نەدەکرد، لە خاکی نەتەوە دراوسێکانی دیکەی جیا نەدەکردەوە، بە بیست نیوەدێڕ، هۆنراوەی « سنوور »ی نەدەهۆنییەوە و نەیدەگوت:
کوردە! دەزانی لە کوێ ساکینە خزمانی تۆ
گوێگرە، تا پێت بڵێم: مەسکەنی قەومانی تۆ
کێوی تۆرۆس و عومقی حەوزەکەی ئەسکەندەروون
غەربییە تا بەحری ڕەش، سەرحەدی مەیدانی تۆ
بەحری ڕەش و ئەردەهان، ئاوی ئاراسە بزان
حەددی شیمالە ئەمە، بۆ کۆچ و جەولانی تۆ

ئەڵوەند و گۆلی ورمێ، تا سەری ئاوی ئاراس
سەرحەدی ڕۆژهەلاتە، جۆگە و کێوانی تۆ
ئەهواز و کێوی حەمرین، ژەنگار و ڕێی نسەیبین
بۆ تەرەفی جنووبە، ڕەوزەی ڕیزوانی تۆ
داخیلی ئەم حدودە، دوازدە ویلایەت هەیە
دەڵێن: دوازدە میلیۆنە، نفووسی کوردانی تۆ
حاشا درۆیە، ئەسڵا نفووسیان نەنووسراوە
دەگاتە بیست میلیۆنان، بنووسرێ قەومانی تۆ
لە دەری ئەم سنوورە، لە ئەنقەرە و خۆراسان
بلووج و ئازربایجان، لەوێشە خزمانی تۆ
ئەی وەتەنی خۆشەویست! ناوتم ئەوجا کە بیست
منالێکی ساوا بووم، دەبوومە قوربانی تۆ
وتەی وولاتی کوردە، لە لای تۆ هەروەک ویردە
« ئەسیریی »، ئەم حالەتە دەلیلی ئیمانی تۆ «45 – 46»
« ئەسیریی »، بە تەواویی دڵی بۆ جوانیی « کوردستان »ەکەی لێیداوە، بە بەهەشتی سەر زەمینی داناوە، بۆیە بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
بێرە کوردستان عەزیزم، گەر تۆ سەیرانت دەوێ
بتبەمە قەندیل، ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ
سەیری ئەو خێلانە کە، نیشتوونە داوێنی چیا
با بچین بۆ ماڵی کوردێ، گەر تۆ خۆیشانت دەوێ
بتبەمە سەر پیرەمەگروون و کاژاو و شەرا
بێ ڕەسەد، سەیری مەه و پەروین و کەیوانت دەوێ *
بتبەمە پای تاقی، لای سەرپێڵ و سەرمیل و کرەند
پێت نیشاندەم، سەدهەزار ئاساری ساسانت دەوێ
ئاوی ساف و ڕۆشنی داوێنی چەشمانی چیا
لێی بنۆشە دەمبەدەم، گەر ئاوی حەیوانت دەوێ
لاوی کوردی من، لەبەرکە شاڵی زاخۆ و ئامێدیی
گەر تۆ سەد چاتر، لە ڕەنگی شاڵی کرمانت دەوێ
هەڵسە، گەشتی چیمەن و گوڵزاری کوردستان بکە
گەر لە بۆ دەردی دەروونت، داوودەرمانت دەوێ

---

* پەروین: ئەستێرەی کۆیە. کەیوان: ئەستێرەی زوحەلە.

ڕۆح و ماڵت، سەرفی ڕێگەی میللەتت کە، ڕۆحەکەم
گەر لە خوا، لوتفی عەمیم و جود و ئیحسانت دەوێ
ئەی « ئەسیریی »، هێندە عەشقی میللەتی کوردت هەیە
بشمری، لام وایە، قەبری گردی سەیوانت دەوێ «29-30»
کاتێ، « ئەسیریی » بلیمەت ویستوویەتی، مێژووی نەتەوەکەمان بۆ باسکا، هۆنراوەی « پاشای بابانی بڵێ » هۆنیوەتەوە و بە هەشت دێڕ گوتوویەتی:
چاوەکەم! بۆ میللەتت تەئریخی ساسانیی بڵێ
ساز و بەربووت لێمەدە، ئایئای و گۆرانیی بڵێ
باسی ئەحواڵی، وولاتی ئەمێریکا بۆ دەکەی؟
باسی ماضی و حاڵ و ئیستیقبالی سۆرانیی بڵێ
چەند حوکمدارت، لە بەتلیس و لە بۆتانا بووە
گەر بەوە عیلمت نییە، پاشایی بابانیی بڵێ
باسی گۆلی جنوە و باغاتی لوبنانیش مەکە
ناوی کوردستان و باخ و قەسری بۆکانیی بڵێ
هاتوو جلخوارێ وتی: تەئریخی ماضی تۆ نییە
جاهیلە، عیلمی نییە، سا حەچە حەیوانی بڵێ
مەکرە سندوقێ، بڕێسێ میسریی و تورکیی و حیجاز
لێدە سندوقێ، بەیات و لاوک و حەیرانی بڵێ
کاری جەرمەن هەر چەنێ چابێ، بە تۆ چی چاوەکەم!
شاڵی زاخۆ و پەستەکی بانە و مەریوانیی بڵێ
پێت دەڵێن: شێخی « ئەسیریی »، دەم لە میللییەت مەدە
پیاوێ، قەومی خۆی نەوێ، مەفقوودە، ئیمانی بڵێ «50»
یا کاتێ « ئەسیریی » زانا، لە جیۆپۆلیتیک دواوە، هۆنراوەی « چیت کەمە؟»ی بە چواردە نیوەدێڕ ڕازاندۆتەوە و گوتوویەتی:
نەخشەجایێکی زەوی بێنە و دە بنوارە لەوی
تێبگە گەل گەل، چلۆن گردن، لە چەن بستێ زەوی
دانیمارقە و ئەسوەج و هۆڵاندە و ئەسویچەرە *
ئەرزی بەلچیکیشی لەگەڵدا بێ، دوو چەندانەی ئەوی
کێڵگەی هۆڵاند و مارق و بەلچیکا، وەک تۆ نییە *
مەردم زۆرن، لە تەنگانەن، لە جێیەکی نەوی

* دانیمارق، ئەسوەج، ئەسویچەر: دانیمارک، سوید، سویسرە. مارق: دانیمارک.

ئەسوج و نەروج وەکوو تۆ، بزن و مەڕ و جووتی نییە
مولْکی دارستانە، وەک تۆ کاری پێکدێنێ بەوی
شاخوداخی ڕووت و سەردە، جێگەی ئەسویچەرە
کاری ساعەتکردنە « چێشتچی » گەڕۆکانی زەوی
چیت کەمە، ئەی لاوی کورد! بۆچی داماوی بلێ؟
هەرچی مەردم هەیبێ، سەد هێندەت هەیە، چاتر لەوی
گەر نەجوولێی ڕۆڵە، ڕووزەردی لە دیوانی خودا
بۆیە لێی شێوا « ئەسیریی »، کردەوەی ڕۆژ و شەوی «51»
هەروەها، لە هۆنراوەی « دوانی ئادەم »دا، « ئەسیریی » بە بیستویەک نیوە دێڕ هۆنراوە، دەربارەی « زمانی کوردیی، بنچەی کورد و خزمایەتیی لەگەڵ زمان و نەتەوەکانی دیکە » دواوە و گوتوویەتی:
بە کوردیی بوو، زوانی « ئادەم »ی باپیرە گەورەی تۆ
هیمالایا بوو، جێگەی دەشتی هیندستان و قولەمبۆ 1
لوغاتی کورد زۆرە، گەر تۆ بنواڕی قسەی هیندیی
لە تەئسیراتی تیستیلا، لوغاتی عەرەب و فارس و گۆ 2
بپشکنی زوانی، هەر چی ئادەمیزاد هەیە، ڕۆڵە
ئەدۆزی و خڕئەکەی، چەن سەدهەزار لەفزی گفتەی تۆ
موحەڕەف بووگە، چاوشینە، ئەوە جەمشیدی پێ ئێژن قەومی خۆ
بلووچ و کورد و ئەفغان و ئێران و ئەرمەنیی، یەک بوون
بەلْخ بوو، پایەختی شاهیشاهانی قەدیمەی تۆ
سەراسەر هیندیی و خوارزمیی و سەفدیی خۆراسانیی
ئەمانە مامۆزاتن، تازە کە خزمایەتیی سەرلەنۆ
لە دایک و باوکی ئەفغانیی، لە سینە « بو عەلیی » دەرکەوت 3
« غەزالیی » سەفدییە، ڕۆڵە، ئەمانەن فەیلەسووفی تۆ
لە ئەوروپا، مەغۆلیی دوو کەسن، بولْغار و هەنغارۆ
ئەوە سوریانە سەنسقریتە، ئاریی یە یا نەخۆ ئاریی 4
هەموو کوردن، لە هەر دەورێ بوو، ناوێکی باوەی تۆ
ئەگەر ئارامیی و قیس و ئەگەر کرمانج و کورد و کورد 5
هەموو « ئەسلاو » و « یونە » و « جەرمەن » و لاتینیی یە ئاریی 6

---

1. قولەمبۆ: کۆلۆمبۆ. 2. گۆ: گۆتی. 3. سینە: مەبەس لە ئەبو عەلیی ئیبن سینایە.
4. سەنسکریتیی. 6. قیس: کیش. واتە: کیشیی یەکان. 5. یۆگۆسلاڤ، یۆنان، هەنگار.

هەموو یەک تایەفەن، ڕۆڵە، دەڵێ تەئریخی قەومی تۆ
لە شاری سۆزەوە، بۆ سەر فورات و دیجلە و قاڕوون
لەوێ ئارامیان گرتووە، « ئەسیریی » قەومی کوردی تۆ «58 - 59»

« ئەسیریی »، لە هۆنراوەی « تێنواڕی »دا، بە سیودوو نیوەدێڕ هۆنراوە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لە خەسڵەتە باشەکانی نیشتمانەکەمان دواوە. باسێکی تێروتەسەلی جوانیی و سامانی « کوردستان »ی بۆ کردووین. « باشووری کوردستان »ی، لەگەڵ « عێراق »دا بەراوردکردووە و گوتوویەتی:

لێرە، ئاسمان شین و لەوێ لێڵە. لێرە، گەزۆ و لەوێ قەتران دەبارێ. لێرە، چیای بەرز و لەوێ، بیابانی تەخت هەیە. لێرە، کانیی ڕوون و لەوێ، زۆنگاوی بۆگەن هەیە. لێرە، ئاوی سارد و لەوێ سوێرە. لێرە، هەوای سازگار و فێنک، لەوێ، گڕە و گەرمایە. لێرە، بەهاری تەڕ و ڕەنگین، لەوێ، وشک و برینگە. لێرە، دەشتی سەوز و گوڵاڵە و نێرگس، لەوێ، بیابانی وشک و بێ درەختە. لێرە، باخی ڕازاوە و پڕ لە میوەی بەتام، لەوێ، بەرماوە و بە ئاوی کورد دەپارێ. لێرە، ئاوەدان و لەوێ چۆڵەوانییە. لێرە، خاکی بە پیت و پتەوی بە کەڵک، لەوێ، زەوی زیخ و فشوفۆڵی بێ کەڵکە. لێرە، شنەبای بەرەبەیان، لەوێ خۆڵ ئەبارێ. ئەمانە هەمووی، لێرە مردوو زیندوودەکەنەوە، لەوێش، گڕەی گەرم گیاندەکێشێ. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم هەموو خەسڵەتە چاکانە، لە خاکی « کوردستان »دا کۆبوونەتەوە:

کەچیی لات و هەژارە، خەڵکی لاژوور
هەموویان دەوڵەمەندن، خەڵکی خوارێ
هەموو کۆمەڵ ئەکەن، هۆگرئەبن « تات »
هەرچی کوردە، لە یەک لالووت و لاڕێ
ئەوان خۆیان دیارییکرد لە عالەم
گەلی کوردیش، لە دووی عالەم ئەکا، ڕێ
سەرم تاسیوە لەم کارە، براگەل
ئەدیبێکم دەوێ، هۆشەنگی یارێ
جوابێکم بدا، چی بێ ئەسەل وا
ئەمان وان و ئەوان وا، تێنواڕێ
« ئەسیریی » تێکچووە، لەم کارە هۆشی
نەما بیری، بدا داکوو قەرارێ «61»

« ئەسیریی »، لە هۆنراوەی « نیشتمان »دا، بە شەش چوارینە، دەربارەی خۆشەوسیتیی و جوانیی نیشتمانەکەی خۆی گوتوویەتی:

خۆشەویستیی نیشتمانت، باعیسی ئیمانتە
چۆڵ و وێرانیی وولاتت، مووجەبی فەوتانتە
تۆزی ئەم خاکە عەزیزە، مەرهەم و دەرمانتە
کەڵبەز و ئەشکەوتی، کێوی قەسرتە، ئەیوانە
***

خۆش و دڵگیرە، نموونەی جەننەتە کوردستان
بێشە و شاخی بۆ میللەت، بۆتە باعیسی فەخر و شان
سەیرکەن، لێی تێبگەن، ئەم جێیە سینەمای جیهان
سەروەرانی گەل، لە عەشقی خاک وا هەڵواسران
***

دۆتەی شۆخ و قەشەنگە، ڕێک و ڕەنگین وەک وەوی
ناوی ئەم شیرین شۆخە، نیشتمانە هەم زەوی
لاوی نەوجاهم دە هەستە، بۆچی سەرمەستی خەوی
هی تووە ئەم نازەنینە، چاوەکەم تۆش هی ئەوی
***

سەر نەنێیە، تەختی سینەی خاکی پاکی نیشتمان
خواپەرستیی کەی، نییە نەفعی لە بۆ دین و ئیمان
حیکمەتی سوجدە عەزیزم، حوببی جێگاتە بزان
مورشیدی کوردم، ئەکەم بۆت حیکمەتی دینت بەیان
***

گەشبە، ئەی جێی شاهی میدیا، شاد و خوڕەم بەو بژی
خرت و لاوانی گەلی کوردە، لە میللییەت تەژی *
شەربەتی وریایی و ژیریی گەل و کۆمەڵ چەژی
باوەڕت بێ، تا جیهان مابێ، نەوەی کرمانج ئەژی
***

سەوز و ئاودار و گوڵستانی چەم و باغی وەتەن
حەقمە بۆ موڵکێکی، وا حافز لە سەرمایە و کەفەن
وا لە داخی کونکونە، جەرگی « ئەسیریی » وەک سەرەن
هەر دەڵێ: قوربانتم، داکم وەتەن، بابم وەتەن «66 - 65»
***

---

* تەژی: پڕ.

« ئەسیریی »، هۆنراوەی ماتەمی، بۆ سەرکردەکانی جولانەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی « باکووری کوردستان » نووسیوە. شینی بۆ کردوون، هۆنراوەی « ماتەمنامەی **24** ی ئایار »ی بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنیوەتەوە و گوتوویەتی:

ئەم بیستوچواری ئایارە، کوردە ماتەمە
ڕۆژی موسیبەت و بەلا و پەریشانیی و غەمە
لەم ڕۆژە شێخی نەهر و پالو، شەهیدکران
لەو کاری توورکە، مرۆ ئەمرۆ سەرسەمە
دوو وەقعە، جەرگی هەموو موئمینی سووتان
یەک وەقعەی « حوسێن » شەهیدە، دووەم ئەمە
دوقتۆر فوواد و خالید و یوسف و زیا و شەریف
کوژرانیان، هیلاکیی نەوەی گەورەی ئادەمە
ئەو سەروەرانە، کە نووسیم لە کۆمەڵی شوهەدا
کوردستان لە ماتەمیان، دووکەڵە و تەمە
خوێنە، دڵی کەسی نیشتمانیی و گەلی
جەرگی کەبابە، لە فرمێسکی جێگەشی تەمە
یاران وەرن، تو خوا کۆتەڵێ بکەین
لەم « کۆتەڵی » شوهەدا، خۆ کوژین کەمە
یاران وەرن، بچینە پرسەی کوردی سەروو
ڕەنگین بین ئێمەش، ئا لەو شینە بەو خومە
تا ڕۆژی دوا ژیانم، « ئەسیریی » دەڵێ:
هەڵبەستی ماتەمی شوهەدا بێژی، شەرتمە «**71 - 72**»

« ئەسیریی »، لە هۆنراوەی « هەوار »دا، بە شێوەیەکی زۆر بەرز و جوان، دیمەنە جوانەکانی « کوردستان »ی بۆ باسکردووین و بیریخستووینەتەوە. بۆنوبەرامەی گژوگیای کێویی « ڕەشەڕیحانە، شەونم، بەیبوون، هەڵەکۆک، گوڵاڵەسوورە، گوڵ و گوڵزاری دەشت و قەدپاڵی کێو »ەکانی بە لووتدا داوین. چاوی بە خوڕەی قەڵبەزی کوێستانەکان ڕۆشنکردووینەتەوە. سەری بە لووتکەی چیا سەرکەشە مێزەر سپی بە سەرەکان بڵندکردووینەتەوە و بە هۆنراوەیەکی درێژی چلوهەشت نیوەدێڕیی گوتوویەتی:

دەوروپشتی خانوو، جێگەی هەوارم گوڵشەنە
ئاوی جۆگە و گوڵ و ڕووبارم، شرینە و ڕەوشەنە
گیای بەهاری مێرگ و دامێنی چیا و کێوی من
نەرگز و لالە و ترنجۆک و بنەوشە و ڕەیحەنە

لێوی جۆگەی خوڕڕەم و ساف و سیمینی دولبەرم
ژاڵە و نەسرین و سونبول و یاسەمین و سەوسەنە
سەیری هەرچی شیو و شاخ و بەرد و دەشتم بکەی
باخ و بێستان و ڕەز و دار و کێڵگەم خەرمەنە
دەنگی خوڕەی ئاوی ژێر دارم، بە سەر بەرد و پەلا
خۆشترە سەد جار، لە دەنگی عود و ساز و دەندنە
ئاورێ! بەڕوێ لە کوردستانی من پەیدا دەبێ
چاترە و شیرینترە، سەد جار لە بستە و کەستەنە
چاوەکەم! ئەو جاجگەی وا لێرە منتی پێ دەڵێن
ئامەدی کوردستان، خۆشەی جەوی دارەبەنە
گەر تۆ بنواڕی لە کوردستان، سەراسەر سێ بەشە
باخ و دارستان و کێڵگە، ژێر ئەمانەش مەعدەنە
هەر زەمینێکم ببینی، بێ درەخت و بێ گیا
کانی زێڕ و زیوە، دەستت هەیە، لێی هەڵکەنە
من چ پێویستم نییە، تۆ و چەند هەوڵی خرید
داری کێوانم، بەڕو و بادام و گوێز و قەزوەنە
شانەی هەنگوین و شاخێ، گۆشتی کێوی لێ مەعاف
خۆم چلۆن قوربان نەکەم، بۆ ئەم حەشار و مەسکەنە
سەنگەر و چاڵی زەوی، شوورە و قەلاتم بۆ چییە؟
من کە دارستان و بێشە و شیو و شاخم مەئمەنە
پشتکۆ و ئەڵوەن و شاهۆ و ئەرارات و نەوا
هیچە لای شاخانی من، قرپات و ئەلب و پیرەنە *
کەپری تاوستانەی کوردیی، لە لێو باخ و چەما
خۆشترە سەدجا، لە قەسر و باخی « قەنبەرسەڵتەنە »
زانیار و گورج و دانایە، بەرەی پیاوی گەلم
مەردی مەیدانە ...... خەنجەر، ڕمنە
لاوی کوردی من، نەوەی میدیا و کەی ئەخسار ئەتۆ
خاوەنی سامان و تەخت و زۆر و تاج و عەنعەنە
دەشت و شاخ گوێ زەوی باپیرەکانت، گەر بتەوێ
بەستە، جێگای نییە، پایانە نابێ لە چەنە

* قرپات. زنجیرە چیایەکە لە نێوان سۆڤیێتی کۆن و ڕۆمانیا دایە. کەرپاتەی پێ دەڵێن.

بۆیە ئێستاکەش، ئەوانەی نەسەبی خۆیان زانیبێ
زۆر بڵندە بیریان، بێ باک و شۆخ و گەورەنە
ئارەزووی زانینی چشت و کارگەی گەر فێر ئەبێ
مەرکەزی تەحسیل و عیلمت، ڕۆڵە ئەمڕۆ لەندەنە
وەختی پێغەمبەر، لە عیلما چین بوو ئوستادی جیهان
« لۆندەرە » ئەمڕۆ، کە شاری سەنعەت و عیلم و فەنە
عیلم و عیرفان و سەعادەت، کەوتە هەرچی جێگەیەک
ڕوو لەوێ کە، زووبەزوو فێریبە هەر وەک مەنگەنە
تووش هەرچی عالمێکی کوردی، لێی تێ نەگەی
حیکمەت و زانین، وەک « ئەیو کەدیس دیوژەنە »
تووخمی ئاریی و ئارت، نووحی نەبی کرمانجی من
موهاجیری کرمانە، ئەو جێیە، هاوارگەی جەرمەنە
ئەی « ئەسیریی !» ڕۆژ و شەو مەدحی گڵی خاکت بکەی
هەر بەجێ نایێ، دەسا ئەم جارە لێیدە، کەم چەنە «37 - 39»

« ئەسیریی »ش، وەک هێندێ هۆنەری دیکەی کورد، درێغیی نەکردووە، بە توندیی دژی پێداهەڵدان و هۆنراوەی زۆر و بۆری ڕۆمانسیی وەستاوە. بۆیە، لە هۆنراوەی « ویجدانی عەسری »دا و بە یازدە دێڕە هۆنراوە، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

گەر ئەدیبی و ئارەزووی، سەرکەوتنی کوردت هەیە
تەرکی ئەشعاری عیشقبازیی کە، گەر بیرت هەیە
شیعری تەئریخیی بڵێ، بۆ ئینتیباهی میللەتت
مورشیدی عیلم و مەعاریف بە، ئەگەر عەقڵت هەیە
ناوی « هۆمێر » چەند هەزار ساڵە، لە یۆنان باقییە
شیعری تەئریخیی ئەگوت، وەک ئەو بە، گەر زەوقت هەیە
شیعری بەدئەخلاقیی و لافی ئەدیبیی چۆن دەبێ؟
تەرکی باسی چاو و خاڵ و خەت کە، ویجدانت هەیە؟
تەرکی کوردیی و نەزمی توورکیی و فارسیی چۆن مروەتە؟
خۆت بەمە تەقبیح ئەکەی، تێفکرە گەر فیکرت هەیە
ساحیبی ویجدانی پاکیی و ئەهلی ئینسافی ئەگەر؟
نابێ مەنعی کەی لە قەومت، چەندە تۆ حاڵت هەیە
خۆت فیدای ڕێی میللەتت کە، گەرچی جیسمت مەحوەبێ
شوهرەتت باقی ئەبێ، تا خاکی سەر قەبرت هەیە

پانزه ملیۆن کورد لەم ڕۆژە، عەجەب بێ ساحیبە؟!
بۆ حەقیقەتیان بەرە، گەر قودرەت و عیلمت هەیە
چەند عەتیقەی پێشی کلدانیی، لە جێی تۆ کەوتووە
خۆ نەزانی تاکوو کەی؟ ئینسانی تۆش، مەغزت هەیە
مونتەزیرە ڕۆحیان، بێ شوبهە بۆ ئیفلاحی تۆ
شاە سەلاحەددین و حاجی، چەند کەریم خانت هەیە
گەر بشێلێ ئەی « ئەسیریی »، فەوجی کوردی قوربەسەر
گەرچی مەدفونی لە خاکا، قەسری عەدنانت هەیە «48-47»

« ئەسیریی »، وەک هۆنەرێکی نەتەوەپەروەر، زۆر بە تەنگ زمانی کوردییەوە بووە. بۆیە، ساڵی « 1925 »، هۆنراوەی « سوودی زوان »ی گوتووە. هۆنراوەکە، لە بیست دانە نیوەدێڕ پێکهاتووە، بەڵام، دوو نیوەدێڕی بە بۆشایی هێشتۆتەوە، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، مەبەستی چی بووە!

مانی میللەت، بە پارێزی زوانە
شایەتی ئەم وتانە، مانی کوردانە
زوانە نامووس و پیاوەتی میللەت
زیندەوەکردنی ناوی کۆنانە
بۆیە ئەمڕۆ، لە هەموو کۆمەڵی کورد
باسی زۆر و دەس بە مەردانە
ئەوە ئیمڕۆ، لە تەئریخی تازە
نووسینی دەوڵەتی کۆنی کۆسانە
گوفتوگۆکردنی خۆشی لاوان
لە سنوور و وولاتی میدیانە
لە قوتابخانە خوێندنی ساوان
. . . . . . . . . .
. . . . . . . . . .
شیعریان ڕۆژهەلاتی بابانە
تۆپە کەورانی کۆنی « قەلات »
چاپی دەگرن، لە موڵکی سۆرانە
گەرچی، ئەم « دەوڵەتانە » هیچی نەمان
ناویان تا ئەبەد لە ناوانە
زیندووە نامرێ ،« ئەسیریی » میللەتەکەت
چون زوانی پاراستووە لە بێگانە «54»

وا دەردەکەوێ، « ئەسیریی » هۆنەر، ڕێزێکی زۆری، لە ژنانی کورد گرتووە. بۆیە، لە هۆنراوەی « ئافرەت لە شەڕی کوردەوارییدا »، بە سیوچوار نیوەدێڕ، باسێکی گەلێ جوانی، خەسڵەتەکانی ژنانی کوردی کردووە و گوتوویەتی:

گەر هەرایێ بێ، لە نێو کوردستان
یاریدەی پیاوان ئەدەن، کیژ و ژنان
سەنگەر ئەگرن، شەڕ ئەکەن، مێرد و کوڕان
نان و ئاویان، بۆ دەکێشن ئافرەتان
یەک لە پیاوان لێ درێ، ژن زووبەزوو
دەیرفێنن، دەینێنە سەر کۆڵ و شان
دایکەپیرە، زامەکەی تیمارئەکەن
دەیبەنە دێ، بۆ نەخۆشگەی دیدەوان
بۆ ئەوەی پیاوان، هەموو بۆ شەڕگە چن
وا دەبینی، دۆتەی شێخ بووە شوان 1
کیژی ئاغا و بەگ، بە لەنجەولارەوە
خۆی لە ناچاریی، دەبێتە باغەوان
وا کناچەی ڕیش سپیی، گوند و مەلا 2
یەک لە سەر بێستانە، یەک ساوەڵەوان 3
هەرچی کاری کوڕ بێ، کچ سازیئەکات
تا لەبەر دوژمن، نەبن تەنگاو ئەوان
شەڕ کە هاتەدەس، بە پەنجە و قایمە
جێدەمێنێ، باخ و ساوا و کەپرەوان
مێیینە بڕبڕ، بۆ جێ شەڕ ڕائەکەن
نابێ لەو چاخە، لە هیچ کەس ترسی گیان
خوێش و خەڵک و مێرد و خێزان پێکەوە
تێدەکۆشن، هەر وەکوو خوشک و بران
تا وەکوو دوژمن، شکست ئەخوا تەواو
شەڕئەکەن، بڕبڕ ئەدەن هەوڵ و دەوان
هەر کە دوژمن سەرفرو بوو، شاد ئەبن
پیاوەکان دییل ئەگرن و تاڵان کوڕان
ئافرەت زامدار و کوژراو خڕئەکەن
کاکە و ڕۆڵەی شیرین و بابیان

1. دۆتە: کچ. 2. کناچە: کچ. 3. ساوەڵەوان: بەرخەوان.

لەم شەڕی شێرانە، چۆن سەرکەوتوون
نابیستێ هیچ کەس، گرین و دەنگیان
شادیی و بەزم و زەماوەن، هەڵپەڕین
هەر لە ئێواریێ گرێدرێ، تا بەیان
ئەی « ئەسیریی »، میللەتێک وابێ ژنی
تێبگە، ئنجا چلۆنە پیاویان «55 - 57»

گەرچی « ئەسیریی »، گەلێ هۆنراوەی ئایینیی گوتووە، بۆ دۆست و ناودارەکانی کورد گریاوە، ستاییشی گەورەپیاوان و سەردارانی کوردی کردووە. بەڵام، هەموو ئەوانەی، لە دید و بۆچوونێکی نیشتمانپەروەرییەوە کردووە. تەنیا باسی زانا و پیاوە بەناوبانگەکانی کوردی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، وەک کوردێکی موسوڵمان و خواپەرست، هێندێ هۆنراوەی ئایینیی هۆنیوەتەوە. چەن جارێ بە هۆنراوە، ستاییشی یەزدان و پەیامبەری کردووە. بۆ نموونە: لە هۆنراوەی « دیسان ستاییشی پێغەمبەر »دا، بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ڕەوان، بە بیستودوو نیوەدێڕ گوتوویەتی:

فەخرئەکەین، سەر بە کەسێکین لە جیهان یەکتایە
بە هەموو کردەیی چاکە و بە کتێب و ئایە
سەرفرۆی قووەیی ئیعجازی کەلامن، بولەغا
شیعریان نەسرە، نەیانزانی کتێبی ئودەبا
موتەحەییر بوون، لە تەئسیری وتەی ئەو خوتەبا
کە موحەممەد، لە کەسێ دەرسی نەدی ئەلفوبا
سەرتاسەری خاکی جەزیرەی، هەموو ئیستیلاکرد
خەڵکەکەی کردە موسڵمان، لەوێ شیرکی لابرد
تەربیەی دایە بەشەر، وەحشەت و زوڵمی لابرد
نەیبوو ماڵ، نەیبوو هەواڵ، خواهشی گشت پەیداکرد
خزمەتێکی بەشەرە، دینی موبینی پاکی
پاکییە و ژینە، لەگەڵ یەکترا کردەیی چاکی
مەردیی و بەرزیی، بۆ یاریدە و هەم بێ باکیی
یا موحەممەد! لە بەشەر ئەشهەدوبیللا تاکی
هەیە بەم جۆرە، کەسێ بێ لە حەیاتی مەنسور
دوژمنی گشتی، پەرێشان و فەنابێ مەقهوور
دابنێ دینی وەها، لەشکر و نەزم و دەستوور
ڕەحمەتی خوا بۆ وجودی زەوی، بەو بوو پڕ نوور

گەر بخوێنیتەوە، تەئریخی پیاوی عوزەما
هەرچەنێ پیاوی جیهانگیر، پیاوی حوکەما و نودەما
ئەنبیا و موسلیحی ڕووی ئەرز، ملووک و شورەفا
تێدەگەی، سەروەری گشتیان موحەممەدە و ما *     «96 – 97»

*   *   *

---

**تێبینی:**

* و ما: بە عەرەبیی و ما غیرە، واتا کەس نییە سەروەر بێ.

**سەرچاوە:**


1. ئەسیری ـ دیوان، بەرگی1، چاپی1، چاپخانەی « ئەلحەوادث »، بەغدا، 1980.
2. رەفیق حیلمیی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، چاپی بەغدا، 1941، ل 39-44.

# بیره ڕوونەکەی
# « قانع »

« قانع » ناوی « محەمەدی شێخ عەبدولقادری شێخ سەعیدی دۆلاشیی » بوو. ساڵی « 1898 » لەدایکبووە و ساڵی « 1965 » مردووە. وەک لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا باوە، هەروەها، هێندێ کەس و ڕێکخراوی ڕامیارییش، پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن، گوایە « قانع »، هۆنەری چینە چەوساوەکانی « کوردستان » بووە و زۆر لە پارتی « کۆمۆنیست »یشەوە نزیکبووە. بەڵام لە ڕاستییدا، تەنیا هەر هۆنەری چینە ڕەشوڕووتەکانی « کوردستان » نەبوو، بەڵکوو، هۆنەرێکی گەورەی میللیی نەتەوەیی کوردیش بوو. چونکە، هێندەی خەمی بە کێشە نەتەوەییە گەورەکەی کوردەوە هەڵگرتبوو، هێندەی خۆی بە ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکی، ئەو خاکوخۆڵە زانیوە، هێندە خەمی، بۆ هیچ شتێکی دیکە نەخواردووە. هەمیشە، لەگەڵ خەمە گچکە و گەورەکانی نەتەوەکەیدا ژیاوە، دەردی دڵی خۆی، لە دەس دواکەوتوویی، بندەسیی و چەوساندنەوە هەڵڕشتووە. هەڵوێستی مەردانەی، دژی داگیرکەران نواندووە. باوەڕی خۆی دەربڕیوە، داوای ئازادیی و سەربەخۆیی بۆ کورد کردووە. ئاواتی بەرزی ئەوە بووە، ڕۆژێ لە ڕۆژان، کورد سەرکەوێ و دەوڵەتی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی هەبێ. دەتوانم، بڵێم: لە کۆی سەرجەمی هۆنراوەکانی، لە « 80٪ »ی پتری، هەر بۆ کورد گوتووە. بە تایبەتیی، نزیکەی دە هۆنراوەی، هەر بە « ئەی وەتەن » دەسپێدەکا، دەوروبەری نەوەد هۆنراوەشی، هەر لەسەر داگیرکردن و بێدەسەڵاتی کورد هۆنیوەتەوە. « قانع »، هەموو باوەڕ، هەست، هۆش، ژیان و گیانی، هەر لای نیشتمانە نازدارە داگیرکراوەکەی بووە. بۆیە، بە زمانێکی ساکار، پاراو، شیرین، ڕەوان و بێ گرێوگۆڵ، زۆربەی هۆنراوەکانی، بۆ کۆمەڵای خەڵک و ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی تۆمارکردووە.

هەرچەندە، لە ڕووی باری ژیان و ئاستی ڕووناکبیرییەوە، لە لایەکەوە، لە نێوان « قانع » و « ئەحمەد موختار جاف »دا، لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان « قانع » و « بێکەس »دا، جیاوازییەکی لەبەرچاو هەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هۆنراوەکانی « قانع » لە ڕووی هەستی نەتەوەییەوە، هەرگیز لە هۆنراوەکانی « ئەحمەد موختار جاف » و « بێکەس » کەمتر نەبووە و نییە. ئەوەش هەر لەبەرئەوە بووە، پتر لەگەڵ ئازار و ژانی نەتەوەکەیدا ژیاوە. جگە لەوەی، بە دڵ و بە گیانیش، لە هەر دووکیانەوە نزیکبووە، پێنج خشتەکیی لە سەر هۆنراوەکانیان دارشتووە، کاتێ گیانی پاکیشیان، بە دایکی نیشتمان بەخشیوە، گەرمەشینی بۆ کردوون و چەن هۆنراوەیەکی بۆ گوتوون.

جا گەر « قانع »، هێندە بۆ کورد نەسووتایە و بۆ « کوردستان »ە بندەسەکەی بێ ئارام نەبووایە، هەڵبەتە نەیدەگوت:

کوردە! ئەم سەرمە، سەرێکە پڕ لە سەودای نیشتمان
چاوەکانم، بۆ کزی کوردانە، ئەشکی دێتەخوار
ئەم دەمەم هەر ئەو دەمەس، هاواری هۆزم پێ ئەکرد
گوێم هەر ئەو دوو گوێیەیە، ئەیبیست سەدای گیان و زار
دەستەکانم، هەر بە ئاهوناڵەوە، ئەمدان لە یەک
گەه لە تەپڵی سەرمان و گاهێ سینەی پڕ جەخار
پەنجەکەم ئەو پەنجەیە، کاتێ کە پێنووسی ئەگرت
شیعری کوردیی پێ ئەنووسی، هەر لە یەک تا هەزار
دڵ هەر ئەو دەنکاڵە گۆشتەس، دائیما پڕ بوو لە زووخ
جەرگەکەم چەشنی کەبابە، بۆ کزی کوردی هەژار
لاقەکانم، هەڵگری لاشەی زەبوون و پڕ خەمم
یا بە شوێن نانا ئەڕۆیی، یا لە دەس دوژمن فیرار
« قانعا »، ئەم دەردیسەرییە، هەر بە تەنیا تۆ نەبووی
ئیشی هەر وا داخ و دەردە، چەرخی کۆنەی ڕۆژگار «5-4»

یا گەر وا نەبووایە، « قانع »ی هۆنەر، ڕای نەدەسپارد، ئەم چوارینە لە سەر گۆڕەکەی بنووسن:

نەبوو لە « کوردستان » ڕۆژێ، سەرۆکێ یاخو خەمخوارێ
هەمیشە بۆ ئەبێ کوردان، بەلا و ناسۆری لێ بارێ
ئەگەر مردم، لە سەر قەبرم بنووسن، تو خوا یاران
شەهیدی عیشقی میللەت بووی، کەچی نەتدی پەلامارێ «5»

یا گەر، زۆر شانازیی بە کوردێتیی خۆیەوە نەکردایە، هەڵبەتە نەیدەگوت:

به دەستی خۆم نییە وەڵلا، لە دیوانی خوا کوردم
لە ناو شێخ و بەگ و میر و مەلا و شاه و گەدا کوردم
تەماشای جەوهەری من کەی، ئەزانی ئاشکرا کوردم
« بە کوردیی بووم و خوڵقاوم، هەتا ڕۆژی جەزا کوردم
لە سەر ئەم بیرمە، ژینم، ژیانێکی حەقیقەتە » «188»
پاشان گوتوویەتی:
وەتەن! دێوانەکەی خۆتم، بەلاگەردانی بەر پێتم
ئەگەر بێتو قبوڵمکەی، بە دڵ سەربازی سەر ڕێتم
جگەرسووتاوی لاوانی، بەبێ ماڵ و بەبێ جێتم
« لە باخی عیشقی میللەتدا، فیداکاری نەکەم شێتم
فیداکاریی لە سەر ڕێی هێرشی سەیلی موحەبەتمە » «189»
« قانع »، هۆنراوەی « پەرۆشی دڵ »ی، بە چوارده نیوەدێڕ بۆ ڕازاندووینەتەوە و دەربارەی باری دواکەوتوویی و داماویی کورد گوتوویەتی:
ئەی کوردی سەراسیمە، لە هەر ژوور و لە خوارا
وەی سەرکز و ئاشفتە، لە دیهات و لە شارا
من چۆن نەگریم! هێندە کز و خوار و زەلیلی
سەر تا بە قەدەم، غەرقی لە ناو تۆز و غوبارا
ئەی کۆمەڵی کوردانی هونەروەر! چە عەجایەب
بێ ڕەونەقن ئەمڕۆ، لە هەموو سوچ و کەنارا
کوێستانی وەتەن خوێنە برا، ئەمڕۆ شەتاوی
پارە جگەری کوردە، گوڵاڵەی لە بەهارا
کوا غیرەتی مەردانە، لە بۆ کاکی عەشایەر؟
کوا جوورئەتی شێرانە، لە ناو چیخ و دەوارا ؟
زۆر عەیبە، لە بۆ لاوی وەتەن، بەرگی « چویتلی »
بێگانە لەگەڵ « خوشکی »، لە سەر خۆی لە حەسارا
« قانع » بەسە ئەم شینە، بە تەنیا و بەبێ کەس
خۆ کردە، نەخوا کردە، کە هەر کوردە لە تارا !! «14»
« قانع »، لە هۆنراوەی « شیوەنی نیشتمان »دا، بە چوارده نیوەدێڕ هۆنراوە، هەستی دەروونی وروژاوی پڕ لە داخی خۆی دەربڕیوە و زۆر بە کوڵودڵەوە، فەرموویەتی:
هەور بەختی « کوردستان »ە، شیوەن و گریان ئەکا
ناڵەناڵی کوردەکانە، جەرگ و دڵ بوریان ئەکا

دەنگی قیژوهوڕی خەڵقە دێت، لە ژێر چەرخی زەمان
ئاهی مێردکوژراوی کوردە، عالەمێ وێرام ئەکا 1
دووکەڵی قرچەی دەروونی بێ جل و بەرگ و ژیان
بوو بە هەور و وا بەسەر کێوانەوە، سەیوان ئەکا
هێندە جاری بوو، لە چاوی کوردستان » فرمێسکی خەم
بێ تەماشاکەن! هەزاران « تانجەرۆ » سیروان ئەکا
بۆ حەڵاڵە ماڵی کورد و بۆچی فەرزە کوشتنی؟ 2
دەک خەجاڵەت بێ « درۆزن! »، چۆن وەها پیلان ئەکا 3
کەس نەڵێ لافاوی ئاوە، ئاوی سووری شیوە سوور
خوێنی ئاڵی بەندی جەرگە، شیوەنی « بابان ئەکا
« قانعی » فیکری بە جارێ، سەرف ئەکا بۆ هۆزەکەی
نەک وەک « یارۆ! » خەیاڵی سەرفی چا و قلیان ئەکا 4 «15»
هەروەها، « قانع » گەلێ جار، لەگەڵ « وەتەن » گفتوگۆی کردووە و هاواری لێ کردووە. لە هۆنراوەی « دەردی دڵ »دا، بە شازدە نیوەدێڕ، زوخاوی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتووین و گوتوویەتی:
ئەی وەتەن! دەردت لە دڵما زامی سەد خەنجەر ئەکا
بۆ برینی جەرگی لەتلەت، ئێشی سەد نەشتەر ئەکا
چۆن بە قوربانت نەبم! بۆ مەنزەرەی پڕ قیمەتت؟
دڕکوداڵت، تف لە لالە و سۆسەن و عەنبەر ئەکا
گەرمیانت، دەک نەناڵێ بۆ هەوا شیرینەکەی!
قامەتی گەورە کچانی، گەپ بە نەیشەکەر ئەکا 5
دوو شەتان و قەڵبەزەی بەفراوی شاخ و داخەکەت
بێ درۆ وەڵڵا، لە ئاوی زەمزەم و کەوسەر ئەکا
ئەی وەتەن! خاکت بە حوری دەسکەوێ بۆ تاجی سەر
تازە کێ مەیل و خەیاڵی تاج، یا ئەفسەر ئەکا
ئەی وەتەن! داخی گرانم ئەو کەسەی تۆی دا بە شوو 6
دیقەتی ڕیشی ئەدەی، عەینەن لە جادووگەر ئەکا

---

ئەم چەن نیوە دێڕانە، لە « گوڵاڵە »دا، بەم جۆرە تۆمارکراون:
1. ئاهی مەزلومانی برسی عالەمێ وێران ئەکا. 2. ماڵی من یا بۆچی فەرزە کوشتنم.
3. درۆزن: مەبەسی پیاوێکی ئایینیی گەورە بووە.
4. یارۆ: خاوەن دیوەخانێکی بە دەسەڵات بوو، قسەی هەبوو، بەڵام کرداری نەبووە.
5. نەیشەکەر: قامیشی شەکر. 6. ئەو کەسەی وا تۆی فرۆشت.

ئەی وەتەن! نانت حەرامە بۆ ئەوەی ڕۆژی مەصاف
کۆ لە تەییارە و بریقەی نێزە و پەیکەر ئەکا
ئەی وەتەن! یاخوا بژیت بۆ ئیفتیخاری « قانیعی »
« قانع »یش یا خوا بژی، چوون سنعەتی گەوهەر ئەکا «22»
« قانع »، بە چواردە نیوەدێڕ، لە هۆنراوەی « قوربانی خاک »دا گوتوویەتی:
قوربانی ئەم خاکەیە، ئەم ڕۆحە لە بەرما
سۆزی دڵی پڕ دەردە، کە خولیایە لە سەرما
ئامادەی مەیدانم و ئەم بەرگە کە پۆشیم
کفنە! نەوەکوو چاکەت و پانتۆڵە لە بەرما
کورد کوردە، هەموو فیکری دڵم ڕۆژی سکونەت
کورد کوردە، هەموو ویردی زمانم لە سەفەرما
هێندم بە کزی دیوە، لە ئەربابی ولایەت 1
خەوفم نییە ئەسڵەن، لە دووسەد گێژی خەتەرما
من هات کە نەبینم، سەفی لاوانی وەتەن دۆست 2
خێری نییە ئەسڵەن، لە هەموو نووری بە سەرما
بۆ دەفعی عەدوو، نامەوێ شمشێر و کڵاوخود
دوژمن بە خوا غەرقە، لە خوێناوی جگەرما
من هیچم کە لێ نایە، مەگەر هەر وەکوو « قانع »
شیوەن بکەم و لیتەی ئەم خاکە بە سەرما .. «23 - 24»
« قانع »، لە هۆنراوەی « خاکت بە نرخە »دا، بە چواردە نیوەدێڕ هۆنراوە، بە سەر خاکی « کوردستان »ە شیرینە خۆشەویستەکەیدا هەڵداوە و گوتوویەتی:
کوردە! وەسفی « کوردستان »ت، خۆشترە تا سەد کیتاب
سیاچەمانە خۆشترە بۆ تۆ، هەتا چەنگ و ڕوباب
شۆڕشی قەلبت ببێ و گوێ ڕاگرێ بۆ دەنگی نەی
جەرگی بەدکۆی « کوردستان »ت، هەڵئەقرچێ وەک کەباب
دەنگی شمشاڵ و خرۆشی دەف، بگاتە هەر دڵێ
حاصڵی « کەشف ئەلقبور »ە، ڕۆشنە زومرەی عەزاب
ئافەرم بۆ تۆ وەتەن، وا خاک و خوڵت گەوهەرە
غەیرە مەحسوورە تەعامت، زۆر و بێ حەد و حیساب

---

لە « گوڵاڵە »دا، بەم جۆرە نووسراون:
1. ئەربابی: ئەشرافی. 2. من هات کە سەفی عەسکەری کوردانە نەبینم.

من له دنیادا، هەوارم « ماڵە گەورە » و « شێرە » بێ *
ڕۆژی مەحشەر، چاترم بۆ دەفتەر و نامە و کیتاب
مامۆساکانمان ئەڵێن: دنیا نموونەی ئاخرە
تێبفکرێ خۆت، ئەزانی کێیە حازر بۆ عەزاب
ئابتتکرد « قانعا »، کوردان لە گشت کەس
موژدەبێ بۆ کوردەکانی، هەرزەکاران و شەباب «42 - 43»
« قانع »، لە هۆنراوەی « ئەی کوردە !»دا، بە شەش پێنجینە و لە سەر ئاوازی
هۆنراوەیەکی « موفتیی پێنجوێنیی » گوتوویەتی:
ئەی کوردە، دە با بەسبێ، ئیتر باری ڕەزالەت
حاصلکە، لە ئەم عومری خەساراتە نەدامەت
گوێت شل مەکە تۆ، بۆ وتەی پوچ و سەفاهەت
« ئەی سەر بەسە، تا کەی لە سەرت ماوە جەهالەت
چاو هەڵبڕە نەختێ، بەسە ڕەفتاری قەباحەت »

سەد داخ و دوو سەد دەردە، کەوا عومرت بە بادە
تۆ سەرکز و داماو و هەموو دوژمنت شادە
لەم سوودە خصوصیەتە، کە بێ سوودە دە لادە
« حەیوانی ئەگەر، جێ لەوەڕی خۆشت مرادە
یا، گەر بەشەری بێرە سەفی عیلم و درایەت »

بڕوانە، لە ئەحواڵی هەموو عیلم و شەریعەت
تێکۆشێ، لە بۆ کەشفی هەموو بەحری حەقیقەت
نوقسانی ئەبێ، چی بێ برا؟ عیلمی تەبیعەت!
« کەی کوفرە، ئەگەر فێری ببی سنعەت و حیکمەت؟
کەی مەنعە لە تۆ، هەر دوو بە ئاسار و بە ئایەت؟ »

پیاوێ نەنوێ، دائیمە هەر زیکری خوا کا
ڕۆژ ڕۆژوو و قورئان و بە شەو بانگ و سەڵا کا
باوەڕ مەکە قەت، نانێ بە ئەم جۆرە پەیاکا
« بایع نییە خالق، کە ڕزق بەیع و شیراکا
ئاسانە بباریێ بە دوعا، نەبووە بە عادەت »

* « ماڵە گەورە » و « شێرە »: دوو هاوینەهەواری نێوچەی « شلێر »ن لە « پێنجوین ».

ناسراوی وولاتانم و چاک دیاره، که من چیم
بێ سوود و بەبێ کەڵکم، وەکوو توێکڵی دار بیم
چون بێ هونەرم، مووەدەتی ئەییام بە برسیم
« تەعقیبی غەرەز ناکەم و دوژمن بە کەسێ نیم
نادانە نەقیزەی ئەوێ، دانا بە ئیشارەت »

ئەی کوردە! هەموو شیوەنی من، گشتی بە تۆیە
بۆ تۆیە، کە « قانع » جگەر و قەلبی بە سۆیە
بڕوانە لە ئەشعارم، ئەگەر هۆشت بە خۆیە
« مفتیی، غەزەلت توبی خوا، کامی درۆیە؟
بەس خۆت کە بەجێی تانە و تەکدیر و مەلامەت » «47 - 48»

نەک هەر تەنیا « قانع »، بەڵکوو، زۆربەی هۆنەرە کلاسیکیی و کەمەکێکیش لە هۆنەرە نوێخوازەکانی کورد، بە سەر چەن ناودار و دەسەڵاتدارێکی کوردی وەک: « سەلاحەدینی ئەیوبیی » و « کەریم خانی زەند »یاندا هەڵداوە. هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەو کەڵەپیاوانە، بە ڕەگەز کورد بوون. ناو و ناوبانگیان، لە جیهاندا دەنگیداوەتەوە. کوردیش، وەک نەتەوەیەکی بندەس و دەروون نەخۆش، لە بەردەم دۆست و دوژمانانندا، لە لایەکەوە، شانازیی پێوە کردوون و ناوی بردوون، گوایە، کورد پیاوی قارەمانی وای تێدا هەڵکەوتووە! لە لایەکی دیکەشەوە، لەبەرئەوەی تا ئێستە، کورد خۆی هیچ نییە، بە خراپترین شێوە دەچەوسێنرێتەوە، شانازیی بە ڕیشی مەردانەی ئەوانەوە دەکا، خۆی بە ئازایەتیی و دەسەڵاتی ئەو سەردەمەی ئەوانەوە بادەدا، منەت بە سەر نەتەوە سەردەکانی عەرەب، فارس و گەلانی ئیسلامدا دەکا، گوایە، گەر کورد نەبووایە، ئەو گەلانە و ئایینیی ئیسلام، ئێستە تەنیا ناویان دەما! ئەگینا لە ڕاستییدا، ئەوانە هیچیان بۆ کورد نەکردووە، بەڵکوو، هەلە مێژووییەکانیان لە دەس کورد داوە، دوژمنەکانی کوردیان زیندووکردۆتەوە، لە بری ئەوەی، ڕوو لە ماڵە کاولەکانی خۆیان بکەن، ڕوویان لە کەلاوە ڕووخاوەکانی مزگەوت کردووە!

سەیر ئەوەیە، « قانع » هێندە نەتەوەی کورد و خاکی « کوردستان »ەکەی خۆشویستووە، ئیدی بێ ئەوەی بزانێ، ئەو پیاوە ناودارانەی بە ڕەگەز کورد بوون، چۆن پشتیان لە زێد و نیشتمانی خۆیان کردووە، چۆن ڕاژەی زمان و کەلتوور و ژیانی نەتەوە سەردەسەکانی « کوردستان »یان کردووە، هۆنراوەی بۆ هۆنیونەتەوە، شانازیی پێوە کردوون، تەنیا لەبەرئەوەی کورد بوون!

بۆ نموونە: لە هۆنراوەکانیدا، چەن جارێ ناوی « سەلاحەددینی ئەیوبیی » بردووە. بە تایبەتیی، لە هۆنراوەی « شانازیی بە سەلاحەددینەوە »، بە چواردە نیوەدێڕ باسیکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە یەکێکی وەک « سەلاحەددین »، ئەو هەموو توانا و دەسەڵاتەی هەبووە، کەچیی، هیچی بۆ کورد نەکردووە! با بزانین « قانع » چۆن باسیکردووە:

تۆ نەمردووی، ئەی سەلاحەددینی ئەیوبیی لەقەب
هەر بژی، ئەی فەخری کورد و حاکمی موڵکی عەرەب
تاکوو تۆ بووی، لاوەکانی « کوردستان »م دەرئەچوون
بۆ زەکاتی موڵکی « شام » و خەرجی بازاڕی « حەڵەب »
زیندوو بوووبووینۆ، بە جارێ شارستانیی و دێنشین
ڕەعیەت و شوان و سەپانم، کەوتبوونە سەر تەرەب
ئێستە بێ تۆین، بۆیە وا بێ ڕەونەق و جاوە و جەلاین
بووین بە گاڵتەجاڕی خەڵق و کەوتووینە بەر عەتەب
وەرنەوە ئەی نیشتمانیی، با هەموو عەهدێ بکەین
بۆ فەنای دوژمن، بە جارێ بێینە مەیدانی غەزەب
من ئەزانم، هەر سەعاتێ دەسبدەینە مودەعی
ئێمە هەر وەک ئاگرین و ئەو وەکوو کۆگای حەطەب
« قانع »، بۆ کوشتنی نیشتمانفرۆش ئامادەبە
خواە شێخی « بایەزید » و خواە نەفسی « بولەهەب »  «**40 - 42**»

هەروەها، لە هۆنراوەی « سەلام لە کوردستان »دا، « قانع » بێ ئەوەی بزانێ، یەکێکی وەک « کەریم خانی زەند »، چی بۆ کورد کردووە، هەر لەبەرئەوەی بیستوویەتی، لە بنەڕەتدا کوردبووە، ئیدی بە سەریدا هەڵداوە و شانازیی پێوە کردووە. لە کاتێکدا، هیچی بۆ کورد نەکردووە، بەڵام، زۆری بۆ نەتەوەی فارس کردووە، دەوڵەتی بۆ دامەزراندوون، « ئێران »ی لە دەس ئاژاوە و پشێویی ڕزگارکردووە. کەچیی تا ئەوڕۆش، هێندێ کورد هەر شانازیی پێوە دەکەن و بە سەریدا هەڵدەدەن. ئەوەتە، « قانع » بە دە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

« کوردستان !» سەد سەلام لە کوێستانت
مەرحەبا، مەرحەبا لە گەرمیانت
سەر و ماڵم، فیدای « ئەیووب »ت
گیانی من بێ، بە قۆچی « بابان »ت
کوانێ، « جەمشید » و « ڕۆستەمی زاڵ »ت؟
کوا، « کەریم خان »، خان خانانت؟

کوانێ، « شێخ قادر » و « شەریف چەلەبیی »؟
کوانێ، چەچەی سەفشکێنی مەیدانت؟
« کوردستان !» تۆ بەهەشتی عەدنانی
سەد وەکوو « قانع »ی سەناخوانت «49»

لە هۆنراوەی « بێ کەسی »یدا، بە دوازدە نیوەدێڕ گوتوویەتی:

لە « وان » و « ئەرزورۆم »ۆ، تاکوو « شامات »
هەموو دڵتەنگ و پەست و بێ دەنگ و مات
لەبەرچی، ڕۆژی هیوای « کوردستان »م
نەبوو جارێ بڵێن: « ئۆخەی » کە هەڵهات
لە بۆ هەر کەس، هیوایەک ئارەزوو بوو
لە بۆ کوردان نەبوو، هیوا و فتوحات
بە بیری هیچ و پووچم، وام تەمایە
کە تازە دابنێم، بونیادی باخات
لە بۆ ئێمە نەبوو، قەت ئینقلابێ
کە بەڵکوو سەرکەوین، تەیکەین مقامات
بناغەی زیندەگانیمان لەدەسچوو
وەکوو « قانع »، نە دینمان بوو، نە تاعات «53»

« قانع »، لە هۆنراوەی « دیتنی ئاڵا »دا، بە حەوت پێنجینە، تا توانیوێتی، پڕ بە دڵی خۆی، گۆرانیی بۆ ئاڵای « کوردستان » لە « مهاباد » چڕیوە، داوای تەمەنی درێژیی، بۆ پێشەوا « قازی محەمەد » کردووە و گوتوویەتی:

سەد شوکور، وا من نەمردم، تا کە دیم ئاڵای کورد
کەوتە بەر چاوم بە بەرزیی، سوورەت و سیمای کورد
بازبوو، دورابوو، دیدەی نەرگسی شەهلای کورد
مژدەبێ، ئەمڕۆ کە بەربوو، چاوی پڕ بینای کورد
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

چەن زەمانێکە ئەسیر و ژێرچەپۆکەی عالەمن
سەرکز و بێ قیمەتی، بەرچاوی زادەی ئادەمن
دیلی زیندانی نەزانین، مەستی بادەی ماتەمن
بەنگکەنە یەکتر هەمووتان، چونکە ئەمڕۆ بێ خەمن
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

بانگکەنە ئەرواحی پاکی « ئەردەڵانیی » نەڕەشێر
یا بڵێن: « کاوە » لە کوێی؟ ڕۆژی هەزار یادت بەخێر
بێننە بەرچاوی خۆتان، هەڵمەتی « زەند »ی دلێر
هەر بڵێن: ئەم شیعرە، ئەهلی کۆهسار و گەرمەسێر
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

قەت لە بیرت دەر نەچێ کوردە، زرەی زنجیری پێت
تۆ تەماشاکە، لە دەس بێگانەکان چی هاتە ڕێت؟
کوانێ بابی گۆڕ غەریب و مامەکەی بێ شوێن و جێت؟
کوردە! چۆن تۆ دڵ برینی، شلکە بۆ ئەم شیعرە گوێت
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

نەوبەتە، باراشت لێکە، ئاشی گێتی کەوتە گەڕ
شێر نەترساوە لە بەزم و شۆڕشی مەیدانی شەڕ
گوێ نەدەی هەرگیز، بە هاشەوهوشەی ئەربابی زەڕ
هەڵگرە ئەم دەستە شیعرە و دابنێ سەد سەوڵی تەڕ
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

سەد شوکور، وا « ئەرزڕۆم » و « وان » و « بتلیس » و « چەچان »
دەستی دایە دەستی « هەرکیی »، کوردی « زازا » و « بەبان »
شاری « خەرپووت » و « جەزیرە » و مەنتیقەی « بەرزان »یان
با، بەستە و چەپڵە بێژن، دەمبەدەم شام و بەیان
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد

« خانەقین » مژدەی ئەدا، ئەمڕۆ بە « دیاربەکر » و « هەرات »
پێچەوانەی دەوری پێشوو، ڕۆژ لە شیمالۆ هەڵات
سەیری تیشکی کە! چلۆن ڕووناکیی خستە سەرووڵات!
ئەم وتارە بیری دڵ بێ، چاکە بۆ ڕێگەی خەبات
هەر بژی ئاڵای کورد و پێشەوای زانای کورد «61 - 62»

« قانع »، لە هۆنراوەی « با بنووسم »دا، بە چواردە نیوەدێڕ گوتوویەتی:
من کە کوردم، با بنووسم دەفتەر و دیوانی کورد
تا، بەڵەدبن ئەو کەسانە، موددەعین میزانی کورد

هەر کەسێ، ئەسپی ئەجەل تاودا لە سەر عەرەسەی فەنا
پێ بنێتە بەزم گاھ و مەعرەکەی مەیدانی کورد
کێ ئەڵێ نەم چەشتووە، نووکی ڕمی کوردی نەژاد
ڕانی دەرخا، تا ببینم داغمەی شێرانی کورد
قوڕ بپێوێ دایکی ئەو شەخسە، ئەڵێ: من موددەعیم
چۆن خەلاسی بۆ ئەبێ، هەرگیز لە دەس مەردانی کورد
ئاشکرایە هەوڵی کورد ئەمڕۆ، بە بانگی بەرز ئەڵێم
بێن تەماشاکەن عەزیزم، مەکتەب و عیرفانی کورد
سەیری « لوبنان » و گەڕانی « چین و ماچین » بۆ بکەم
تا ببێ بەفراو و مێرگ و چیمەن و کوێستانی کورد
مەزهەری لوتفی خوایە، خاکی کوردان « قانعا »
تۆ ئەزانی، چی بنووسی، دەفتەر و دیوانی کورد «66»
« قانع » لە هۆنراوەی « ئازار و داوا »دا، بە بیستودوو نیوەدێڕ گوتوویەتی:
بێ تەماشاکە، براکەم کردەوە و ڕەفتاری کورد
جا، سەری خۆت باش لە قوڕنێ، بۆ دڵەی خەمباری کورد
چۆن نەناڵێ دڵ لە داخا؟ چۆن نەگریە چاو بە خوێن؟
چۆن نەبرژێ دڵ، بە دەردی گەرمی بێ تیماری کورد؟
چویتە سەر کورسی براکەم، کوردی چی و نیشتمانی چی!
خۆت بە خۆشیی و خۆش بژی، مەنوارە بۆ زاماری کورد
ڕۆنی سەر، سابوونی لۆکس، قۆندەرەی سوور و سپی
بەستە، بۆ تەگبیری هۆزی برسیی و بێکاری کورد
دەستی من داوێنی تۆ، دیوارەکەت باش بۆیەکە
با، بە شەو سەرمای نەبێ، منداڵی بن دیواری کورد!
حەوشەکەت باخچەی نەبێ، کۆمەڵ بەچی ڕزگارئەکەی؟
وێسکی نۆشی گیانی خۆت کە، چاکە بۆ ڕزگاری کورد!
تۆ، بە دەم هیچت نەهێشت و سەد وەکوو « غاندی »ت شکان
ئافەرینم، بارەکەڵڵا، تێغی جەوهەرداری کورد
کاتێ تەشریفت، لە ناو جۆلانەکەت خۆت ژیرئەکەی
گوێ نەدەی هەرگیز، بە ناڵە و ئایوئۆی بیماری کورد
وا نزیک جەژنە، سەراپا جل لە بۆ خێزانەکەت
با ملی بشکێ، حەماڵ و ڕەنجبەر و جوتیاری کورد
دەی تەلەفۆن کە، بزانە « منحە »کەت وەرناگری

خوا ئەکا، خۆت خۆش ئەبی، بمرێ هەموو هوشیاری کورد
« قانعا »، خۆ تۆ لە لای خۆی، تەرکی نووسینت ئەکرد
وا بزانم، پێت ئەنووسێ، ناتەواویی کاری کورد «68»

« قانع »، لە هۆنراوەی « سوودی وولاتم »دا، وەک زانایەکی جیۆپۆلیتیک بیریکردۆتەوە، جگە لەوەی، باسی سامانی ئابووریی « کوردستان »ی کردووە، کە بە یەکێ لە فاکتەرەکانی هێزی نەتەوە دادەنرێ، لە هەمان کاتیشدا، بە بیستوچوار نیوەدێڕ هۆنراوە، فەرهەنگۆکێکی هەمەجۆرەی ڕەنگاوڕەنگی سەوزە، میوە و بەرووبوومی کێڵگەی بۆ ئامادەکردووین و گوتوویەتی:

سوودی خاکی « کوردستان »م، چەن هەزاران دەرهەزار
بۆت بنووسم کاکی کوردم، میوەیەکی بێ شومار
تووتن و گەنم و برنج و هەرزن و زەڕات و جۆ
گەنمەشامیی و دێمیلە، هەم داڕوجان و گسکەشار
باسخ و نارنج و لیمۆ، پرتەقاڵ و هەم ترێ
کاڵەک و شووتیی و ترۆزی، کوولەکە و سەوزەخەیار
چۆنەر و سلق و شوێت و بامێ و کونجیی و پەموو
شێلم و ماش و تەماتە، باینجان و کالیار
نۆک و نیسک و پەڕشە و پاقلە و پەتاتە و لۆبیا
سێو و هەرمێ، قۆخ و قەیسیی، گوێز و کشمیش و هەنار
کاهو و پیاز و کەلەرم و تەرخوون و بن عەرزیلە
کاشمە و کۆڵ و بناو، سوورهەڵاڵی لا نزار
مێو و سنجوو، کێکف و ژاڵە و گزیچار و شەهێن
گۆێژ و چوالە و بەڕوو، پەڵک و بەڵاڵوک و چنار
داری بی، پێنج تایەفەن، لازم نییە، ناویان ببەم
خاوەنی سیونۆ بەری خاوەن، ڕەواجە مازودار
گزگل و خڕنووک و مازوو، پانکە و سیچکە و کەڵنج
پۆزەخووگە و هەمزە ئاغا، هەوربرد و شاخدار
بەرکەڵا و تسقل و سەوزالیی و نیسکە و گرێ
کارگ و قژگە و دەمووکە، سێفەڵووکەی ئاودار
جەوت و شۆکە، زۆڵەک و شینکە و بەڕوو، هەژگ و گەڵا
هەم گەزۆ و زوخاڵ و یبفوو، چاکترینیان بارەدار
« قانع »ی کاسب نییە، بۆیە کەمی لێ زانیوە
بۆ ئەوانی تر بپرسە، لای پیاوی اەسبکار «78»

« قانع »، له هۆنراوەی « پەیمانی سەعدئاباد »دا، هەم وەک هۆنەر و هەم وەک رامیارێ، هەڵسوکەوتیکردووە. بۆیە، بە بیستودوو نیوەدێڕ هۆنراوە، باسی ئەو پەیمانە خراپەی کردووە، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی، لە مەترسیی و زیانەکانی پەیمانەکە ئاگادارکردۆتەوە. بەلام، هەرگیز تووشی ڕەشبینیی نەبووە، بەلکوو بە پێچەوانەوە، زۆر بە گەشبینییەوە، تەماشای دواڕۆژی کوردی کردووە و گوتوویەتی:

دوژمنان لەم ڕۆژەدا، فیکری چەپەڵیان خستەکار
کەوتەخۆ کۆنەپەرستیی، بۆ قەلاچۆی کوردەوار
ڕێبڕانە، کوردقڕانە، کێو و کەژ خوێناوییە
فیتنە وەک ئاگر ئەبارێ، بۆ گلانی شۆڕەسوار
چەک لە شان بوون میللەتی کورد، بۆیە دوژمن کەوتەخۆ
کەوتە جرتوفرت و پەیمانبەستنێکی نالەبار
شاری « سەعدئاباد »ی بەدفەڕ، بوو بە مۆڵگەی دوژمنان
کوندەبوو، شمقاڕەکوێر و کەمتیاری لا نزار
سێبەسێ کۆبوونەوە، وا ئەنجوومەن ڕازایەوە
بۆ قڕانی میللەتی کورد، مۆرکرا عەهد و قەرار
پاڵەپەستۆی مەینەتە ئەمڕۆ، بە سەر کوردا گلا
نیشتمانی کوردی کردە، جێگە ڕاو و کار و زار
عەهدی « سەعدئاباد »ی شووم و حوکمی پۆلیسی ڕزیو
مەزبەحەی خوێنڕشتنی، بۆ « کوردستان » هێنایە کار
میللەتی کورد، چەندەها پیلانی وای نا گۆڕەوە
چاوی ناترسێ لە نێزە و هایوهوتی بێ شومار
« ....... و تاران و .... »، مەنبەعی زوڵم و ستەم *
قوڕ بە سەرتان، میللەتی کوردە ئەتانکا یەختەسار
هێزی میللەت، شۆڕشێکی حەقڕەوا دێنێتە ڕوو
تۆڵە وەرئەگرێ، لە « سەعدئاباد »ی لانەی گوورگەهار
قوڕ بپێوێ دوژمنی سێ قۆڵی، بۆ دواڕۆژی خۆی
تەختوتاراجی دەڕێنێ، لاوی کوردی هوشیار «90»

« قانع »، لە دێڕە هۆنراوەیەکدا دەڵێ:

ماڵ و حاڵم بۆچیە، گەر میللەتم زیللەت بژی؟
تاجی سەرشۆڕیی فڕێدە، تۆش وەکوو میللەت بژی «95»

* مەبەستی لە « ئەنقەرە، تاران و بەغدا » بووە.

« قانع »، له هۆنراوەی « شیرەزای کوردم »دا، شانازیی به نەتەوەکەی خۆیەوە کردووە، کوردی به ئازا داناوه و به حەوت دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

هەموو کەس شارەزای من بێ، که شێر و شێرەزای کوردم
به داییم، گوێ بەر ئاوازی دەلیل و ڕەهنومای کوردم
خوا نەیکا، ئەگەر دەردێ ظهوریکرد له « کوردستان »
وەکوو قۆچی خەلیلوڵلا، به قوربان و فیدای کوردم
فیدایی من له بۆ کوردان، خصوصیی قەت نەبینراوە
پچووکی بەگلەر و شێخ و مەلا و شاه و گەدای کوردم
ئەجەل دەستی من و داوێنی تۆ، فریاکەوە زوو بێ
به خۆم و ڕۆحمۆ حازر، له بۆ ڕەدی بەلاّی کوردم
چ باخێ پڕ له گوڵ، هەرگیز نەبینراوە بەبێ بولبول
منی سەودازەدەش، وەک بولبولی شاخ و چیای کوردم
له خزمەت با بەجێمابم، به تەیرێ هەر ئەبم مەعلوم
که وابوو، هودهودی شەهری « سلێمان »ی سەبای کوردم
له سوتانا چ بێ باکم، چۆن پاش مردنم « قانع »
له چاوی ئەهلی دانشدا، وەکوو ڕۆح توتیای کوردم



« قانع »، له هۆنراوەی « خاکی وەتەن »دا، به شەش پێنجینه، داخ و مەراقی خۆی، بۆ دایکی نیشتمان هەڵڕشتووە و گوتوویەتی:

ئەی خاکی وەتەن! قوڕبەسەر و بێ سەر و پا خۆم
بۆ بێ هونەریی ئەهلی وەتەن، شێتی جەفا خۆم
جێماوە وەتەن، بۆ وەتەنم غەرقی فەنا خۆم
پەستر له هەموو هاوسەر و هاوماڵ و برا خۆم
دوورکەوتە و ئاوارە، له هەر سەیر و سەفا خۆم

ئەی خاکی وەتەن! بۆچی نەما، غیرەتی شێران؟
ئەی خاکی وەتەن! بۆچی نەما، بەزمی دلێران؟
کوا سەڵتەنەتی عێلی بەبە و شاکەل و شیروان؟
بۆ مەسلەخی پڕ خوێنی ئەسیران و هەژاران
دەک لاڵ و کەڕ و کوێر و کز و شێخ و مەلا خۆم

ئەی کاغەزی تەرفیعی وەتەن! بۆچی دڕاوی؟
ئەی ڕەونەقی بازاڕی وەتەن! بۆچی نەماوی؟

ئەی خەنجەری شێرانی وەتەن! بۆچی شکاوی؟
ئەی خاکی وەتەن! چونکە وەها خەستەکراوی
گەر شینت نەکەم، ڕووڕەشی دیوانی خوا خۆم

بۆ سەرکزیی ئەم هۆزە، دڵ و جەرگ برینە
بۆ شینی وەتەن، چاوی خیرەد پڕ لە گرینە
بێ شێرییە ئەمڕۆ، کە وەها بێشە حەزینە
نووری بەصەری ئەهلی هونەر، تا نەبێ شینە
بێ ئالەت و شمشێر، لە مەیدانی وەفا خۆم

ئەی خاکی وەتەن! بۆچی وەها کوێرە وەجاخت؟
پەژمووردە و بی ڕەنگە، هەموو چیمەن و باخت
پڕ لە ستەم و جەورە، یەقین دەربەن و شاخت
ئەی خاکی وەتەن! ویردی شەو و ڕۆژە لە داخت
بۆ بێکەسیی ئەم خاکە، دەسا بەندی بەڵام خۆم

« قانع » وەرە ئەم جارە، دەغەوغایێ بە پاکە
بۆ خاکی وەتەن، فەرزە بە دڵ ڕۆح فیداکە
پیراهەنی بەدی ناوی بە نامووس کەوا کە
سەفبگرە بە کوردان و لە چۆپی وە سەماکە
ئەو وەختە بڵێ: خاوەنی هەر بەزم و هەرا خۆم «128 - 129»
« قانع »، بە نۆ دێڕ، لە هۆنراوەی « چۆن نەگریم؟ »دا گوتوویەتی:
کوردە! چۆن نەگریم هەمیشە، بۆ کزیی و داماویی تۆ؟
چۆن قوڕی عالەم بە سەر خۆدا نەکەم، بۆ ناوی تۆ؟
ڕەنگی زەردی جەرگی تۆیە، من ئەسوتێنێ تەواو
شیعری من دەرمانی دەردە، بۆ دڵەی زاماری تۆ
خوێنی تۆیە، شەربەتی ڕۆژی جلووسی ئەجنەبی
سەیری دوشمن کە، لە شار و کوچە و بازاڕی تۆ
سەوزەگیای کارێزی پاشا، مێشکی باپیری منە
ئێستە وا فەرشە لە ژێر پێی، دوژمنی خوێنخواری تۆ
ڕۆحی « بابان »ە، لە گرد و مەقبەرەی « سەیوان » ئەڵێت:
« ڕۆڵەکانم! کێیە ئەو خەیمە لە ژووری شاری تۆ ؟! »

لاوی کوردم! مردنت زۆر چاترە تا ژینی وا
ئەجنەبی بێت و لە « گۆیژە » بێت بە فەرمانداری تۆ
خوێنی هاوخوێنت ئەڕێژێ، نۆکەری ئەگریتە دەس
هەی سەگم بەردایە زێڕ و لیرە و دیناری تۆ ..
یادگاری هۆزی « ماد »ە، داوەشێی بۆ مامەڵەت
لاپەڕەی مێژوو ئەنووسێ، لەعنەت و ڕەفتاری تۆ
« قانعا » گوفتاری تۆ شیرینە، یا شەکر و نەبات؟
کەتمی ناحەق بۆ بکەم، شیرینترە گوفتاری تۆ «**182**»
« قانع »، بە حەوت پێنج خشتەکیی، لە سەر هۆنراوەی کوردێ گوتوویەتی:
هەوای سەر شاخ و کوێستانم، پزیشکی دەرد و عیلەتمە
خوا ئاوابێ ئەم خاکە، کە مایەی ژین و سیحەتمە
دە ڕەبی کوێری کەی هەر کەس، لە سەر فەوتانی جەنەتمە
« نیشانەی تیری زیللەت بێ، ئەوی بەدخواهی میللەتمە
دە غەرقی گێژی نەگبەت بێ، ئەوی دوژمن سەعادەتمە »

بە دەستی خۆم نییە وەڵڵا، لە دیوانی خوا کوردم
لە ناو شێخ و بەگ و میر و مەلا و شاه و گەدا کوردم
تەماشای جەوهەری من کەی، ئەزانی ئاشکرا کوردم
« بە کوردیی بووم و خوڵقاوم، هەتا ڕۆژی جەزا کوردم
لە سەر ئەم بیرمە، ژینم، ژیانێکی حەقیقەتە »

فیدات بم، کوردە بۆ خاکت، چ بێ عەیبە و چەنێ دڵگیر
ئەگەر خاکت نەسووتێنن، بە ناری حیللە و تەزویر
بەهەشتێکە کە ئیحتیاجی نییە هەرگیز، بە جۆگەی شیر
« وەتەن زۆر خۆشە، قەدری بێ نیهایەت نایەتە تەقدیر
لە لای عالەم، کە دۆزەخ بێ، بڵندتر سەد لە جەننەتمە »

تەماشای « پیرەمەگروون » کە، دەماخی چەندە سەر بەرزە
لە باخاتی تەبیعەتدا، گوڵاڵەی سەد هەزار تەرزە
تەماشای ئایەتی خواکەن، لە ئەوسافی وەتەن ڕەمزە
« بە بورهانی کەلامی حەق، بە دڵ حوببی وەتەن فەرزە
کەسێ مونکیربێ بەم قەولە، نەزانینی لە سەر خەتمە »

وەتەن! دێوانەکەی خۆتم، بەلاگەردانی بەر پێتم
ئەگەر بێتو قبوڵمکەی، بە دڵ سەربازی سەر ڕێتم
جگەرسووتاوی لاوانی، بەبێ ماڵ و بەبێ جێتم
« لە باخی عیشقی میللەتدا، فیداکاری نەکەم شێتم
فیداکاریی لە سەر ڕێی هێرشی سەیلی موحەبەتمە »

چ خۆشە زەحمەتی زۆر زۆر، لە پاشان ڕەحمەتی تیابێ؟
چ شیرینە دەوای تاڵی، بە شەرتێ سیحەتی تیابێ؟
نەبوونی خۆم و ئەولادم قبووڵە، عیززەتی تیابێ
« بە ڕۆحکێشانی خۆم ڕازیم، ڕوفاهی میللەتی تیابێ
بەبێ ژینی وەتەن، ژینم ژیانێکی مەزەلەتمە »

خوا! بۆ خاتری جەمعی وەتەن، خواهانی دڵپاکان
بە خوێنی ناحەقی کوژراوی، ئەشکەوتان و بن بەردان
بە حەقی حەزرەتی پێغەمبەر و سی جزمەی قورئان
« بژی کورد و بمێنێ، تا قیامەت خاکی « کوردستان »
بە عەونی ئەو خوایە، خالقی فیکر و تەبیعەتە » «**182 - 183**»
« قانع »، لە هۆنراوەی « بۆ چییە؟ »دا، بە یازدە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
من کە ڕۆڵەی کوردەکانم، توورک و تارم بۆ چییە؟
تا برای پشتیم ببێ، یاری لە مارم بۆ چییە؟
تا کلاشی بەنچنی ژێر مەحکەمی خۆم دەسبدا
قۆندەرەی تەسک و لار و خوارم بۆ چییە؟
تا کتێبی وەسفی خاکی « کوردستان » ئینشاببێ
وەسفی « ڕوکن ئاباد » و نەهری « ڕودبار »م بۆ چییە؟
تا سەبیلی زەرد و سووری فیتکە دووری خۆم ببێ
فلتەفلتی نێرگەلە و تۆپی سیغارم بۆ چییە؟
شەربەتی هەرمێ لەت و دۆشاوی شوکەم دەسکەوێ
ئارەق و تریاکی هەر وەک ژەهرەمارم بۆ چییە؟
نەی کە شمشاڵە عەزیزم، سەد گرامافۆن ئەژی
سۆزی شمشاڵم ببێ، من عود و تارم بۆ چییە؟
ڕانکوچۆغەم دەسکەوێ، چیمە لە فاسۆن و حەریر
جاوی خۆماڵیم ببێ، چیتی توجارم بۆ چییە؟

« بانیخێلان » ئاوەدانبێ، بۆ قەڵەم بۆ کوردەکان
تازە ئیتر، ئوچی پیسی بەدنیگارم بۆ چییە؟
تا ببێ بەفراو و مێرگ و چیمەن و ئێلاخی خۆم
ئاوی سوێر و دڕکەزەردەی گەرمەسارم بۆ چییە؟
تا تەماشای قامەت و لەنجەی کچی کوردم ببێ
حۆریی و غیلمانی سۆفی مفتەخوارم بۆ چییە؟
تا هەژاری نکتەگۆ، وەک « قانعی » پەیدابێ
دەفتەری ئەفسانە کۆنی، پڕ لە عارم بۆ چییە؟ «190»
« قانع » بە 5 پێنجخشتەکیی جوان، بە نیشتمانەکەیدا هەڵداوە و گوتوویەتی:
کوردستانە، بێشەلانی شێرەکەی مەیدانمە
خاک و بادی نیشتمانە، بێشکەی لاوانمە
کوردستانە، مەکتەبی وێژدان و هەم عیرفانە
دڕک و داڵی کوردسانە، سۆسەن و ڕیحانمە
گەرمەسێری کوردسانە، شەربەت و فنجانمە!

کێو و کوێستانی وولاتی کوردسانە جەنەتم
خاکی خاوەن ڕزقی کوردە، دایکی پڕ شەفقەتم
ئاوی سارد و نانی زۆر و نیعمەتی بێ زەحمەتم
کەی وەکوو خەڵقی لە خاکی خەڵقەدا پڕ مینەتم ؟!
هەر ئەڵێم: ئاوابی، یا ڕەب جەنەتولعەدنانە

قەسری فیردەوسی بەرینە، باخی هەنجیر و هەنار
خاوەنی حەوز و حەیات و مەڕ و جۆگە و چنار
کەوسەرم جۆگەی « دەلێن »ە، یا بناری « سەرچنار »
« چەمچەماڵ » و « بازیان »م، مەسکەنی شیرین سوار
بێ تەماشای شارەزوور کە، چاڵی دەغڵودانمە !

فەخری ڕازی بی، بەبێ کەس حوورمەت و قەدرت نییە
سەد کورورت بێ، کە خۆت ماقوڵ نەبی، سوودی چییە؟
موڵکی بێ خاوەن عەزیزم، هەر وەکوو داری بییە
با کەوانیش خۆش ببیکێ، موظطەری لۆیێ ژییە
کوا پیاوێ تێبگا، لەم شیعرە بێ مەعنانمە ؟ «192- 193»

« قانع »ی هونەرمەند، لە هۆنراوەی « نەورۆزنامـە »دا بە شێوەیەکی گەلێ جوان، بەهاری « کوردستان »ەکەی، بە باری ژێردەسیی کوردەوە گرێداوە و بە هەشت پێنجینە گوتوویەتی:

لاوی کورد نەورۆزە، ئەمڕۆ کاتی کشتوکاڵتە
کاتی سەیری دۆڵ و شیو و سەرکەژی خاڵخاڵتە
تا بەکەی، هەر ئارەزووی دانیشتنی ناوماڵتە
تا بەکەی، کۆڵکێشی خەڵق و پوش و دڕکوداڵتە
هۆشی نانی خۆت بێ، ئەمڕۆ کەوا سەرساڵتە

چاوی نووستن هەڵبڕە و بنوارە دەشت و کۆهسار
خۆت و گاجووتت بە جارێ، بچنە مێرگ و مێرغوزار
تۆ بەهێز و زۆری بازووت، ئەو بە شانی پڕ دەمار
بەرگی زستانی فڕێدە و هەستە بۆ سەر ئیشوکار
ڕاپەڕە، ئەم ڕۆژە، ڕۆژی خزمەتی منداڵتە!!

بێنە سەر مەیدانی غیرەت، بۆ ژیانی نیشتمان
دەستی یەکبگرن بە هیمەت، پشتی یەکبگرن جوان
دەنگی ئازادیی و برایی، با بگاتە ئاسمان
سەیری ئەم شاخ و چیایە، چۆن بە چاوی چاوەڕوان
چاوەڕوانی هەڵمەتێکی، ڕەنجی شان و باڵتە!!

لاوی خوێنگەرمم درەنگە، بێنە بەزمی هاتوو چوو
تێبکۆشین بۆ وەتەن، هەر تا دەرێنن ئابڕوو
چاوی بەرزۆکە و ببینە حاڵی خاکت زووبەزوو
نیشتمانت کانی زێڕ و زێڕە، بۆ دەستەی عەدوو
تۆ کە نانی جۆت ببێ، ئەو ڕۆژە جەژنی سەری ساڵتە!!

هەڵکە باڵی نیشتمانیی، بیری میللیی بێنە سەر
خوێنی بەدگۆی نیشتمانت، زوو بڕێژە بێ خەتەر
تا بە کەی، پەستیی و پەشێویی، ئەی گرۆهی پڕ هونەر
وا دراوسێ سواری با بوون، چوونە ناو کووڕەی قەمەر
تۆ تەریق نابیتەوە، کوردە ئەمە ئەحواڵتە؟!

وا بەهارە، سەرکەوە بۆ سەر ملە و ئێلاخ
ئاورێکی دەوری خۆت دە و تێفکرە دەستوبرد
بێنە بەر چاوت، نموونەی میوەهاتی زبر و ورد
گەر چاوی نیشتمانیی، سەیری خاکی خۆتت کرد
ئەوروپا موحتاجی میوەی وشکی ئالووالتە!!

لاوی خوێنگەرمم بزانە، خاکەکەت هەر نیعمەتە
حورمەتی خاکت بزانە، موستەحەقی حوورمەتە
مەعدەنی زیو و تەلایە، کانی دوور و سەروەتە
پێت بلێم: ئەم خاکە کامە؟ تا بزانی جەنەتە
یادگاری هۆزی ماد و زەند و پوری زاڵتە!!

کوانێ لاوی تۆڵەسێنم؟ بۆچی ئەمڕۆ گومبوون؟
کوانێ شێری شێر شکارم، ڕێگەیان گومکردوون؟
کوا سوارەی ڕموەشێنم؟ بۆ لە ڕێتا دەرچوون؟
داخی داخانم وەتەن! « ئەردەلان »ت نووستوون
ئەو کەسەی قوربانی تۆ بێ، « قانع »ی بێ ماڵتە «219 - 220»

« قانع »، لە حەوت پێنجینەدا، دەربارەی نیشتمانەکەی گوتوویەتی:

ئەی وەتەن! « یەعقوب »ی تۆم و « یوسف »م لێ گومبووە
ئەی وەتەن! بەدناوی تۆم و ئابڕووم بۆ تۆ چووە
کێ فرۆشتیتی بە وەڵلا، نانی « خوێریی » خواردووە
ڕیشی مەردانەی درێژە، سادقە بەچکەی جووە *
ئەی خوا، هەستێ لە خەو، ئەم بەختە حیزەی نووستووە

ئەی وەتەن! کەی خۆش ئەبێتۆ، زامی پڕ ئێش و بەسۆت؟
عەیبی بێ خێوییت نەبێ، هەر زێڕ و زیوە تانوپۆت
دێتە مێشکم کوللی ڕۆژێ، دەنگی ناڵە و ڕۆڵەڕۆت
شەرتە ڕۆحی خۆم و سێ کوڕ، کەم بە قوربانیی لە بۆت
کێ ئەڵێ: ئەم بێشە چۆڵە، شێرەکانی نووستووە؟

* مەبەسی لە پیاوێکی نایینیی بە دەسەلات بووە.

دوژمنان بۆچی، بە ناحەق هەر خەریکی هاتوچۆن؟
خۆی لە من چاکتر ئەزانێ، ئەو لەگەڵ کورد بووک و شوون
ناخەنە خۆیان دەچی بکەم، بێ حەیا و بێ ئابڕوون؟
بەچکە شێری نیشتمانم، شێرازەی شێرانی زوون
ڕشتنی خوێنی عەدوو، بۆ کورد بە ئیرسی هاتووە

ئەی وەتەن! دیققەت لە حاڵی تۆ ئەکەم، عەیبت نییە
ساحێبی ڕزقە و کەرامەت، خاکەکەت فیردەوسییە
تۆزە عەیبێکت ببێ، هیچ تر نییە، بێ عیلمییە
پێم بڵێن: ئەی عاقڵانی « کوردستان » وەجهی چییە؟
لاوەکانی « کوردسان » م، شانیان کزکردووە !!

لە دوا کۆپلەشدا گوتوویەتی:
« قانعا »، تا کەی بە شێتی بۆ وەتەن تەدبیرئەکەی
بێ نەتیجە بۆچی، بۆ مردوو وەها تەقریرئەکەی؟
یا لە بۆ ئیبرازی جەوهەر خۆتە، وا تەحریرئەکەی
دەک درخ ماڵی بشێوێ، شەرتە تۆش تەزویرئەکەی
داکەوە بۆ خۆت لە کونجێ، چیتە لەم هاتووچۆیە؟ «226 - 227»
« قانع »ی شەیدای نیشتمان، لە چوارینێکدا، بەراوردێکی زۆر جوانی، لە نێوان داماویی « فەرهاد »ی ئەویندار بۆ « شیرین » و دەردی دڵی خۆی بۆ « کوردستان »ەکەی کردووە و گوتوویەتی:
لەگەڵ « فەرهاد »ا، دڵمان ئەبرژان
فرمێسکی سوورمان، بە کوڵ دائەڕژان
هەر دوو زوخاوی، فیرقەتمان نۆشی
ئەو بۆ « شیرین » و من بۆ « کوردستان » «248»
« قانع »، وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر و بە ئەمەک، زۆر بە کوڵودڵەوە، گەرمەشینی بۆ « دوکتۆر فوواد و هاوڕێکانی، شەهیدانی ڕاپەڕینە خوێناوییەکەی بەر دەرکی سەرای سولەیمانیی ڕۆژی 06 .09 .1930 و شێخ مەحموودی حەفید ... » کردووە. بۆ نموونە: لە شینی « شێخ مەحموود »دا، چەپکێ لە « گوڵاڵە، نێرگس و هەڵەکۆک »ی بەهاری « کوردستان »ەکەی چنیوە، بە هۆنراوەیەکی دوازدە نیوەدێڕیی جوان و بەرز ڕازاندویەتییەوە، پێشکەش بە ئارامگەکەی « شێخ »ی نەمری کردووە و گوتوویەتی:

کەس نەڵێ: ئەم بێشە چۆڵە و ئەم زەعیمە مردووە
قارەمانی بێچووە شێری کوردسانە، نووستووە
پێت بڵێم: چی کردووە، بۆ خزمەتی کوردی هەژار
لاپەڕەی مێژووی، بە خوێنی ئاڵی خۆی نەخشاندووە
یادی « ئاوباریک » و « وەیسە » و « دەربەن » و « تاریدەر »ت
شاهیدە بۆ تۆ لەگەڵ کورد، چەندە ڕەنجت بردووە
ئێستەکەش ئاواتی تۆیە، پەیڕەوی کوردی هەژار
نامرێ هەرگیز لە دڵدا، فیکرەکەت هەر زیندووە
پەیکەری ژینت سەراسەر، شۆڕشە و کوردایەتیی
تاکە سەرمەشقی ژیانی، گەرچی کۆچت کردووە
بەم تەقەللا و شۆڕش و ئازایەتیی و مەردانەیەت
تۆ پەیامی مردنت، بۆ دوژمنی کورد ناردووە! «249 - 250 »
هەروەها، لە هۆنراوەی « شیوەن »دا، بە چوارده نیوەدێڕ هۆنراوە، شیوەنی بۆ کورد و ڕاپەڕینەکەی ساڵی « 1930 » کردووە و گوتوویەتی:
لە کزیی کوردان، گلاراومە
ڕۆژەکەی « ئەیلوول »، تانەی چاومە
لە بیرت نەچێ، باخچەی بەر سەرا
بە خوێنی کوردی، مەزڵووم ئاودرا
بە گوللەی مەترەلۆز، ئاوپرژێن کراین
لە سەر حەق خۆمان، بە ناحەق کوژراین
با، پێی تێ نەخەین، ئەو خوێنە گەشە
چون یادگاری، ڕۆژێکی ڕەشە
سوێندی پێ بخۆین، تا ڕۆژی مردن
کۆتایی نەکەین، لە تۆڵەسەندن
ئەو خاک و خوێنە، کەینە نموونە
بۆ ئەو میللەتەی، ئەمڕۆ زەبوونە
با، لە ناوپەڕەی مێژوو بمێنێ
کورد تۆڵەی خوێنی، بە خوێن ئەسێنێ «404»
ساڵی « 1963»، « قانع » و « وریا »ی کوڕی، لە « تاران » گیراون. هەر لەوێ، هۆنراوەی « لە بەندیخانەدا »ی گوتووە، بە شێوەیەکی زۆر جوان و بە دەدێڕ، دەردی دڵی خۆی هەڵڕشتووە، لە ترۆپکی هۆنراوەی ڕامیاریی نوێی کوردیی تێپەڕاندووە، بە ورەیەکی زۆر بەرزەوە، ڕووی لە دوژمن کردووە و گوتوویەتی:

ئاخرین ماڵی ژیانم، کونجی بەندیخانەیە
ئەم کەلەپچە، مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە
زۆر دەمێکە، چاوەڕوانی زڕزڕەی زنجیر ئەکەم
سەیری ئەم زنجیرەکەن! وەک زێوەری شاهانەیە
بووکی ئازادیم ئەوێ، خوێنم خەنەس، بۆ دەست و پێی
حەلقەحەلقەی پێوەنم، بۆ پلپلە و لەرزانەیە
گەرچی دوژمن وا ئەزانێ، من بە دیلیی لاڵ ئەبم
باش بزانێ، کونجی زیندانم « قوتابیخانە »یە!!
بیری ئازادییم لە زیندانا، فراوانترئەبێ
قوڕ بە سەر ئەو دوژمنە، هیوای بە بەندیخانەیە!
گرتن و لێدان و کوشتن، عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەپچە، لام وەکوو ئەفسانەیە
چاوەڕوانی شۆڕشێکم، عالەمێ ڕزگاربکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە، کردەوەی شێرانەیە
چەکی شۆڕشگێڕیی من، نووسین و بیروباوەڕە
ڕاپەڕینە، هەڵمەتە، پڕ نەعرەتەی کوردانەیە
گەر بە ئازادیی نەژیم، مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەریی و سەردانەواندن .. کاری نامەردانەیە
« قانع »م ئەمرۆ لە زیندانا، بە ئازادیی ئەژیم
سەد هەزار لەحنەت، لەوەی وا نۆکەری بێگانەیە «254»
لە هۆنراوەی « قانع و سەری »دا، بە دە شەشخشتەکیی گوتوویەتی:
سەرێ پڕ نەبێ، لە سەودای نیشتمان
داییم گێژ نەبێ، لە خەم بە دەستان
گەر نەیەتە سووڕ، بۆ دەوای دەردان
هەر تەوالێت کا و مێزەری گران
لە خوا ئەخوازم، کە بە بڕین چێ
تا دوا هەناسەی، بەزار و شین چێ

سەرێ خۆی بەرزبێ و چش بکا لە هۆز
بێ سەر ببینێ و خۆی بکا بە قۆز
فرمێسک نەڕێژێ، بۆ جێماوی هۆز
ئاه هەڵ نەکێشێ، ئاهی جگەرسۆز

له خوا ئەخوازم، کە بە برین چێ
تا دوا هەناسەی، بەزار و شین چێ

سەرێ وەک مێو بێ، لە حاستی دوژمن
بەڵام پۆڵابێ، بەرامبەر بە من
پڕ بێ لە خەیاڵ، بۆ کچۆڵە و ژن
دەک بیپێچێتۆ، لە ناو تۆی کفن
لە خوا ئەخوازم، کە بە برین چێ
تا دوا هەناسەی، بەزار و شین چێ

پاشان، لە دوو شەشخشتەکیی کۆتاییشدا گوتوویەتی:
سەرێ، سەراسێ نەگرێ بۆ ووڵات
هاواری لێ کەی، نەگاتە فریات
پەژارەی نەبێ، بۆ بێ دەسەڵات
بە کەس نەبەخشێ، پیاوەتیی و خەڵات
لە خوا ئەخوازم، کە بە برین چێ
تا دوا هەناسەی، بەزار و شین چێ
سەرێ بەبێ خەم، چێتە سەر سەرین
دوو گوێی خۆی کەڕکا، لە شین و گرین
جارێک نەیەتە، سەر ئاهوناڵین
هیچ خەمخۆر نەبێ، بۆ دەستەی بێ تین
لە خوا ئەخوازم، کە بە برین چێ
تا دوا هەناسەی، بەزار و شین چێ «272 - 274»

« قانع »، لە زمانی دایکی « کوتەک »ی کوڕییەوە، هۆنراوەی « لایەلایە ... »ی، بۆ جگەرگۆشەکەی هۆنیوەتەوە، بە هۆنراوەیەکی درێژ، ئامۆژگارییکردووە، تا، بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی دڵسۆزبێ، ناپاکیی لێ نەکا و لە سەرەتادا گوتوویەتی:
هەی لایەلایە، ڕۆڵە لای لایە
لە کزی کوردان، دەنگم دەرنایە
پاشان گوتوویەتی:
ڕۆڵە! ئەم شیرە، شیری شێرانە
شیری نیعمەتی، خاکی کوردانە

ڕۆڵە! بێشکەکەت داری قەزوانە
نەمامی مەندەی، باخی بابانە
دواتریش گوتوویەتی:
شیرە ڕاستەکەم، نەخۆی بە درۆ
سەرسەریی نەبی، نەمکەی ڕەنجەڕۆ
هەرگیز ناموست، بە پارە نەدەی
ئاوەڵ کوردی خۆت، ئاوارە نەکەی
***
ڕۆڵە! من بۆیە تۆ بەخێوئەکەم
ڕەنجی داماویت، لەگەڵا ئەدەم
تۆش خزمەتکاربی، بۆ گەل و هۆزت
قەت قسوور نەکەی، بۆ بەرزیی کۆزت
هەی لایەلایە، ڕۆڵە لایلایە
میللەتی بێ خێو، ڕۆڵە بەلایە
ڕۆڵە! خایەن بی بە ئاو و خاک
دەک ئەجەل بگرێ، دامێن و چاکت
تۆ بەخێو ناکەم، بۆ خەو و خواردن
یا وەک هێندێ کەس، بۆ چاو شۆڕکردن
کوڕم نەتبیستووە، مەشهورتر لە گشت؟
« سەر بۆ سەربڕین، نەک بۆ سەرزەنشت؟ »
ڕۆڵە! هەر کاتێ خوێنت بڕژێ
بە گوللەی دوژمن، مێشکت بپژێ
ڕەنجم حەڵاڵت، شیرم نۆشت بێ
کزی « کوردستان »، فەرامۆشت بێ
هەی لایەلایە، ڕۆڵە لایلایە
کۆمەڵی کوردان، وەک کاو بایە «313 - 315»
« قانع »، لە هۆنراوەی « وەسیەت بۆ وریا »دا، بە سیوچوار دێڕ هۆنراوە، ڕاسپاردەیەکی بۆ « وریا »ی کوڕی تۆمارکردووە و گوتوویەتی:
ڕۆڵە! هەر کەسێ کە هوشیار نەبێ
بۆ گەل و هۆزی، خزمەتکار نەبێ
ئەگەر برات بێ، لە لات یار نەبێ
دڵت بۆ ئیشی، بریندار نەبێ «374 – 375»

« قـانـع »، له هۆنـراوەی « با پێـشکەوین »دا، شـێـوازێکی زۆر ڕێکوپێکی ڕەخنەی پیادەکردووە. چونکە، له لایەکەوە: زۆر بە ڕاشکاویی، قامکی له سەر لایەنە خراپەکانی کۆمەڵی کورد داناوە و دەسنیشانیکردوون. ڕەخنەی توندی گـرتووە، ڕۆڵەکـانی کـوردی، بە نەزان، درۆزن، دواکـەوتوو، ناڕێک، نـاکـۆک و کەمتەرخەم تاوانبارکردووە، دژی دیاردەی دەروێشیی و سۆفیگەریی وەستاوە. له لایەکی دیکەشـەوە: ڕۆڵەکـانی نەتەوەکـەی خـۆی، بۆ خـوێندن و پێشکەوتن هانداوە، ڕێی ڕاستی پیشانداون و بە دە دێڕ هۆنراوەی جوان گوتوویەتی:

کوردە! بڕوانە، کە دنیا چۆن خەریکی سەروەتە
ڕەبی تۆ ڕاستۆ نەبی، وا ئیشوکارت غەفڵەتە
کوردە! شەرمی زەند و بابائەردەلانت ناتگرێ؟
هۆزی ناڕێک و درۆزن، سوودی دەرد و زیللەتە
قونبولەی زەڕیی و تەیارە و ڕادیۆت دیوە بە چاو
تەمێخواردوو نابی، کە تۆ ڕەفتارەکەت وەک وەحشەتە*
گوێ له یاری پڕ گەزاف و پڕ درۆ مەگرە بە هیچ
چۆن شەریکی کردنی، پیاوی درۆزن نەکبەتە
تۆ لەگەڵ هاوتیرەکەت، دەس ناگری تا سەرکەوی
گەر بە تەنیا هەوڵی خۆتە، ئارەزووت زۆر زەحمەتە
وا بزانم، وا ئەزانی، جوانیی و لووسیی بەسە
میللەتێ تۆ سەردەسەی بی، قوڕبەسەر ئەو میللەتە !!
هەر کەسێ لافی درۆی لێدا، وتی: دڵسۆزتم
تەجروبەیکە، جا ئەزانی، چۆن خەریکی تەفرەتە
پرچ و بەرماڵ و سیواک و ڕیش و کەشکۆڵ و عەبا
بۆ سواڵن، کەی ئەمە ئەسبابی ژین و حوورمەتە
لاوی کورد! خوێندن بخوێنە، یەکێتیی و ڕاستیت ببێ
جا ئەزانی کێیە، قابل تەخت و تاج و دەوڵەتە
« قانعا » هاوارئەکەی، ئەمما چ کەس گوێ ناگرێ
زەربی تەمسیلە « ... »ی بەر ئاگرت بێ قیمەتە # «218»

---

* تۆ تەریق نابیتەوە. # « کوز »ی بەر ئاگرت بێ قیمەتە. « گوڵاڵە 97 - 98 »
لەوە دەچێ، کـاتێ « بورهان قـانع »، هۆنراوەکـانی کـۆکـردبێـتـەوە و دیوانەکـەی چاپکردبێ، بە ئارەزووی خـۆی دەسکاریـیکردبێ و گـۆڕیبێـتی! چونکە، لە هێندێ نیـوە دێڕی هۆنراوەکـاندا، جیاوازیی لە نێوان دیوانەکە و « گوڵاڵە »دا دەبینرێ.

« قانع »، یەکێ لەو هۆنەرە نەتەوەپەروەرە دڵسۆزانەی کورد بووە، زۆر خەمی یەکێتیی و تەبایی، ڕیزەکانی نەتەوەی کوردی خواردووە. لەبەرئەوە، هەمیشە، دژی ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی بووە. بۆیە، لە چەندین هۆنراوەدا، ئەو دیاردە قێزوناکەی ڕیسواکردووە و دژی وەستاوە. بۆ نموونە: لە چەن هۆنراوەیەکدا، دەربارەی ناکۆکیی و دووبەرەکیی ڕیزەکانی کورد گوتوویەتی:

برا! خۆکردە دەردی نیشتمانم
گڕی خۆمە، ئەسووتێنێ ژیانم
لە بەر بێ وەحدەتیی و ئاوارەییمان
نەما قەدری بەگ و شوان و سەپانم «54»

شوان و سەپان و ئاغا، سەردار و میر و کاوان
گەر یەک نەگرن هەمووتان، وێرانە حاڵی کوردان «119»

یەکیەتیی و دۆستایەتیی خەڵکیی، کەوا پیرۆزە لام
من بە ناخی، فەلسەفەی ئەفکاری قەومیی تێئەگەم «202»

لە هۆنراوەی « بەری یەکێتیی »شدا، دوای ئەوەی گفتوگۆیەکی جوانی، لەگەڵ « ئاشنا »دا کردووە، بە شازدە نیوەدێڕ هۆنراوە، ناوەڕۆکی بیری یەکێتیی بۆ باسکردووین، ئامۆژگارییکردووین و گوتوویەتی:

کە هات هاوخوێن و کوڕی یەک خاک بین
ئەبێ، دەرحەق یەک، بۆچی ناپاک بین
تەماع نەکەینە، ناموسی یەکتر
بۆ ڕۆحی یەکتر، نەبین بە ئاگر
باب و باپیرانمان، وا بوونایە زوو
ئێستە ئیشی ئێمە، لە جێیە تر بوو
سەمەری وەحدەت، نەبوو بۆ ئەوان
یەکێکیان کورد بوو، یەکێکیان گۆران
ئەم « سەرشەقامیی »، ئەو « دەرگەزێنیی »
دوژمن بوون بە یەک، دوژمنی خوێنیی
ئەم خەڵقی « گۆیژە »، ئەو « سابونکەران »
ئەشیشانە یەک بە شەق، تێهەڵدان
من مەنعیان ناکەم، زەمان وەها بوو
ئیختیار بە دەس، « پیاوی بەلا بوو »
کوێر دەستکێشێ، ئەتخاتە ناو چاڵ
تیایا دەرنایەی، هەتا هەزار ساڵ «296»

دیاره، « قانع » زۆر بە باشیی، لە باری دەروونیی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی و ڕەوشی کۆمەڵایەتیی کورد تێگەیشتووە، کە ڕێز لە نووسەر و هۆنەر ناگرن. بۆیە، چاوەڕێی پاداشتی، لە هیچ کەسێ نەکردووە. بەڵکوو، ڕاژەکردنی نەتەوەکەی، بە ئەرکێکی نەتەوەیی و نیشتمانیی سەر شانی خۆی زانیوە! ئەوەتە، لە هۆنراوەی « تەپڵی شادمانی »دا، دوای ئەوەی، بە چوارده نیوەدێڕ، باسی جوانیی و شیرینیی هۆنراوەی کوردیی کردووە، لە دوا دێڕیشدا، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

« قانعا »، گەر تۆ بە ڕاستیی، خزمەتی هۆزەکەت ئەکەی

چاوەڕوانیی قەت نەکەی، بۆ بەخشیش و موچە و بەرات «50»

بەڵکوو، ئەوەی لای « قانع » زۆر گرنگبووە، ڕاژەکردنی گەلەکەی بووە. هەرچەندە، زۆر بە هەژاریی ژیاوە، بەڵام، کوردێکی گەلێ پاک و سەربەرزبووە، خۆی و پێنووسەکەی، لە پێناوی پارەدا نەفرۆشتووە، بە ڕاستیی، هۆنەری کوردبووە. بۆیە، لە دێرە هۆنراوەیەکدا، زۆر بە ڕوونیی، هێڵی تێکۆشانی خۆی دیارییکردووە، دژی ناپاکیی وەستاوە و گوتوویەتی:

هەتا ماوم، ئەبێ، بۆ عیزەتی ئەم خاکە دەعواکەم

خەڵاتی دوژمن و خەرقەی خیانەت، قەت لەبەر ناکەم «123»

هێندەش هۆنراوەی کوردیی لا شیرینبووە، گوێی بە هیچ جۆرە شتێ نەداوە، بەڵکوو لە تاواندا، چاوی لە « شێخ ڕەزا » کردووە و گوتوویەتی:

با بنووسم شیعری کوردیی، تاکوو خەڵکی تێ بگات

شیعری کورد شیرینترە، تا شەکر و هەنگوین و نەبات «49»

جگە لە هەموو ئەمانەش، « قانع »، یەکێ لەو هۆنەرە کوردە دڵسۆزە خەمخوارانەی کورد بووە، زۆر بە تەنگ زمانی کوردییەوە بووە. بۆیە، ڕەخنەی توندی، لەو نووسەرانە گرتووە، کە ڕێز لە زمانە زکماکەکەی خۆیان ناگرن و بە زمانی نەتەوە سەردەسەکانی « کوردستان » دەنووسن. ئەوەتە، لە هۆنراوەی « مشتە بودوم و پینەچی دەرزی »دا، دەربارەی زمانی نەتەوەیی، بە شازده نیوەدێڕ فەرموویەتی:

عەیبە بۆ تۆ، کە نەسلی کوردانی

حورمەتی خاک و باد نازانی

کاغەزت بێ، بە توورکیی ئەینووسی

یا، زوانی زەبوونی ئێرانیی

کەی عەرەب، کاغەزی بە توورکیی بوو؟

یا عەجەم، کەی بە ڕەسمی عیمرانیی؟ «86 - 87»

« قانع »، گفتوگۆیەکی گەلێ جوانی، لەگەڵ شاخی « هەورامان »دا کردووە. دوای ئەوەی، بە هۆنراوەیەکی شەستوشەش نیوەدێڕیی، گەلێکی بە سەردا هەڵداوە، زۆر سوپاسیکردووە، کە زمانی کوردیی پاراستووە. ئینجا پرسیاری لێ کردووە و گوتوویەتی:

کتێبی « زەدەشت »، کە « ئاوێستا »یە
وەک باقی کتێب، خەڵاتی خوایە
بە زمان « هەورامیی »، هاتە سەر بەشەر
یانێ، های « زەردەشت » بووی بە پێغەمبەر
تا دەورەی خۆی بوو، وەک باقی دینان
بەڵام نەسخ بوو، ئەویش بە « قورئان »
« ماریفەت » و « پیر » وتەی شالیارە
کە بە « پیرشالیار »، لە گشت دیارە
شاخی « هەورامان »، هەرچەند ڕەنجەڕۆم
زۆر چاک بزانە، کە مەمنوونی تۆم
چونکە پاراستت تۆ، ئەو زمانە
تێکەڵت نەکرد، لەگەڵ بێگانە
نە « ڕۆم »، نە « عەجەم »، نە « توورکی تاتار »
نە « ڕووس »، نە « ژاپۆن »، نە دەس ئیستیعمار
نەهاتنە ناووت، سەربەخۆ ژیای
بۆ لاوەکانت، تۆ پشت و پەنای
ئێستە نازانم، بۆچی بێ ڕەنگی؟
دووربێ لە گیانت، بۆچی دڵتەنگی؟ **«401 - 402»**

کەواتە، لە بەر ڕۆشنایی، ئەو چەن نموونانەی سەرەوەدا دەتوانم، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: « قانع »ی بلیمەت، پتر لە هەموو شتێکی دیکە، هۆنەرێکی نەتەوەپەروەر و نیشتمانپەروەری کوردبووە، بەرژەوەندیی باڵای خاکی نیشتمانەکەی خۆی، خۆشەویستیی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی، لە سەروو هەموو بەرژەوەندیی و شتێکی دیکەوە داناوە، لە هەموو بیر و باوەڕێکی دیکەی خۆشترویستوون. ڕاستە، هۆنەر، لە ڕووی چینایەتیی و باری ژیانەوە، سەر بە چینە ڕەشوڕووتەکانی کۆمەڵی کوردەواریی بوو.* بەڵام، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، جگە لە بیرێکی خاوێنی کوردایەتیی، جگە لە هەستێکی خۆڕسکی نەتەوەیی، جگە لە هۆشێکی بەهێزی « کوردستانیی »، هیچ جۆرە بیر، هەست و هۆشێکی دیکەی ناڕەسەنی هەبووبێ!

ئاخر دەبێ، لەوە پتر، چ بەڵگەیەکی دیکە هەبێ، تا، « قانع » بە زمانی خۆی، بە دەس و پێنووسی خۆی، باسی کوردێتی خۆی بکا و شانازییشی پێوە بکا؟! ئایا، بە هۆنراوەی « تەڵقینەکەم »، بۆ هەموو کوردێکی ناسەلمێنێ، کە لە هەموو کەسێ پتر، دڵی بۆ کورد لێیداوە؟!! بە تەنگ زمانی دایکەوە بووە؟!! ئایا، هەر لەبەرئەوە نەبووە، کوردکوردێنە لای ئەو، لە هەموو شتێکی دیکە گرنگتر و پیرۆزتربووە؟ بۆیە، گەر بە کفریشی زانیبێ، هەر گوتوویەتی:

کوردە! من ئەمرم، دینم کوردییە
( ..... ) نیم، ژینم کوردییە *
کاتێ کە ئەمرم، ئەمنێنە چاڵێ
کە دام ئەپۆشن، بە هەر ئەحواڵێ
با، بە کوردیی بێ، دەنگی « یاسین »م
با، سارێژبێ، پەترۆی برینم
ئەگەر « ک » بێتە سەرینم
بە زمانی « ..... » بکا تەڵقینم #
ئەنەووم لە دار، زۆر بە ئاسانیی
لیسێ لە ڕانی، چوار لە ناو شانی
ئەگەر بە کوردیی، بپرسێ لە دین
جوابی ئەدەمۆ، بە زمانی شیرین
ئەڵێم: « وک » خوام خوایە
« محەمەد »، گەورەی هەر دوو دنیایە
ژنی کورد خوشک و پیاوی برامە
« کوردستان » بەهەشت و ئەوە دنیامە
زنجیرە ژینم لەم « کوردستان »ە
کرداری چاکە و پاکیی زمانە
ئێستەش، هەرچەندە جێم تەنگەبەرە
خولیا و کەڵکەڵەی، کوردم لەسەرە «407»

* * *

---

1. عەرەب. 2. عەرەبیی.

* ئێستەش، زۆر باش لە بیرمە، ساڵی « 1955 - 1956 »، باوکم لە « سەییدسادق »، برینپێچبوو، « قانع » سەردانیدەکردین و باوکم یارمەتییدەدا!

سەرچاوە: قانع، ژیان و شیعرەکانی، برهان قانع کۆیکردۆتەوە و سەرپەرشتی چاپکردنی کردووە.

# « بێکەس »

# و

# بێکەسی کورد

« گۆران »، لە هۆنراوەی « هاورێم بێکەس !»دا، بە سەدوچلوهەشت نیوەدێڕ هۆنراوە، یادیکردۆتەوە، دەربارەی هونەر و توانای « بێکەس » گوتوویەتی:

شاعیرێکبوو، فەننانبوو
ئەدای خوڕ، خرۆشانبوو
بۆ باغچەی کزی کوردیی
بلبلبوو، نەغمەی وردی
سەرەڕای بەهرەی فەننیی
دڵسۆزبوو، بۆ وەتەنی
نرکەی شیعری ڕزگاریی
« بێکەس »، شتێکە دیاریی
لە هەموو کوردستانا
لە ناو بیر ئازادانا! .. «83،2»

هەروەها، جارێکی دیکەش لە هۆنراوەی « یادی بێکەس »دا و ساڵی « 1960» بە چلوهەشت نیودێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

هەرە برسیی و هەرە لێبووردووی دەستە
« بێکەس » زیاتر، خەباتی خستە بەستە
لە باغێکا، فرمێسکی « خانیی » ئەڕژا
دڵی « حاجیی »، لە ئاگرا ئەبرژا
« بێکەس »، دڵی بڕوای نەدا، خامۆشبێ
لە بەستەیا نیشتمان، فەرامۆشبێ!

لە ڕووی شیری ڕووتا وەستا و نەڕانی
ئازادیی ویست، بۆ گەل و نیشتمانیی! «340،2»

« مینەجاف »یش، لە شینی « بێکەس »دا گوتوویەتی:
« بێکەس »، کەسی قەومەکەی بێکەس
شەرتە ئێشم بێ، تا ئاخر نەفەس
شەرتبێ، ئێوارە و سوبح و نیوەڕۆ
تا ئەمرم بڵێم: کاک « فایق » ڕۆ «91،3»

هەڵبەتە، چ « گۆران » و چ « مینە جاف »یش، ئەو چەن دێڕە هۆنراوەیەیان، لە یادی هۆنەری نیشتمانپەروەری کورددا « بێکەس »، هەروا بە خۆڕایی نەگوتوە. چونکە « فایەقی عەبدوڵڵا بەگی کاکە حەمە »، نازناوی وێژەیی خۆی « بێکەس »، لە بێکەسیی نەتەوەکەیەوە وەرگرتووە.

هەرچەندە، « بێکەس » ماوەیەکی کەم ژیاوە، هەمووی چلوسێ ساڵ تەمەنی بووە. واتە: ساڵی « **1905** » لەدایکبووە و ساڵی « **1948** »یش، ماڵاوایی لە ژیان کردووە. بەڵام، لەو ماوە کورتەدا، شوێنپەنجەی لە بزووتنەوەی نەتەوەیی، ڕامیاریی و وێژەیی کوردییدا دیارە و کەس ناتوانێ، نکوولیی لێ بکا.

« بێکەس »، هۆنەرێکی گەورەی نیشتمانیی، بڵندگۆیەکی نەتەوەیی و ڕاستگۆیەکی بێ وێنە بووە. دژی داگیرکەران و خۆفرۆشانی نێوخۆ، هەمیشە لە خەباتدا بووە. لەگەڵ ناڵە و هاواری هەژاراندا ناڵاندوویەتی. باوەڕێکی تەواویی، بە خوێندن و پێشکەوتن هەبووە. زۆر بە کوڵودڵەوە، دژی بیری کۆنەپەرستیی و دواکەوتنی کۆمەڵایەتیی ڕاوەستاوە. هەست و هۆشی، هەمیشە لای نەتەوە و نیشتمانەکەی بووە. گرفت و ئەندێشەی شەو و ڕۆژی، باری بندەسیی، چەوسانەوەی نەتەوە و نیشتمانەکەی بووە، بۆیە گوتوویەتی:
سیمام، بۆیە وا ماتـــــە و پڕ مەینەت
کورد سەرشێواوە و « کوردستان » لەتلەت «84،1»

ئەو سەرشێواویی و بەتەنگەوەبوونەی بۆ نەتەوە و خاکەکەی وای لێ کردووە، پتر بیر لە هۆنراوەی نەتەوەیی و نیشتمانیی بکاتەوە. لەبەرئەوە، گەلێ هۆنراوەی شیرین و ڕەوانی بۆ هۆنیوەتەوە. چەن هۆنراوە و سروودێکی، بۆ منداڵانی کوردیش داناوە، تا، بە بیری ئازادیی و سەربەخۆیی « کوردستان »، پەروەردە و گۆشیانکا. جا هۆنەرێ بەو چەشنە بووبێ، هەڵبەتە، کارێکی ئاساییە، هەمیشە تێهەڵدراو، نانبڕاو، دەسکورت، دەربەدەر و گیراو بووبێ. لە سەر نیشتمانەکەی، لە کونجی گرتووخانە توندکرابێ، لە گرتووخانەشدا، نەتەوە و نیشتمانەکەی بیر نەچوبێتەوە، وەک بولبولێکی باڵشکاو، بە

ئاوازێکی خۆش و غەمگین، یادی « کوردستان »ەکەی کردبێتەوە و هاواری لێ کردبێ، هۆنراوە بە ناوبانگەکەی « ئەی وەتەن »ی، بە بیستوچوار نیوەدێڕ بۆ ڕازاندبێتەوە و گوتبێتی:

ئەی وەتەن، مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم، وا تێ نەگەی
حەپس و تێهەڵدان و زیللەت، تۆی لە بیربردۆتەوە
بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ، لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا، هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت گڕ و کڵپە و بڵێسەی، تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونی و کەساسیی خۆت نەکەی، تو خوا وەتەن
چونکە بەو باسە، برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینیی تا بەکەی؟ دەی پێکەنە و سەرهەڵبڕە
موفتەخیربە، شوهرەتت وا عالەمی گرتەوە
نەگبەتی لاچوو، سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە، ئەدرەوشێتەوە
گەرچی بەینێکە، زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە، ئەمجا ناحەزت لێکبێتەوە
لافی میللییەت بە دەم لەم عەسرەدا، کەڵکی نییە
ڕۆژی هەوڵە، هەر بە هیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێ قسوورە، چەند جەسوورە، سەد شوکور ئەولادەکەت
وا لە ڕێی تۆدا، لە خوێنا سەری چۆن ئەتلێتەوە
بەسیە تەعنەم لێ مەدە، هەر ڕۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ، هەتاکوو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ، گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم، وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە! «**1،55-56**»

« بێکەس »، هەمیشە ئاواتەخوازبووە، نیشتمانەکەی لە دەس دواکەوتوویی و نەزانین ڕزگاربیبێ، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی، واز لە دوودڵیی و ڕەوشتی خراپە بێنن. بۆیە، لە چەن هۆنراوەیەکدا، ئەو بیر و هەستە خاوێنەی دەربڕیوە. ئەوەتە، ساڵی « **1925** »، واتە: هەشتا ساڵ لەمەوبەر، لە هۆنراوەی « فیکری سەرکەوتن »دا، بە چواردە نیوەدێڕ گوتوویەتی:

فیکری سەرکەوتن، بەبێ شک، ئەی ڕەفیقان غیرەتە
فەوز و ئیقباڵ و تەعالی، هەر بە سایەی هیممەتە
قەومی کورد ئەمڕۆ، کە دائیم وا لە حاڵی حەسرەتە
باعیسی فیتنە و فەساد و دوودڵیی ناو میللەتە
قەومی کورد، شێرانی میللەت ! فیکری وەحشەت لابدەن
وەختی تێکۆشینە ئەمڕۆ، ڕۆژی عیلم و سەنعەتە
میللەتی بێ عیلم و سەنعەت، باوەڕت بێ دائیما
وا لە ژێر پێی ئەجنەبیدا، ناوی هەر بێ قیمەتە
سەیریکە و تێفکرە نەختێ، چی بەسەرهات قەومی کورد
سووک و بێ ناو و نیشانە و ژینی دەرد و زیللەتە
گەر بە دڵ بێت و هەوڵدەین، بۆ تەرەقی قەومی کورد
نائیلی جێگە و حوقووقی خۆی ئەبێ ئەم میللەتە
هەوڵ و تێکۆشین، بە تەنیا هەر دەم کەڵکی نییە
گرمەگرمی هەوری بێ باران، نیشانەی زەیقەتە «53،1»
هەروەها، لە هۆنراوەی « ئامۆژگاریی بۆ میللەت »دا بە حەوت دێڕ گوتوویەتی:
کوردە! تا کەی بێ خەبەربی؟ نووستنت بێ عارییە
وأسیتەی دواکەوتنت ئەمڕۆکە، هەر بێ کارییە
سەیری ئەم قەومانە کە، چۆن بوون و ئێستا بوون بە چی
حەیفە بۆ تۆ وا ئەسیری، بوویتە عەبد و جارییە
ئیتیفاقێ گەر نەکەی، لەم جەهلە خۆت ڕزگار نەکەی
پاشەڕۆژت قەڵبە بە خوا، عەیش و نۆشت زارییە
مەرهەم و دەرمانی دەردت، ئیتیفاقە ئیتیفاق
دوودڵیی میقرۆبە، خزمە، عیللەتێکی کارییە
نیوەڕۆیە، هەستە ئیتر بەرگی سستی داکەنە
زوڵمەتی شەو وا بەسەرچوو، وەعدەی هوشیارییە
ڕێی نەزانی بەربدە و ڕێگەی مەعاریف بگرەبەر
نیشتمانت زۆر کەساسە و ژینی هەر غەمبارییە
« بێکەسا »، قەتعی ئومێدی سەربەخۆیی، قەت نەکەی
کوردەواریی زیندووە، موحتاجی لوتفی بارییە «54،1»
« بێکەس »ی نیشتمانپەروەر، زۆر دژی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی » بووە. بۆیە، لە بەر ڕۆشنایی هۆنراوەیەکی « پیرەمێرد »دا، پێنجینەیەکی زۆر بەرز و جوانی، دژی چەن ناپاکێکی وەک « محێدین مەعروف » داناوە.

ساڵی « 1931 »، دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی بەر سەرای « سولەیمانیی »، ڕۆژی « ڕەشی شەشی ئەیلوول »، سەرەڕای ئەو هەموو خوێنڕشتن و قوربانییدانە، هێشتا ئەوان، دژی ویست و ئارەزووی گەلەکەیان وەستاون، کڕنووشیان، بۆ دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » بردووە. لە کاتێکدا، ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشووری کوردستان »، لە خەباتێکی سەختی خوێناوییدا بوون! بۆیە « بێکەس »، هۆنراوەی « وەفدی کوردستان »ی بە حەوت پێنجینە هۆنیوەتەوە. لەو هۆنراوەیەدا، سەبارەت بەو ناپاکییە گەورەیە، هەستی پیرۆزی کوردایەتیی خۆی دەربڕیوە، ڕقی پۆنگەوەخواردووی مەردانەی خۆی نەشاردۆتەوە و زۆر بە ڕاشکاویی، لەگەڵ « پیرەمێرد »دا گوتوویەتی:

قەدری میللەتتان، بە جارێ شکان
نە حەیاتان ما، نە ناو و نیشان
باری تەعنەتان، وا هاتە سەر شان
« وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی، شاری خامۆشان »

حاجی تووتنەکەت، مادەم فرۆشرا
قیرووسیا، لە سەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە، ڕێکەوە خێرا
« دەسکێ لەو گوڵەی، باغەکەی سەرا
کەوا بە خوێنی، لاوان ئاو درا »

تاقمێ ڕێکخەن، زۆر بە پڕلاقی
بە بەزم و ڕەزم و ئاهەنگ و ساقی
بۆ ئەوەی بکەن، دەفعی مەراقی
« بیبەنە بەردەم ،عەرشی عێراقی
بڵێن: یار باقی و هەم سوحبەت باقی »

نە بارانتان دی، نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران، بە گوللە و شەستیر
نە پێی نازداران، خرایە زنجیر
« پەردە و تارای سوور، بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن: دوای کوشتار، هێشتا تۆی دڵگیر؟ »

هاوار بە ماڵم، چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا، سەدمان لێ خرا
هێشتا، خەڵاتیان ئەکەن بە بەرا
« دەک خەجاڵەت بن، لە ڕووی مەحشەرا
ئێمەیش خاکی غەم، ئەکەین بە سەرا »

قەت وا تێ نەگەن، چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین، داییم بۆ پیاوە
لە ناو دۆشەکا، کەی حەق سەنراوە؟
« خەیاڵتان خاوە، کورد نەفەوتاوە
بەراتی نەجات، بە خوێن نووسراوە »

میللەت مەتینە، عەزمی نانەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی، هەر ناکەوێ
لەتوپەتکرێ، حوقووقی ئەوێ
« من ڕەنگی سوورم، بۆیە خۆشئەوێ
مژدەی شەفەقی، لێ دەرئەکەوێ » «57،1 - 59»

« بێکەس »، لە هۆنراوەی « یادی نیشتمانی کوردستان »، جگە لەوەی، بستێکی نیشتمانەکەی، بە هەموو خاکی « ئەورووپا » نەگۆڕیوەتەوە. جگە لەوەی، « کوردستان »ەکەی، هێزی ئەژنۆ و ڕووناکیی چاوی پێ بەخشیوە. جگە لەوەی، دیمەنە جوانە دڵگیرەکانی « کوردستان »، دڵی فڕاندووە و بە هیچ جۆرە تابلۆیەکی ڕەنگینی دڵفڕێنی نەداوە. جگە لەوەی، خۆشاو و شەربەتی کوردەوارییی، بە هەموو « شامپانیا » و خواردنەوەیەکی دیکە نەگۆڕێتەوە. هێشا، شانازیی بە خاکی نیشتمانەوە کردووە. جا گەر بۆ « کوردستان »ە شیرینەکەی، ئەو خەباتە پیرۆزەی نەکردایە، ئەدی گوایە، بۆچی بە کوردیی لە دایکبووە؟!! بۆیە، بە چواردە نیوەدێڕ گوتوویەتی:
من کە مەحرووم بووم لە وەسڵت، تازە ژینم بۆچییە؟
حورمەت و جاه و جەلال و ڕۆح و دینم، بۆچییە
دڵ لە بەر دووریی و فیراقت، پڕ لە قەهر و میحنەتە
شیوەن و گریانە عەیشم، پێکەنینم بۆچییە؟
باعیسی ڕووناکیی قەلب و نووری چاوم تۆی، وەتەن
چی لە دنیا کەم، بەبێ تۆ جێنشینم بۆچییە؟

من که خاکی پاکی، « کوردستان »ی نازدارم هەبێ
چی لە قەتعەی « ئەوروپا » کەم، موڵکی « چین »م بۆچییە؟
مەنزەرەی جوان و تەبیعیی زۆرە، لەم خاکەی منا
مەنزەرەی سونعی، بە بۆیەی سەوز و شینم بۆچییە؟
من کە خۆشاوی زەریف و شەربەتی مێوژم هەبێ
نامەوێ شەمپانیا و ئەسکەنجەبینم بۆچییە؟
بۆیە خوڵقاوم، کە خزمەتکەم، نەوەک هەر دانیشم
بۆ وەتەن، گەر تێ نەکۆشم، هێز و تینم بۆچییە؟ «60،1»

« بێکەس »، لە هۆنراوەیەکی دیکەی شەش نیوە دێڕییدا و بە ناوی « ئەی وەتەن »ەوە گوتوویەتی:

ئەی وەتەن، بۆ خزمەتت دائیم لە ڕێتا حازرم
باوەڕتبێ، من لە زومرەی لاوەکانتا نادرم
گەر لە سەر تۆ بێتو، تووشی سەد بەڵابم، سابیرم
خوا ئەزانێ، چەند لە عاستی تۆ، کە پاک و تاهیرم
« طەعنە ئەغیار و ئیلە ئۆڵماز و مەکەدەر خاطرم
های و هوی ئەبلەهان، ئەگلنجەدر دیۆانەیە » «61،1»

« بێکەس »، لە هۆنراوەی « ئەی کورد بەسیەتی »، دیالۆگێکی دوو قۆڵیی، لەگەڵ کورد کردووە. هۆی هەژاریی، ملکەچیی، بێکەسیی و بندەسیی کوردی، بۆ ڕوونکردووینەتەوە. لای وایە، هەرچەندە کورد، نەتەوەیەکی گەلێ ئازایە، لە تێکۆشان و قوربانییدان، درێغی نەکردووە، هەرگیز کۆڵی نەداوە، کۆلیش نادا و نابەزێ. بەڵام، لەبەرئەوەی سەرکردەکانی کورد ژیر نین، پیاوی کارامە و دڵسۆزیان تێدا نییە، نەتەوەکە تووشی ئەم ڕۆژەڕەشە بووە!

بە ڕاستیی، « بێکەس » چاکی بۆ چووە. چونکە، لەو ڕۆژەوە کۆمەڵگەی کورد دروستبووە، تەنانەت ئەوڕۆش، هەر هەمان گرفتی سەرکردە و سەرکردایەتیی هەبووە و هەیە. بە تایبەتیی ئەوڕۆ، لە هەموو ڕۆژێ خراپتر، ئەو گرفتە بە زەقی ڕەنگیداوەتەوە، لەگەڵ دید و بۆچوونەکەی هۆنەردا بە تەواویی گونجاوە، کاتێ بە شەش چوارخشتەکیی گوتوویەتی:

ئەی کورد بەسیەتی، تا کەی ئەم شیوەن و فوغانە
بێ سوودە ئۆف و ئامان، لەم عەسرە بێ ئەمانە
پاڕانەوە و کەساسیی، بێ کەڵکە پارە ناکا
عەزم و سەبات و غیرەت پێویستە، لەم زەمانە

حورِرِییەت و عەدالەت درۆیە، بێ ئەساسە
بۆ دەسبرِینە گشتی، ئەم هەموو دەنگوباسە
گەر تەفرە خۆی بە مانە، خوێنت ئەکرێنە کاسە
ژیانی کامەرانیی، بە هەوڵ و رِەنجی شانە

ئەم خاکە پاکە، عەینی بەهەشتە، حەیفە وابێ
وێران و سووک و بێ کەس، ئەسیر و بێ نەوابێ
ئەم حاڵە تاڵە بەسیە، تا کەی ئیتر رِەوابێ
شەوگاری شووم و بەسەرچوو، گەرد و گوڵی بەیانە

ئەگەر بە شێنەیی بێ، رِەنجت هەموو بە بایە
چونکە ئەم رِۆژە، رِۆژی سورعەت و کەهرەبایە
ئیشکەن بە دەستوبردیی، فرسەتە، وەرنە کایە
گەلی چالاک و خێرا، سەربەرز و شادمانە

ئەم کوردە گوردە، ئێستا کە بێکەس و هەژارە
ملی بۆ شیری دوژمن، خوار و کەچ و لەبارە
قەومێکی هێند نەبەردە، یەکی بەشی هەزارە
خوا گەورەکانی بگرێ، بێ کەڵک و هیچ نەزانە

دەخیلە، لادە « بێکەس »، لەم کەڵکەڵە و خەیاڵە
بڵێ: بە ساقیی، هەستێ بۆت پرِبکا پیاڵە
ئەم پەند و شیعری تۆیە، بێ قیمەت و بەتاڵە
میللەت کە بێ زەعیم بوو، ژیانی زۆر گرانە «1،64 - 65»

« بێکەس »، لە هۆنراوەی « دەردی دەروون »دا، باسی دواکەوتوویی، نارِێکیی و ناتەبایی، نێوان رِیزەکانی نەتەوەی کوردی کردووە و بە دە دێرِ گوتوویەتی:
کورد ئەبەد ناکاتە مەقسەد، نۆکەری بێگانەیە
دوودڵن، پیسن لەگەڵ یەک، بۆیە وا بێ لانەیە
میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری، هەر هەوڵئەدەن
داخەکەم، ورد و درشتی، شێت و شەیدای ئانەیە
سەنعەت و عیلم و مەعاریف، زەرِرِەیەک باوی نییە
پیاوەتی لایان، بە تەنیا چەفتە و جامانەیە

بۆ قسەی زل بێ قوسوورن، باسی کوردییەت ئەکەن
کوردییەت خورمایە بۆچی، یا قسەی شێتانەیە!
میللەتی بێ عیلم و ئەخلاق، چۆن بە ئیستقلال ئەگا
واسیتەی بەرزیی و تەرەققیی، هیممەتی مەردانەیە «1، 66»
هەروەها، لە هۆنراوەی « سەدەی بیستەمە »دا گوتوویەتی:

سەدەی بیستەمە، کوردە غیرەتێ
لە خەو ڕاپەڕە، هەوڵێ، هیممەتێ
بەسیە نەزانی، عیلم و سنعەتێ
سووکیی هەتا کەی؟ ناوێ، حوورمەتێ
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

ئەما ئەو ڕۆژەی، تۆ بە ئاسانیی
بتوانی، بژی بە شادمانیی
تۆ کە قەومێکی، بێ پشتیووانی
گەر تێ نەکۆشی، زۆر پەرێشانی
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

ڕۆژی کارەبا و ڕادیۆ و بوخارە
هەر قووەت و فەن، ئەمڕۆ بەکارە
گەلی دواکەوتوو، بەشی جەخارە
قوڕبەسەر ئەوەی، پەست و هەژارە
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

لە ڕووی زەمینا، نییە وەکوو تۆ
قەومێکی دوودڵ، دیل و ڕەنجەڕۆ
کەڵکی چی ئەگرێ، گریان و ڕۆڕۆ
درەنگە، هەستە، بوو بە نیوەڕۆ
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

سەیری عالەم کە، بۆ بەرزیی و ژیان
خۆی هەڵکردووە، هاتۆتە مەیدان
لە ڕێی نیشتمان، ئەبێتە قوربان
بۆ سەرکەوتن و بۆ ناو و نیشان
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

سبەینێ، کە جەنگ دامرکایەوە
ئاگری هەرا و شەڕ، کوژایەوە
هەر کەس حەقی خۆی، پێ درایەوە
تۆ بە چ ڕوویەک، دێیتە کایەوە؟
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

پێم بڵێ: کوانێ، وەتەنپەروەرت؟
کوا لاوی دانا و کوا مونەووەرت؟
کوانێ دڵسۆز و کوانێ ڕەهبەرت؟
ناوی خۆت نەبەی، ئەی خاک بە سەرت!
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟

دەرمانی دەردی ئێمە، خوێندنە
ڕەوشتی پاک و خزمەتکردنە
تۆوی ناکۆکیی، زوو لابردنە
ئەگینا بەشمان، شەق و مردنە
هۆش و بیرت بێ .. پیاوی ژیرت بێ
لە جێی سەربەستیی، بۆچ زنجیرت بێ؟ «1، 68 - 70»

هۆنەر ساڵی « 1944 »، لە هۆنراوەی « چاوبەست »دا، وەک ڕووناکبیرێکی شۆڕشگێڕی سەردەمەکەی خۆی، جەماوەری گەلەکەی، لە درۆودەلەسەکانی داگیرکەران وشیارکردۆتەوە. وەک ڕامیارێکی شارەزا، لە بەر تیشکی تاقیکردنەوەکانی پێشوودا، بە هیچ جۆرێ، باوەڕی بە پڕوپاگەندەکانی دوژمن نەکردووە. چونکە باشی زانیوە، ماف دەسێنرێ و نادرێ! بۆیە گوتوویەتی:

دەنگ بڵاوە، خەڵق ئەڵێن: ئەم جارە کورد، سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بڵێن، لە لام وایە، درۆ و چاوبەست ئەبێ
سەد هەزار جارمان، سیاسەت تەجروبەکرد و کەچیی
ئێستەکەش زۆرمان، بە فیشاڵی وەها سەرمەست ئەبێ
بێتو بەینی .... و .... ، زەڕڕەیەک تێکچێ، ئیتر *
مەسئەلەی کوردایەتیی، ئەوسا بە جارێ خەست ئەبێ
کەی حقووق ئەدرێ؟ ئەسەنرێ. عەیبە، ئیتر تێبگەن!
سەربەخۆیی چۆن نسیبی قەومی، وا بێ دەست ئەبێ
میللەتی جاهیل لە دنیادا، ئەبێ هەرە بەندەبێ
نۆکەریی هەر خشت بە باڵای، قەومی دیل و پەست ئەبێ «**71،1**»

ساڵی « **1949** » لە هۆنراوەی « کورد »دا، بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا و ڕەوان، باسی دەردی دڵ و باری پەشێویی خۆی کردووە، هەموو ژیان و گیانی خۆی بۆ گەلەکەی تەرخانکردووە و تەنیا چارەسەرێکی بۆ دەردەکانی دانابێ، هەر ژیانی گەلەکەی بووە. بۆیە، بە دازدە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

خەیاڵاتی شەو و ڕۆژم، ژیانی میللەتی کوردە
تەمەننام لای خودا، دائیم ژیانی میللەتی کوردە
بە دائیم دڵ پەشێواوی، پەشێویی میللەتی کوردم
وەکوو بولبول، سەحەرخوانیم ژیانی میللەتی کوردە
نەخۆشە میللەت و فەوتا وەتەن، بێ هۆشە ئەهلی ئەو
ئەوەی مەتڵەب بێ لامان، هەر ژیانی میللەتی کوردە
بە ڕاستیی، چاکترە مردن، حەیاتی وا لە لام تاڵە
ئەوی ناوی نەبێ، ئەمڕۆ ژیانی میللەتی کوردە
شەجاعەت پیشەی کوردە، مەعاریف ڕەسمی پێشوویە
کەرەم ئەڵبەتە، باعیس بۆ ژیانی میللەتی کوردە
دڵم خوێنڕێژ و سەر گێژە، دوو چاوم پڕ لە ئەسرینە
عیلاجی دەدری « بێکەس »، هەر ژیانی میللەتی کوردە «**74،1**»

ساڵی « **1946** »، لە هۆنراوەی « بیستوحەوت ساڵە »دا، ڕووی دەمی لە داگیرکەری ئینگلیز کردووە و زۆر بە ڕاشکاویی و ئازایانە، پەنجەی لە چاڵی چاوی « ئەدمۆنس »ی گەورە پیاوی ئینگلیز چەقاندووە، گەلێ پرسیاری بەجێی بێ وەڵامی لێ کردووە و گوتوویەتی:

* ڕەنگە، مەبەستی لە کورد و عەرەب بووبێ!

بیستوحەوت ساڵە، من ڕەنجبەری تۆم
بە نان و ئاو و جل و بەرگی خۆم
خزمەتم کردی، لە ئێران و ڕۆم
لە پێناوی تۆ، شکاوە ئەستۆم
کەچیی هێشتا، هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، من ئەڕەتێنی
بە فرِوفیشاڵ، ئەم خەڵەتێنی
ڕۆژی نەوعێکم، هەڵئەپەڕێنی
بۆ مەرامی خۆت، ملم ئەشکێنی
کە ئیشت نەما، وازم لێ دێنی
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، من تووشی تۆ بووم
لە ڕێی ژیانا، هیچ پێش نەکەوتووم
لات و پەژموردەم، هەر وەکوو مردووم
قسەی خۆمان بێ، حەشرت پێ کردووم
هیوام نەماوە، تازە لە دەست دەرچووم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، تاڵە ژیانم
لە ژێردەستیی تۆ، زۆر پەرێشانم
لە ئینسان ناچم، عەینی حەیوانم
کەی ڕزگار ئەبم، ماڵی وێرانم
وا بە خۆت ئەڵێیت: « حامی »ی گەلانم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، من بە تەماتم
چاوەڕێی نەختێ، لوتف و خەڵاتم
ببوژێتەوە، خاکیووڵاتم
هیچ گوێ نادەیتە، دەرد و ئاواتم
چونکە ئەیزانی، بێ دەسەڵاتم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، زووخاو ئەنۆشم
لە زوڵم و جەورت، هەر چاو ئەپۆشم
بۆ ڕەزامەندیی تۆ، تێئەکۆشم
لە بەر تۆ، زەربەم داوە لە خۆشم
وا تێگەیشتم، کە چەند بێ هۆشم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، تەفرەی خۆم داوە
وازم، لە هەموو کەسێک هێناوە
تۆم گرتووە و دنیام خستۆتە لاوە
بۆیە، پێم ئەڵێن: کەر و ڕێشگاوە
ئەوی تۆی ناسی، ملی شکاوە
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، دەم بە هاوارم
جارێ ناپرسی، لە حاڵی زارم
سووتاوم، پڕووکاوم، زۆر بێ قەرارم
ئەزانی، لە تۆ بۆچی بێزارم؟
شارەزای دەردمی، ناکەی تیمارم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، بەبێ زیاد و کەم
ئەپاڕێمەوە، هەر هاوار ئەکەم
یا خوا کافریش، نەبێ بە جەستەم
وێڵ و سەرگەردان، بێ تین و خەستەم
هیچم پێ ناکرێ، دیل و دەسبەستەم
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

بیستوحەوت ساڵە، دڵم لێت پڕە
ئەحواڵم بە دەس تۆوە، زۆر شڕە
سەد بەڵێن بدەی، لە لای من تڕە
بەسیەتی ئیتر، ئەم وڕەوڕە
نۆکەرییت ناکەم، ورگم هەڵدڕە
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!

من ڕەجبەرێکم، پاک و بەسەزمان
هەوڵم بۆ داوی، بە دڵ و بە گیان
بەسیەتی ئیتر، درۆ و تەفرەدان
وا ئەبێ، عەدل و ئینساف و ویژدان
ئەم کەی بە دیلی « عێراق » و « ئێران »
گوناهم چی بوو، بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق، وا سووکت کردم؟!          «1،75 - 78»

« بێکەس »، وەک چۆن هەمیشە، خەمخوارێکی گەورەی نەتەوە و خاکەکەی خۆی بووە. بە هەمان شێوەش، هەرگیز ئەوانەی لە یاد نەکردووە، کە هەموو هێز و توانای خۆیان، بۆ ڕاژەکردنی نەتەوەی کورد و خاکی « کوردستان » تەرخانکردووە، گوڵی گەنجێتیی تەمەن و گەورەترین سەرمایەی ژیانیان، پێشکەش بە کورد کردووە.
بۆیە، زۆر بە ڕێزەوە، یادی کەڵەپیاو و شەهیدەکانی کوردی کردۆتەوە، گەرمەشینی بۆ گێڕاون، چەندین هۆنراوەی ئاگرینی، بۆ چەن کوردپەروەر و ناودارێکی وەک: « مەحموود جەودەت، شەهیدانی نوردەی حوزەیران، مستەفا مەزهەر، ئەمین زەکی بەگ، قالەی ئایشەخان ... » هۆنیوەتەوە.

بۆ نموونە: دوو هۆنراوەی بۆ یادی شەهیدان: « مەحەمەد قودسیی، عیززەت عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا » گوتووە. لە هۆنراوەی « قەومی کورد ... »دا، بە بۆنەی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەوە، بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

قەومی کورد ئیسپاتیکرد، بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن، هەر ئەبێ، سەربەست بژین
میللەتێ، لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە، بێ ترس، دەم بە خەندە و پێکەنین
قەومی وا نامرێ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەقبەرێ
ساحێبی ڕۆڵەی نەبەردە، خاوەنی عەزمی مەتین
ئەو کەسەی گیانی، لە ڕێگەی نیشتمانا بەختئەکا
پێی مەڵێن: مردوو، شەهیدە وا لە فیردەوسی بەرین
لاوی کورد مەردە، لە مردن قەتعییەن باکی نییە
پەندیپێشینانە، ڕاستە « بەرخی نێر بۆ سەربڕین »
وا وەتەن دیسان، بە مەحزوونیی ئەڵێ: ئەی لاوەکان
بۆچی وا مات و مەلوولن، بەسیەتی شین و گرین
ڕۆژی تێکۆشانە، سا دەی هیممەتێ تاکوو زووە
بەشکو لەم حاڵە نەجاتمان ببێ و لە دیلیی دەربچین
گەرچی هەندێ کەس خەریکن، ورگ و گیرفان پڕئەکەن
شەو بەبێ خەم، سەرئەنێنە سەر سەرین، هەر سەرسەرین
پیاو ئەبێ، دائیم خەمی قەوم و وولاتی خۆی هەبێ
ئەو کەسانەی بێ خەمن، حاشا نەوەی ئەم خاکە نین ... «79،1»

لە هۆنراوەی « داری ئازادیی »دا، وەک ڕامیارێکی کارامە و دەسڕەنگین، باسێکی قوربانییدان و سەربەخۆیی گەلانی « عێراق »ی بۆ کردووین. ئەو باسەشی. بە خەباتکردن و شۆڕشی چەکدارییەوە، دژی ئینگلیزە داگیرکەرەکان بەستۆتەوە و بە بیستودوو دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

داری ئازادیی، بە خوێن ئاو نەدرێ، قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاریی، ئەبەد سەر ناگرێ
پیاو ئەبێ، بۆ سەندنی حەققی، لە مردن سڵ نەکا
هەر « بڕوخێ »، بەس نییە، تاکوو نەسەنرێ، نادرێ
کورد ئەگەرچی موددەتێکە، دیل و داماوە، بەڵام
باوەڕتبێ، ڕۆحی میللیی هەر ئەمێنێ، نامرێ

تۆ ئەگەر، ئیسلاحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ
لێت موحەققەقبێ، بەبێ شۆڕش مەحاڵە، ناکرێ
بیری ئازادیی جیهانی گرتەوە، تو خوا بەسە
ئەم نیزامە کۆنە تا کەی؟ هیممەتێکەن، لابرێ
قەت مەڵێن: دوژمن بە هێزە، تۆپ و تەیارەی هەیە
ئیتیفاقتان گەر هەبێ، زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ
ئەم « عێراق »ە خۆشەویستە، خاکی گوڵ گوون، بوو بە خوێن
تا حەقی دەسگیر نەبێ، لەو خوێنە دەس هەڵ ناگرێ
نێر و مێ هەر دوو بە جووتە، بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلیی، مەل بە باڵێ نافڕێ
هەوڵی ڕاستی هەر دوو لا، ئامانجی میللەت سەرئەخا
چونکە، مەعلوومە بە یەک دەس، چەپڵە قەت لێ نادرێ
وا گلۆڵەی کەوتە لێژیی، باوی ئیستیعمار نەما
هیچ کەسێ ئیتر، بە زوڕنا و تەپڵی ئەو هەڵ ناپەڕێ
دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە، تەئریخ شاهیدە
ناحەزی ڕووڕەش لە داخا، با یەخەی خۆی دادڕێ «1،82 - 83»
چونکە « بێکەس »، هەموو بیر و هۆشی لای نەتەوە و نیشتمانەکەی بووە، خۆشیی لە هیچ جۆرە بۆنە و جێژنێ نەدیوە. بۆیە، دەربارەی جێژن، بە دوو نیوە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
هەر زەمانێ، قەومی کورد دەرچوو لە زیللەت، بوو بە پیاو
جەژنی من ئەو ڕۆژەیـــــە، نەک جەژنی قوربانیی و پڵاو «1،84»
ساڵی « 1924 »، بە « 5 » دێڕ، دەربارەی سەرڕاستیی و ناپاکیی گوتوویەتی:
سەرم سووڕماوە، نازانم، چ شەخسێ بێ غەش و چاکە
لە ناو ئەم قەومەدا کێیە، لەگەڵ هاوجینسی خۆی پاکە
لە لام وا باشە ئێستاکە، بە کەس پشتێ نەبەستی تۆ
لە خزم و دۆست و ئاشنایان، هەتا ئەتوانی، هەر ڕاکە
ئەگەر پارەت نەبێ، بە خوا هەزار خزمت بێ، پەشمە
کە پارەت بوو، هەموو عالەم براتە و پێت ئەڵێ: کاکە
کەس و کارت وەکوو مارن، ئومێدت هیچ نەبێ پێیان
لەژێر سایەی ئەوان دەرچۆ، برادەر خۆتی لێ لاکە
بە ڕەنجی خۆت، لە دنیادا بژی ئازاد و سەربەست بە
هەموو کەس پێت ئەڵێ: مەردە و کوڕێکی چوست و چالاکە «1،87»

ساڵی « 1926 »، هۆنراوەی « عەیبە ... عەیبە »ی بە هەژدە نیوەدێڕ هۆنراوە هۆنیوەتەوە و لە کۆتاییەکەیدا گوتوویەتی:

سەیریکە، ئەم عەیبەعەیبە، چەندە تەئسیری هەیە
کوردی کردۆتە موهاجیر، ئیشی ناوشاران ئەکا
چونکە پێی عەیبە، لە جێی خۆی ئیشبکا، قەدری ئەبەن
بۆیە وا ئەڕواتە غوربەت، تەرکی « کوردستان » ئەکا
بەسیەتی ئەم فکرە پیسە، غەفڵەت و نووستن بەسە
سەیری ئەقوامی غەرب کەن، کەشفی ناو ئاسمان ئەکا «1، 88»

« بێکەس »، ڕۆژی « 16 .11 .1939 »، بە دە پێنجینە، هۆنراوەی « خوا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا »ی گوتووە. لەم هۆنراوەیەدا، هۆنەر لە دەردەکانی کۆمەڵی کوردەواریی دواوە. هەرچەندە، ئەو باری سەرنجانەی، تا ئەوڕۆش هەموویان ڕاستن. بە لام، هۆنەر لێرەدا، زۆر ڕەشبینانە بیریکردۆتەوە، هیچ ترووسکە و هیوایە، بە تەوێڵی هۆنراوەکەیەوە بەدی ناکرێ. لە یەکەمین پێنجینەدا گوتوویەتی:

بڵێم چی، لەگەڵ چەرخی ئەفلاکا
سەیریکە، چۆن چووین بە ناخی خاکا
وا چاکە، ئینسان لەم باسە ڕاکا
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

لای « بێکەس »، ژمارە گرنگ نەبووە. چونکە، زۆربێ و بۆربێی نەویستووە. بەڵکوو، نەخت و پوختی ویستووە. بەڵێ ڕاستە، بریا لە بری ئەو چل میلیۆن کوردەی، ئەوڕۆ لە جیهاندا هەیە، چوار میلیۆن هەبووایە، بە مەرجێ، هەموویان یەکگرتوو و دڵسۆزبوونایە. بۆیە لە دووەمین پێنجینەدا گوتوویەتی:

ئەگەر چی ئێمە، قەومێکی زۆرین
بەلام داخەکەم، چەوت و خۆخۆرین
بۆیە وا، لە ژێر چەپۆک و زۆرین
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

چونکە لە نێوخۆدا کۆک و تەبانین، دژی یەکدی کاردەکەین، لە یەکدی قڕکردندا چالاکین، گەر دەسمانبڕوا، ئەوا لە دوژمنەکانمان خراپتردەکەین. بەلام، ڕۆژی تەنگانە بێ دەسەلاتین، کاتێ دوژمنانیش پەلامارماندەدەن، دۆش دادەمێنین و نازانین، چی بکەین؟!! بۆیە لە سێیەمین پێنجینەدا گوتوویەتی:

بۆ کوشتنی یەک، گورج و بەکارین
ڕۆژێ دەسمانبێ، بڵح و زۆردارین
لە پێویستیدا، وەک ژن هەژارین
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

لە چوارەمین پێنجینەدا، بە شێوەی پرسیار، هۆکانی ژێردەسیی کوردی بۆ ڕوونکردووینەتەوە. تێیگەیاندووین، بۆچی کورد بەو زۆرییە، تا ئێستە، هەر ژێردەس و چەوساوەیە؟ ناو و نیشانی، لە نێو گەلانی جیهاندا نییە؟ هەروەها، لە خەسڵەتە خراپەکانی نەتەوەکەمان دواوە، کە ئەو خەسڵەتانە، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆش، زۆر بە ڕوونیی، وەک پەڵەیەکی چڵکن، بە نێوچەوانی کۆمەڵی کوردەوارییەوە دیارە. چونکە، کۆمەڵگەی کورد، وەک کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگیی ـ نیمچەدەرەبەگیی، تا ئێستەش بە تەواویی، قۆناغەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵگەی نەبڕیوە. ئەو خەسڵەتانەی هۆنەریش لێی دواوە، پتر بە چەن نیشانەیەکی، ئەو کۆمەڵگە دەرەبەگییە دواکەوتووانە دادەنرێ. بۆیە، هۆنەر پرسیوێتی و گوتوویەتی:
ئەزانی بۆچی، وا کورد زەلیلە
بێ ناو و نیشان، هەمیشە دیلە
چونکە، دوودڵ و خام و بەخیلە
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

هەرچەندە، ئێستە لە چەرخی بیستویەکدا دەژین، زۆربەی گەل و نەتەوەکان، خاوەنی دەسەڵاتن و دەوڵەتی نەتەوەیی تایبەتیی خۆیان هەیە. بەڵام، تەنیا چەن نەتەوەیەکی هەژاری دواکەوتووی وەک نەتەوەی کورد، لە کاروان بەجێ ماوە، بە دەس دەردی ژێردەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەییەوە دەناڵێنێ. لەبەرئەوە، لە پێنجەمین پێنجینەدا گوتوویەتی:
لەم عەسرە، کەوا عەسری بیستەمە
هەموو میللەتێ، خاوەنی حوکمە
هەر کوردی نەگبەت، وا لەژێر غەمە
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

لە شەشەمین پێنجینەدا، پەنجەی تاوانی، ئاراستەی ڕووناکبیرانی کورد کردووە، ڕەخنەی لێ گرتوون. گوایە: هەر کەسە خەمی گیرفان و ورگی

خۆیەتی پڕیکا، نیشتمانەکەی پشگوێخستووە و تەنانەت بۆ پارە، بیروباوەڕی خۆشی فرۆشتووە. بۆیە گوتوویەتی:

مونەووەر، هەر زۆری لەبەر نانی
وەتەن ئەفرۆشێ، بە یەک تارانی
ئەخاتە ژێر پێ، دین و ئیمانی
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

وەنەبێ، پیاوماقوڵانی کوردیشی بەسەر نەکردبێتەوە. بەڵکوو، لە حەوتەمین پێنجینەدا، ئاورێکی لەوانیش داوەتەوە و کوڵەی کوتاون. چونکە، چالاک نەبوون و گیانیان تێدا نەبووە، وەک خوڵی مردوو، بە سەریاندا کرابێ، وابوون. بۆیە پێی وابووە، بە هیچ شێوەیە نابێ، پشتیان پێ ببەسرێ. چونکە لە نێو خۆیاندا ڕێک نەبوون، بۆ پارە، ورگی یەکدیان هەڵدڕیوە، ملی یەکدیان هەڵهێناوەتەوە و نیشتمانەکەیان فرۆشتووە. کەواتە، بۆیە وا لە دواوەین، لەبەرئەوەی:

ئەشرافمان هەموو، بێ ڕۆح و سستن
دمخیلە، پشتیان هیچ پێ نەبەستن
هەموو ناکۆک و پارەپەرستن
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

لە هەشتەمین پێنجینەدا، زۆر بە ڕاشکاویی، ڕەشبینیی خۆی دەرخستووە. چونکە، گەر نەتەوەکەی بەو شێوەیە بینیبێ، چۆن قەڵەمی دەس و ئەژنۆی ناشکێ؟ نەتەوەیە وابێ، چۆن دەتوانێ، خاکەکەی ڕزگارکا؟ بە سەر ئەو هەموو گرفتە نەتەوەیی و ڕامیارییانەدا سەرکەوێ؟ کەواتە: با بمرێ و ناوی لە نێو ناواندا نەمێنێ. هەڵبەتە، هۆنەر زۆری بۆ هاتووە و خراپەکاریی، لە ئەندازە بە دەربووە. بۆیە نیشتمانپەروەرێکی وەک « بێکەس »، کە شەیدای کورد و « کوردستان »ەکەی خۆی بووە، تووشی ئەو ڕەشبینییە بووە، مەرگی نەتەوەکەی بە ئاوات خواستووە! ئەگینا نەیدەگووت:

قەومێ، سەوییەی ئەگەر ئاوابێ
مەحاڵە خاکی، بەرز و ئاوابێ
بۆ مردن باشە، تەفر و توونابێ
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

لە نۆیەمین و دەیەمین پێنجینەشدا، لە باری دواکەوتوویی کورد دواوە. وای لێکداتەوە، گوایە: کورد، لە نێو گەلانی سەر ڕووی زەویدا، لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر دواکەوتووە. بە شێوەیە خەریکە، بە یەکجاریی، ناوی لە لیستەی گەلانی جیهاندا دەکوژێتەوە. بۆیە، پێی وابووە، یەزدان بە خۆڕایی، وای بە سەر کورد نەهێناوە!

دیارە، کورد خۆی خراپە و مافی ئەوەی نییە، وەک نەتەوەکانی دیکە، بە سەربەستیی بژی و بمێنێتەوە. چونکە، لە نێوخۆدا دووڕوو، درۆزن و بێ بارن، وەک کەوی خۆخۆر وان، دوژمنی یەکدین. کەچیی، لە کۆتایی هۆنراوەکەدا، تروسکاییەک، لە بیر و هۆشیدا دەبینرێ. ویستوویەتی، لە خەوی بێداریی ڕامانچڵەکێنێ. تێمانگەیەنێ، کە هەر لە بەر ئەو ڕەوشتانەیە، بەو شێوەیە کورد دەسەپاچەبووە. پێی وابووە، کورد نەتەوەیەکی هەژارە، توانا و دەسەڵاتی ئابووریی نییە، پێویستی بە زانست هەیە، دەبێ چاوێ بە ڕەوشتی خۆیدا بگێڕێتەوە. دیارە، گەر پارەمان هەبێ، ڕەوشتی خۆمان بگۆڕین، پشت بە زانست و زانیاریی ببەستین، هەڵبەتە، لە دەس ئەو پەستیی و نەگبەتییە، خۆمان و نەوەکانی داهاتووومان قوتاردەکەین:

ئەمڕۆ بەبێ شک، لە ناو عالەما
هیچ قەومێ وەک کورد، وا بەجێ نەما
ناوی وا، لە ناو خانەی عەدەما
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا

ئێمە کوژراوی، دەستی نیفاقین
موحتاجی پارە و عیلم و ئەخلاقین
بۆیە وا پەستین، بێ ئیتیفاقین
کاکە خوا، ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ، بەفری تێ ناکا «1.99-101»

بەڵگەشمان ئەوەیە، هەر کەمێ دواتر، «بێکەس»ی خەمخواری کورد، لە هۆنراوەی «ئاواتی دڵ»دا، ئەوەی بۆ ئاشکراکردووین، گەر دڵ و دەروونمان لەگەڵ یەکدیدا، خاوێن و ڕوونبێ، نەفرەت لە کوردە ناپاکە ڕووڕەشەکان بکەین، دەسی برایەتیی، لە نێو دەسی یەکدی بنێین، کەس ناتوانێ، نکوولیی لە مافەکانی نەتەوەی کورد بکا. بە مەرجێ، خۆشەویستیی لە دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی گەلدا، جێی تایبەتیی خۆی بکاتەوە و چلورە ببەسێ. چونکە، کرمی

دڵپیسیی، گومان و ڕکوکینە، دەزوولە وردە باریکە خوێنینەکانی دڵ دەقرتێنێ و نەتەوەکەمان لەنێودەبا. بۆیە، بە بیست نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

دڵ کە زۆر مەسروورە ئەمرۆ، ئارەزووی ئیزهارئەکا
حەز لە فنجانی شەرابی، دەست و پەنجەی یار ئەکا
دڵ گەشە، وەک گوڵ وەهایە، دەرد و ئازاری نەما
تالیبی وێسکیی و شەرابە، حەز لە عوود و تار ئەکا
دڵ نەجاتی بوو لە تەنگیی، کەوتە بەزم و ڕەزمەوە
عاشقی سەیر و سەفایە، مەیلی ناو گوڵزار ئەکا
دڵ ئەوەندە مەست و کەیلە، شێتە، هیچ هۆشی نییە
وا لە ڕەقسایە، خەریکە عالەمێ بێزارئەکا
دڵ بە نەشئە و بەزمی میللییەت، شوکر بوژایەوە
شاییە، سەیرانە، بەزمە، پڕ بە دەم هاوارئەکا
دڵ بە ئاواتی گەیشت و لاوی کوردی دی، کەوا
یەکدڵ و یەکدەم، خەریکە میللەتی هوشیارئەکا
دڵ لە کینە خاڵییە، بێ گەردە، سافە وەک بلوور
سەد تف و لەعنەت، لە چارەی خائینی سەگسار ئەکا
گەر بە ڕاستیی بێنە پێشێ، دەس لە دەس یەک کەن هەموو
کێیە ئەو سایە، حوقووقی قەومی کورد ئینکارئەکا ؟!
یەکترتان خۆش بوێ، تا نەکبەتیی بەرتانبدا
دوودڵیی، ئەم قەومە دیل و سووک و بەدڕەفتارئەکا «109،1»

« بێکەس »، ساڵی « 1944 »، لە هۆنراوەی « بێزاریی »دا، لە دەس دەرد و کەموکوڕییەکانی کۆمەڵی کوردەواریی، داخی دڵی خۆی هەڵڕشووە. لە ناو ئەوەی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بە تەواویی، ڕاست و چەپی خۆیان نازانن، پیاوی « پاک و ناپاک، ڕاستگۆ و درۆزن، بە ئابڕوو و بێ ئابڕوو، ڕەوشتدار و بێ ڕەوشت »، لە یەکدی جیا ناکەنەوە، ڕێزی نووسەر و هونەر ناگرن، بە چواردە نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

زەمانی پیاوی جاسووسە، چ وەختی سیدق و ناموسە
لە هەر لا باسی ئەخلاق و وەفا بکرێ، ئەبێ هەڵسم
ئەوەندە تەعقیبی حەققم کرد، هەتا وا سووک و ڕیسوا بووم
هەزاران لەعنەتم بۆ دێ، لە هەر شوێنێ کرا بەحسم
ڕەواجی کوانێ، لای خەڵقی وتار و شیعری پڕ مەعنا
گەلێ کەس پێکەنینی دێ، بە گوفتار و دەم و لەوسم «139،1»

« بێکەس »، لە هۆنراوەی « دەردی دەروون »دا، دیالۆگێکی لە نێوان خۆی و یەکێکی دیکەدا سازکردووە. سەرەتا، باسی باری ژیانی خۆی کردووە، کە چۆن ئاگای لە هیچ نەماوە، تەنیا خەریکی خواردن و خەوە، بۆ ئەوەی تاوێ بحەوێتەوە. چونکە، هەرچی کردووە، کەس نەبووە، پێ بزانێ. لەبەرئەوە، تووشی ڕەشبینیی بووە، خووی داوەتە خواردنەوە و قومارکردن! بۆیە، بە حەفتاودوو نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

دەمێکە، یاران، مات و خامۆشم
وێنەی تلیاککێش، مەست و بێ هۆشم
خۆم لە تەنقیدات، دوورخستۆتەوە
هەواڵی دنیام، لە بیرچۆتەوە
نازانم، دنیا ڕۆژە یا شەوە
هەموو کارێکم، خواردن و خەوە
لە دەنگوباسی خەڵقی، بێ خەبەر
وەک حەیوان ئەژیم، دوورم لە بەشەر
خەریکی چی بم، غەیرەز خواردنەوە
باسی قومار و پارەبردنەوە
حەقمە، لێم گەڕێ، تەعنەم لێ مەدە
حەقێکی ئەوتۆ، لە سەداسەدە
مردم، ئەوەندە هەوڵ و چەنەم دا
هەر چێکم نووسی، گشتی چوو بە با
قەومێ، کە دائیم هەر هەوڵبدەن
بۆ ئەوەوی، یەکتر بە ئەرزا بدەن
بایە لە لایان، میللەت و وەتەن
هیوا ئەمێنێ، ئەوەی دەنگ بکەن
غەیرەز نیفاق و بێ ئیتیفاقیی
فەساد و فیتنە و ڕێی بێ ئەخلاقیی
چی تر ئەزانن؟ وازم لێ بێنە
پەردەی ئەسرارم، زۆر پێ مەدڕێنە
قسەم زۆر ماوە، ڕەقە وەک بەردە
کاکە لێم گەڕێ، بەرۆکم بەردە «1، 144 - 145»

ئینجا، کەسەکەی دیکەش وەڵامیداوەتەوە و گوتوویەتی: کێ گوێ لە هۆنراوە دەگرێ، قسەی خۆت بۆ هەروا بەبادەدەی. کامانەن ئەو کوردپەروەرانەی تۆ،

خۆتیان بۆ ماندوودەکەی؟ ئەورۆ هەر پارە باشە، بۆ سەری خۆت بە خۆڕایی دێشێنیٚ، تۆش وەک ئەو خەڵکە، بۆ خۆت بژی، چیت لەم سەریەشەیە داوە، تا، بە چەن دێڕە هۆنراوەیەکی جوان گوتوویەتی:

« بێکەس » من نەم وت: تۆ وا وەستابیت
لە باسی خەڵقا، تا خۆت وەستابیت
نەگبەت ! دامرکێ، چیتە لە میللەت
سەیری خۆت ئەکەی، چۆن بووی بە عیبرەت
ڕەفیقت هەموو، ساحێب مەعاشن
خاوەنی پارە و وەزیفەی باشن
مەڕوانە، ئەوەی فلان جاسووسە
خائین و عادی، زۆر بێ ناموسە
ئەمەت پێ ئەڵێم: ئەتۆش بینووسە
ئیمان و دین و شەرەف، فلووسە!
عالەم خەریکی، ڕوتبە و پارەیە
هەر تۆ بە تەنیا، جەرگت پارەیە
ئەوەند قسەتکرد، نانی خۆت بڕی
ماڵت وێرانبێ، چەند ئاخر شەڕی
کێ گوێ ئەداتە، شیعر و نەسیحەت؟
کێ پەسەندئەکا، قسەی بە قیمەت؟
ئەمڕۆ، زەمانی ڕوپیە و ئانەیە
ئەمانە، قسەی منالانەیە
کوا پیاوی دڵسۆز؟ کوا وەتەنپەروەر؟
بەسیە، قسەی خۆت بۆ خەسارئەکەی؟
عالەمێ لە خۆت، بۆچ بێزارئەکەی؟
دانیشە، ئیتر چیت لە کورد داوە؟
بۆچ خۆت ئەخەیتە، ئەم گێژ و داوە؟
سەد ساڵ لە سەر یەک، تۆ ئیرشادبکەی
خەڵک وا ئەزانێ، زوڕنا لێ ئەدەی
من باکم نییە، هەر لە بەر تۆمە
قسەت کار ناکا، بەردی بن گۆمە
کوا خاوەن غیرەت، کوانێ مەنەوەر؟

پاشان، « بێکەس »یش لە وەڵامدا گوتوویەتی:

بەڵێ، فەرموودەی تۆ لە سەر چاوم
ڕاستە، بۆیە من سووک و بەدناوم
دائیم دەربەدەر، وا نان بڕاوم
چی بکەم، بڵێم چی، وەها خوڵقاوم
هەتا بمێنم، قسەی حەق ئەکەم
جوێن بە ئینسانی خائین، هەر ئەدەم
گەرچی ڕاست وتن، شەقی لە دوایە
خۆشە لە لای من، وەکوو حەڵوایە
ئەوەی بە ناحەق، شتێ بنووسێ
پەنجەی هەڵوەڕێ و چاوی بنووسێ
مەقسەدم تەنیا، نەشری ئەخلاقە
بڕینی ڕەگی، فیتنە و نیفاقە
ئەخلاق ڕەهبەری، ڕێی پێشکەوتنە
پەیژەی تەرەققیی و زوو سەرکەوتنە
دەلیلی ڕێگەی، فەوز و نەجاتە
سەرمایەی فەخر و بوونی حەیاتە
قەومی بێ ئەخلاق، پەست و زەلیلە
هەر بەشی شەقە و سەرکز و دیلە
ئەمە پەندێکە، بۆ چاکیی ئێوە
نامەوێ، هیچ دەسکەوێ لێوە «1،144 - 147»

« بێکەس »، جارێکی دیکەش، لە دەردی دڵ و دەروونی خۆی دواوە، زۆر بە جوانیی تێگەیشتووە، هەرچی بۆ ئەو کەمەڵە گوتووە، هیچ کەڵکێکی نەبووە. بۆیە، تووشی ڕەشبینییەکی زۆر گەورە بووە، تەنانەت، ئەو ڕەشبینییە، بە شێوەیە بووە، لە زۆر کار و کردەوەی خۆی پەشیمانبۆتەوە، وازی لە زۆر بەهای پیرۆز هێناوە. چونکە، لە سەر ڕێنیشاندان و قسەی هەق، گەلێ جار، تووشی دەردەسەریی و نانبڕان بووە، کەسێکیش نەبووە، ئاوڕی لێ بداوەتەوە! لەبەرئەوە، لە هۆنراوەی « تووشی لافاوی عیلم بووم ... »دا، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

تووشی لافاوی عیلم بووم و بەڵام، زوو دەرپەڕیم
سواری واپۆڕی جەهل بووم و بە ناویا تێپەڕیم
سەد شوکر، ئۆخەی نەجاتم بوو، لە باسی عیلم و فەن
نامگرن جارێکی تر، بۆیە لە کەیفا هەڵپەڕیم

گەرچی تا ئێستە، وتوومە: تێبگەن، زوو پێبگەن
بەو قسانەم، قەتعیەن باوەڕ مەکەن، سەگ بووم، وەڕیم
خوێندەواریی شێتییە، هەر جەهلە، ئینسان سەرئەخا
گەر لەمەولا، ناوی عیلمم برد، بزانن، سەرسەریم
هێندە تەعقیبی هەقم کرد، تاکوو نانی خۆم بڕی
سووک و ڕیسوا بووم، لە ناوا گیرەوەی ئاخرشەڕیم
من کە زانیم، حاڵی زانا نەفییە، حەپسە، یا شەقە
هەر کیتابێکم هەبوو، دوێنێ، لە داخانا دڕیم
پیاوی دانا، عەقڵی دانا زانیی، بۆی ناچێتەسەر
بەرگی نادانیی لەبەرکرد، بوو بە خاوەن زێڕ و سیم
شەرتە، کەربم، بارەگوێزم لێ بنێن، خرڕەی نەیێ
با دەمێ، زۆر و کەمێ، وەک بێ غەمێ، بۆ خۆم بژیم «166،1»

« بێکەس »، گەلێ هۆنراوە و سروودی بەرز و جوانی نەتەوەیی، بۆ منداڵانی کورد داناوە. هەر یەکێ لەو هۆنراوانە، وەک چیرۆکێکی پەند و ئامۆژگاریی وایە، منداڵان، بە شێوەیەکی باش و کوردانە پەروەردەدەکا. بۆ نموونە: لە هۆنراوەی « تۆ چیت ؟ من کوردم !»دا، بە شازدە دێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

تۆ چیت؟ من کوردم نەتەوەی کوردم
خۆ ترسنۆک نیت؟ حاشا نەبەردم
چی تۆی لەناوبرد؟ دوودڵیی و نیفاق
چۆن ڕزگارئەبی؟ هەر بە ئیتیفاق
بڵێ: چیت ئەوێ؟ بەرزیی وەتەنەم
بە خۆڕایی نا بە گیان و تەمەنم
چیت لە بارایە؟ خۆ فیداکردن
بۆچی؟ لە ڕێگای میللەتا مردن
کوا؟ چەکت چییە؟ سەودای وولاتم
ئەی پشتیوانت؟ عەزم و سەباتم
ڕاستت پێ بڵێم؟ فەرموو، گوێم لێتە
بە قسەم ئەکەی؟ سەرم لە ڕێتە
بە ڕاستیی و پاکیی هەوڵ و تێکۆشین
لە کورسیی و کینە و درۆ چاوپۆشین
ئەمانەت نەبێ کارت زۆر لەقە
بەشت هەمیشە نەگبەتیی و شەقە «185،1»

یا، لە سروودی « وەتەن »دا، « بێکەس »ی هونەرمەند، ڕووی لە یەزدانی گەورە کردووە، لێی پاڕاوەتەوە، تا نیشتمانە دڵگیر و شیرینەکەی ئاوەدانکاتەوە و گوتوویەتی:

خوایە، وەتەن ئاواکەی
چەند دڵگیر و شیرینە
دەشتی خۆش و ڕەنگینە
ئاوی کەوسەرە، خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە

سەیرانگای بەهارانی
سەوزەگیای نەرم و جوانی
سەد دڵ ئەبێ حەیرانی
ئاوی کەوسەرە، خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە

شاخی بەفرین و بەرزە
بۆ ڕابوردوومان ڕەمزە
چیمەنی جوان و سەوزە
ئاوی کەوسەرە، خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە

ئەم شوێنە، شوێنی کوردە
جێی قارەمان و مەردە
لانەی شێری نەبەردە
ئاوی کەوسەرە، خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە

وەتەن چاوی لێمانە
دەریکەین، لە تەنگانە
حەیفە بێتە وێرانە
ئاوی کەوسەرە، خاکی گەوهەرە
پڕ لە گوڵ و نەسرینە «207.1»

هەرودها، له سروودی « شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە »شدا، وەک هەموو هۆنەرێکی نیشتمانپەروەر، گەلێ شانازیی بە کوردێتیی و نیشتمانەکەی خۆیەوە کردووە و گوتوویەتی:

شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە، باعیسی کەیف و سروور
هەر دەمە بەرگێ ئەپۆشێ، گا سپی، گا سەوز و سوور
وەسفی قەومی کورد ئەکەی، تۆ بەم هەموو ڕەنگانەوە
ڕەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد، کە قەومێکن جەسوور
بەرگی بێ گەرد و سپییشت، دیارە وا هاوارئەکا
قەومی کورد دڵساف و پاکن، میللەتێکن بێ قسوور
بەرگی سەوزیشت ئەڵێ: ئەم خاکە هەر شینایییە
پڕ لە دەغڵ و دان و کانیی، سەر بە ڕزق و پڕ لە نوور
ئەی وەتەن ! شایانی فەخری، واجبە مەدحت بکەم
دار و بەردت عەینی گەوهەر، خاک و خۆڵت وەک بلوور «210،1»

«بێکەس » جارێکی دیکەش، زۆر بە ڕاشکاویی، لە ڕەوشتە نزم و خراپەکانی، هێندێ لە توێژ و چینە کۆمەڵایەتیییەکانی کۆمەڵی کوردەواریی دا، زۆر بێ بەزەییانە، باسی هێندێ لەو پیاوماقوڵ و ناودارانەی، ئەو سەردەمەی خۆی کردووە. بە شێوەیە، بە بێ ڕەوشت، بێ ویژدان و ترسنۆک تاوانباریکردوون. هەڵبەتە، لە نێو نەتەوەیەکی دیارییکراودا، کە هیچ جۆرە پێوانەیەکی نیشتمانپەروەریی و ڕەوشتبەرزیی تێدا نەبێ، هەر وای لێدێ، کە هۆنەر باسیکردووە. هەرچەندە، ئەو هۆنراوەیەی لەو سەردەمەدا گوتووە، بەڵام، باوەڕ ناکەم، زۆر شت لەم سەردەمەی ئەوڕۆشماندا، لە کۆمەڵی کوردەوارییدا گۆڕابێ! بۆیە، قسەکانی وەک نەخشی بەرد وابوون، کاتێ، لە هۆنراوەی « دەردی دەروون »دا، بە دوازدە چوارخشتەکیی گوتوویەتی:

وان وە بان غەیرە، ئەم قەومی خۆمە
مەحکوومی حیز و خەڕات و دۆمە
نامووس و ویجدان، غیرەت و شەرەف
لە ناو ئەشرافا باریکرد، ئەسەف

فیکری میللییەت، ئێستا مەعدوومە
پیاوی مونەوەر، لات و مەزڵوومە
هاوار، ڕۆژێکی چەند قەڵب و شوومە
لە عەیشی دنیا، زار و مەزڵوومە

ئەوەی خائینی، موڵک و میللەتە
دائیم، لە بەحری ناز و نیعمەتە
هەر وەتەنپەروەر، غەرقی زیللەتە
خۆراک و خەوی، دەرد و میحنەتە

ئەجنەبی دەرحەق، بە ئێمە باشە
ئەوی خراپە، هەر وەتەنداشە
کە بوو بە مەئموور، ئەنێتە واشە
ئیمان و دینی، تەنیا مەعاشە

میللەت ئەوەندە، نەفام و کەرن
بێ عەقڵ و جاهیل، زۆر بێ جەوهەرن
هەرچی مەئموووربوو، حوورمەتی ئەگرن
داوای ژنیان کەن، ڕەنگە بۆی بەرن

ئومێدم ئیتر، بەم کوردە نەما
نابێ بە ئینسان، لە ناو عالەما
بمێنێ، هەتا لە دەرد و غەما
هەر ئەناڵێنێ، لە ژێر قەدەما

قەومێ کە دائیم، هەر هەوڵبدەن
بۆ ئەمەی یەکتر، بە ئەرزا بخەن
یا نەبێ، لایان میللەت و وەتەن
ئایا مومکینە، تەرەققی بکەن؟

بەسیەتی « بێکەس »، خەیاڵت خاوە
چیت لە مەسەلەی، میللییەت داوە
هەزاری وەک تۆ، کە ڕەنجیداوە
سووک و پەرێشان، قەدری نەماوە

ئەگەر ئەتەوێ، بژیت بە خۆشیی
بە ڕوپیە ئەبێ، قەومت بفرۆشی

له موڵک و میللەت، چاوت بپۆشی
جامی دەنائەت، ئەبێ بنۆشی

نابینی، ئێستا کە ئەوی وایە
ژیانی هەموو، کەیف و سەفایە
هەر وەتەنپەروەر، غەرقی جەفایە
قیمەتی نییە، ڕەنجی بە بایە

« ئەستەغفیرەڵڵا »، من لەوانە نیم
قەت ناخەڵەتێم، بە ئاڵتوون و سیم
باوەڕم پێبکەن، کوڕێکی جیددیم
تا لە دنیادا، سەعاتێ بژیم

خراپ ببینم، تەنقیدی دەکەم
ئەوی خائینە، جوێنی پێ دەدەم
ناترسم لە کەس، بێ باک و بێ غەم
هەر چی کە ئەبێ، ببێ، جەهەننەم «1، 218 - 220»

* * *

---

**تێبینی:**
ئەم گوتارە، ڕۆژی « 2000 .07 .01 » نووسراوە. بەڵام، لە بەر هێندێ هۆ، تا ئێستە، لە هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا، بڵاو نەکراوەتەوە. پێش ئەوەی، لێرەشدا بڵاویکەمەوە، جارێکی دیکە، زۆر بە وردیی، بە سەرلەبەری دەقەکەدا چوومەتەوە، هێندێ زانیاریی نوێم بۆ زیاد کردووە. هەرچەندە، لەگەڵ دید و بۆچوونی هۆنەردا، جیاوازییم هەیە. بەڵام بە داخەوە، ئەو ڕەوشتە خراپانەی ئەو، چەندین ساڵ لەمەوبەر باسیکردوون، تا ئێستەش هەر ماون!

**سەرچاوەکان:**

1. بێکەس، دیوان، چاپی سێیەم، چاپخانەی « حسام »، بەغدا، 1986.
2. گۆران، دیوان، بەرگی1، چاپی1، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا، 1980.
3. مینە جاف، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی جاحیز، بەغدا، 1990.

# « دڵزار »

# دوێنێ و ئەمڕۆ

« دڵــــــزار 1920 – ؟ »، وەک کۆمـۆنیسـتێکی کـورد، نەک وەک کـوردێکی کۆمۆنیـست، وەک ئەندامێکی « پارتی کۆمـۆنیستی عێراق »، زۆربەی زۆری کـات، لە دید و بۆچوونی بیـری « عـێـراقـچـێـتـیـی » و لە ڕوانگەی باوەڕی ئینتەرناسێنالیزمەوە، لە زۆربەی کێشەکانی دەوروبەری خۆی ڕوانیوە.
بۆیە، هەر لە سەرەتای چلەکانی چەرخی بیستەوە، هەر هۆنراوەیەکی گوتبێ، زۆربەی زۆری، بۆ ڕێباز، ئایدۆلۆژیا، بیر و فەلسەفەکەی خۆی تەرخانکردووە.
هـەرچەندە، زۆربەی زۆری هـۆنراوەکانی، بە کوردیی هۆنیـوەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دە هۆنراوەی بۆ بۆنە جیاجیا و هاوڕێ کۆمۆنیستەکانی خۆی، بە زمـانی عـەرەبیی داناوە. وەک: (حکومـه عـبدالسـلام عـارف، جـمـال بلادی، انشـوده الـعـمـال، شـبـاب الصین، طلب و صـفـه، الی الزمـیله عـائده، الی المتـرجـمـه « مـایا »، الی فـاضله، الی الرفـیق عزیز مـحـمـد بمناسـبه منحـه وسامین عالمیین، حول شرح المقالات)«365 - 374»
« دڵزار »، یەکێ لەو هـۆنەرە کۆمۆنیسـتانەی کوردە، چەندین هۆنراوەی « بە بۆنەی خۆبەدەستەوەدانی ژاپۆنەوە 1945، یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر1949، بۆ هاوڕێیانی نەمر 1949، فریشتەی ئاساییش 1950، ڕۆژی چـین 1950، لـە بیرەوەوری161 ساڵەی شۆڕشی فرەنسەدا 1950، یادی دووەمی ڕاپەڕینەکەی « 27ی ژەنـیـوەری1948» 1950، شـاگـردانی فـەهدین 1950، ئێـمـە چین؟ 1950، سوێند1951، سوپای سوور 1951، پۆرسەعید 1956، کۆدەتای 14ی ئۆگـەسـتی1958، مـارکس، ئێنگلز، لێنین، فـەهد، هۆنەرەکـانی ڕووس وەک: پووشکین، لیـرمنتـۆف، بلۆک، یەسـینین، هێندێ هۆنەری گـەلانی دیکە، بۆ هاوڕێ شەهیدەکانی خۆیان و عەزیز محەمەد، چەن جارێ بۆ یەکی ئایار ... ) داناوە.

سەیر ئەوەیە، هۆنەرێکی کۆمۆنیستی وەک « دڵزار »، ستاییشی پەیامبەری ئیسلامیشی کردووە، هۆنراوەیەکی جوانی چواردە نیودێڕیی هۆنیوەتەوە، کە ئەوەیان بۆ کۆمۆنیستەکان بڤەیە! کەچیی، لە دیوانەکەیدا نییە و تۆماری نەکردووە! هەڵبەتە، ئەو هۆنراوەیەی سەردەمێ گوتووە، باوەری بە ئایین هەبووە، ئەو کاتە، لە ریزی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا کاری نەکردووە. دواییش، کاتێ ئەو باوەڕەی وەرگرتووە، لێی پەشیمانبۆتەوە، بۆیە، بلاوی نەکردۆتەوە! بەلام هۆنراوەکە لە دیوانەکەدا، بە شێوەی پێنجخشتەکییەکی « راجیی »، لە سەر هەڵبەستی « دڵزار »، ساڵی « **1941** » هۆنراوەتەوە و بڵاوکراوەتەوە. دیارە، هەموو دوا دوو نیوەدێڕی هەر پێنجخشتەکییەک، لە بنەڕەتدا « دڵزار » گوتوویەتی. با لێرەدا، دوو لەو پێنجخشتەکییانە، پێشکەش بە خوێنەران بکەین:

هەر دوو هۆنەر، « ڕاجیی » و « دڵزار »، لە سەرەتادا گوتوویانە:

ئەصڵی هونەر و فەصڵی هەموو ڕازە محەمەد
تیشکی سەحەری ڕۆژی پڕ ئاوازە محەمەد
مێشکی صدفی کۆمەڵی دەم سازە محەمەد
شۆخێکە لە ناو عالەمی مومتازە محەمەد
خاوەندی هەزار ئایەت و ئیعجازە محەمەد

لە دوا پێنجخشتەکییشدا گوتوویانە:

جان خادمی دەرگانەیەتی، بێ خۆر و بێ خەو
دڵ عاشق و پەروانەیەتی، ڕۆژ و ئەگەر شەو
تۆش هەر وەکوو « ڕاجیی »، بە خوا مەحوی لە پڕتەوە
« دڵزار » مەبە غافڵ، لە جیهەت مەدح و ثەنای ئەو
بۆ ڕاهی نەجات مەتڵەب و دڵخوازە محەمەد «**292 - 293**»

کەچیی، لەو سەردەمانەدا، ناوی کوردی بە دەگمەن نەبێ، لەگەڵ بابەتی ئەو هۆنراوانەدا تێکەڵ نەکردووە، یا هەر زۆر بە دەگمەن، هۆنراوەی بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی گوتووە. جگە لەوەی، چەندین سروود و گۆرانیی وەک: « داری ئازادی **1946**، گۆرانی کارگەران **1950**، گەنجی وریا ڕاپەڕن، برایانی مەکتەب و گۆرانی ڕەنجبەران » داناوە، لە هیچیاندا، باسی کوردی نەکردووە، وەک ئەوەی، خەڵکی ئەم « کوردستان »ەش نەبووبێ، وابووە! یا، گەلی کورد لە « باشوور » بە تایبەتیی و نەتەوەی کورد لە « کوردستان »ی مەزندا بە گشتیی، لە بەهەشتی بەرینی سەربەخۆیی و سەربەستیدا ژیابن! هیچ جۆرە گرفتێکی نەتەوەیی و ڕامیارییان نەبووبێ!!!

دیاره هەر کاتێ، هەر کوردێ، بەرژەوەندیی « تەسکی پارتایەتیی، ئایدۆلۆژیا، بیر، فەلسەفە و نەتەگەلێتیی »، پێش بەرژەوەندیی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیەوە خست، هەر بەو شێوەیەی لێ دەردەچێ، ڕوو لە ڕووگەیەکی نارەسەن و پشت لە نیشمانەکەی خۆی دەکا، هەستی نەتەوەیی گەلێ لاواز دەبێ.
لەو چەن جارەی، هۆنراوەی بۆ « نەورۆز »یش هۆنیوەتەوە، لە هێندێکیاندا، ناوی کوردی نەبردووە، تەنیا باسی کەژی بەهار و مێرگی گوڵانی کردووە. لە هێندیکی دیکەشیاندا، وەک « نەورۆزنامە »ی ساڵی**1946**، بۆ کوردی داناوە.
بەڵام، لە « نەورۆزنامە »ی ساڵی **1951**دا، هۆنراوەکەی بە هەر دوو دەوڵەتی کۆمۆنیستی « چین » و سۆڤێت »ەوە بەستۆتەوە، وەک ئەوەی لە جێگەیەکدا گوتوویەتی:

ئێستە، پاشی شۆڕشی گەورەی « لینین »
دوای ڕمانی « هتلەر » و نازیی بەزین
پاشی دامەزرانی یاسای حوکمی « چین »
هەر وەکوو بورکانە، سەرپاکی زەمین
بۆ نەمانی فاشیزم، مەرگی ئیمپریالیزم
تێئەکۆشن، میللەتانی حەقخوراو
دێنە کۆڕی کار و کۆشش، گەنج و لاو
ڕائەدەن خاشاکی ژین، وێنەی شەتاو
بۆ وەدیهێنانی ئازادی تەواو
شۆڕش و جەولان ئەکەن، ماڵ و سەر قوربان ئەکەن «**29**»

« دڵزار » وردەوردە، نێوەڕۆکی هۆنراوەی نەورۆزەکانی، گۆڕانی بە سەردا هاتووە. لە چاو نێوەڕۆکی نەورۆزەکانی سەرەتای هۆنراوەدانانیدا، نێوەڕۆکی نەورۆزەکانی دواتری، پتر بەرەو نەورۆزێکی نیشتمانیی و نەتەوەیی ڕۆشتووە.
بۆ نموونە: لە دوا هۆنراوەی نەورۆزدا گوتوویەتی:

خوێنی سووری نەوجەوانانت، دەسا ئەی نیشتمان
خوێنی پێشمەرگەی بەجەرگ و چاونەترس و قارەمان
سیری چۆن وا بوو، بە زەیتی مەشخەڵی ڕێگەی ژیان
مژدەبێ ئەی کورد ! کە نەورۆز پێشڕەوی سەربەستییە
مژدەهێنی ڕۆژی ئازادیی، لە دیلیی و پەستییە! «**361**»

هەڵبەتە، « دڵزار » زۆر حەزی لە ڕۆژی نەورۆز کردووە، بۆیە، هێندەی پێدا هەڵداوە. چونکە، لە هۆنراوەی « نەورۆز »ی ساڵی **1946**دا، کۆتایی بەم دوو نیوەدێڕە هێناوە و گوتوویەتی:

ئیتر « دڵزار »، کە خۆشیی زۆر لە نەورۆز دێ، بزانن بەس
مرازی یادی پێشینە، نەوەک دەرخستنی دینە! «168»
هەڵبەتە « دڵزار »یش، یەکێ لەو کۆمۆنیستانە بووە، لە درزی جیهانبینیی
کۆمۆنیزمەوە، تەماشای « کوردستان »ی کردووە، بۆیە، کێشە و گرفتە
سەرەکییەکانی نەتەوەکەی پشتگوێخستووە. جا گەر وانەبووایە، هەڵبەتە،
دوای حەفتاودووساڵ تەمەن، بە شتەکاندا نەدەچۆوە، وەک پەشیمانییەک،
هەستی خۆی دەنەدەبڕی و بە چوارده نیوەدێڕ، هۆنراوەی « حەفتاودوو ساڵی
تەمەنم ڕۆیی » نەدەهۆنییەوە و نەیدەگووت :

هەشتی یەکی هەزار و نۆسەدونەوەتودوو
حەفتاودوو ساڵی ڕەبەق، لە تەمەنم تەواوبوو
وەک کەسانێکی ئازاد، ژینی ئاسایی نەژیاین
دوای بەندیی و پارتیزانیی، ئێستاش وا لە غوربەتاین
بەڵام ئەوەی، کە مایەی سەربەرزیی و شانازییە
سەرشۆڕنەکرنمان و خەبات و گیانبازییە
خۆری ژیانم ئەوا، بەرەو دەم کەلی نەمان
پلەپلە، پێبەپێ، دادەبەزێ بێوچان
کەچیی تازە خەریکە، ئەلف و بێی ژین تێبگەم
وەک درەختێکی بەردار، بۆ گەلەکەم پێبگەم
ئاخ کە ماوەی ژیانمان، کورتە چی پێ ناکرێ
ویست و خولیا و خەیاڵمان، هیچیان ئەنجام نادرێ!
بەڵام گومانم نییە، ڕۆڵانی « کاوە »نەژاد
« کوردستان » دەگەیننە، ڕیزی گەلانی ئازاد 1992.1.8 «265»

هەڵبەتە، کاتێ « دڵزار »، تێکشکانی کۆمۆنیزمی بە چاوی خۆی دیوە،
دەوڵەتە سۆسیالیستەکان هەڵوەشاونەتەوە، هەموو ڕاستییەکان بۆ کۆمەڵانی
خەڵک دەرکەوتوون، دیارە، ئەو کاتە ئەویش گۆڕاوە. بە تایبەتیی، کاتێ پارتی
« بەعس »ی فاشیی، لە « بەغدا »ی پێتەخت هەڵیکەندن، بڕیاری پاکتاوکردنی
دان، سەرکردە کۆمۆنیستەکانی قەڵای قایمی ئاشتیی، ئازادیی، پشتگیریی و
سەربەخۆیی گەلان « یەکێتیی سۆڤیێت »، سرتە و بۆڵەیەکیان لێوە نەهات،
پشتوپەنای ڕاستەقینەی هاوڕێیان، تەنیا هەر، چیا سەرکەشەکانی دایکی
نیشتمان و ڕێکخراوە « کوردستانیی »یەکان بوو، « دڵزار » بە چاوی خۆی،
باری نالەباری دواکەوتووی کۆمەڵی کوردەواریی بینی، بەشداریی لە خەباتی
ڕامیاریی و چەکداریی گەلەکەیدا کرد، ئیدی ئەو کاتە، پتر هۆشی بە بەر

خۆیدا هاتۆتەوە. ئینجا بە تەواویی، ڕووی لە گەل و خاکەکەی خۆی کردووە و زۆر بە کوڵودڵەوە، پێیدا هەڵداون. هەروەها، کارەساتە گەورە و جەرگبڕەکانی نەتەوەکەشی، تا سەر مۆخ و ئێسک، کاری لە بیر و هۆشی کردووە، بە تایبەتیی، ژاربارانی «هەڵەبجە»، تێکشکانی شۆڕش و دوورکەوتنەوە لە نیشتمان، ئەمانە هەموویان، بە تەواویی، هۆنەریان هەژاندووە، چزوی ژانێکی گەورەی بێ وێنەیان، لە جەرگ و دڵی چەقاندووە. بۆیە، هەرچی چۆنێ بووبێ، ساڵی «1986»، دەنگی هەڵبڕیوە، هاواریکردووە، داوای یەکێتی ڕیزەکانی کوردی کردووە و گوتوویەتی:

ئومێدم وایە، نەمرم، تا، ڕژێمی فاشیی دەمرێنم
کفن نەکرێم، هەتا، کفنی بەری ئەم کوردە دەدڕێنم «263»

هەروەها، ڕۆژی «09 .01 .1991»، دەربارەی یەکێتی ڕیزەکانی نەتەوەی کورد گوتوویەتی:

زازا و کرمانج و سۆران لوڕ و کەڵهوڕ و گۆران
هەر شەش بە دەست و بردن بڕبڕەی پشتی کوردن
گەر یەکدڵ بن ئەمانە هەموو بەڵای زەمانە
زۆردارانی سەر زەوی سەرمان پێناکەن نەوی «264»

ئەز، لەو باوەڕەدام، هەموو ئەو کۆمۆنیستانەی، بەو شێوەیە، پشتیان لە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان کردووە، نەک هەر تاوانێکی گەورەیان بە ئەنجامداوە، بەڵکوو، لە لایەکەوە: ئەو هەموو وزە و توانا کوردییەیان، بە فیڕۆداوە. لە لایەکی دیکەشەوە: گۆڕەپانەکەیان، بۆ کەسانی لاواز، نەخوێندەوار، نادڵسۆز و هیچ نەزان چۆڵکردووە. لەبەرئەوە، ناپاکییەکی گەورەیان، لە خۆیان و نەتەوەکەیان کردووە. چونکە، تا ماڵ وەستابێ، مزگەوت حەرامە! هەر کەسێکیش هەڵەیە بکا، سوور بزانێ، ئەوە هەڵەیە و هەر بیشیکا، ئەوا بەپێی هەموو بیروباوەڕێ، لەو کەسانە تاوانبارترن، کە لە نەزانییەوە هەڵەدەکەن. وەک «دڵزار» خۆشی، لە تاکە دێڕە هۆنراوەیەکدا، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

کارێ نەیزانی، بیکەی خەتایە
وەگەر بیزانی و بیکەی بەڵایە «223»

سەرەڕای، ئەو هەموو تێکشکان و هەرەسە گەورانەی، بە سەر ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد و شۆڕشەکانیدا هاتووە، هێشتا «دڵزار»، ورەی گەلێ بەرزبووە و پێشبینییەکی ڕاستی کردووە. چونکە، ڕۆژی «03 .08 .1990»، لە هۆنراوەی «کورد گەوهەرێکە ناتوێتەوە!»دا، هۆنەر، بە بیستودوو نیوەدێڕ

هۆنراوە، باسێکی ئازایی، نەبەزیی و خۆڕاگریی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردی، بۆ کـردووین، مـژدەی ئەوەی داوینەتێ، نەتەوەی کـوردیش، وەک هەمـوو نەتەوەکانی دیکەی جیهان، مافی سەربەخۆیی و سەربەستیی بەدەسدێنێ، ئاڵای « کوردستان » هەڵدەکا. بۆیە گوتوویەتی:

کزیی و کەساسیی سەرتاپای عومرم
کاتێ کۆتایی پێ دێ، کە بمرم
ئەگینا، هەتا لە ژیندا ماوم
لە ژێر باری غەم، زار و چەماوم
ئەو شانازییەی، لە دڵما گەرمە
تەنیا پتەویی، بیر و باوەڕمە
هەرچەندە، حەسرەتم ئەوەیە کەوا
تام ناکەم، بەری درەختی هیوا
ئەو هیوا گەشەی، کە پەنجا ساڵە
مێشک و قەڵەمی منی، عەودالە
لە دوا دەیەکی، سەدەی بیستەمدا
لە ناو دۆزەخی، جەور و ستەمدا
« کوردستان »، هەرگیز ناسڕێتەوە
کورد، گەوهەرێکە ناتوێتەوە!
کاروانی مێژوو، هەرگیز ناوەستێ
کوردیش، هەر وەکوو گەلان هەڵدەستێ
بە کوێری چاوی، هەموو فاشستان
میلیتاریستان، کۆنەپەرستان
وڵاتی، لە چنگ دوژمن دەردێنێ
سیستێمی حوکمی، خۆی دەچەسپێنێ
ئاڵای ئازادیی دەشەکێتەوە
وەک هەموو گەلان دەحەسێتەوە «258 - 259»

بەڵام خـوا هەڵ ناگـرێ، « دڵزار »، یەکێ لەو هـۆنەرە کـوردە هەسـت ناسـک و جوانپەرستانەیە، کە بە تەواویی، شەیدای جوانیی سروشتی نیشتمانەکەی خۆی بووە. بۆیە، گەلێ هـۆنراوەی جوان و شیرینی، بە سەر « کـوردستان » و سروشتە خۆڕسکەکەیدا هەڵداوە، بە تایبەتیی، چەن جارێ، باسی بەهار و نەورۆزی کردووە. سالی « **1946** »، لە هۆنراوەی « کوردسـتان »دا، بە سێ پێنخشتەکیی گوتوویەتی:

« کوردستان » جوانی، یەکجار شیرینی
بێ شک، بەهەشتی سەر ڕووی زەمینی
خاوەن غیلمان و حۆری نەخشینی
داییم، ڕازاوە و جوان و ڕەنگینی
هەوێنی ژینی
سەراسەر، شاخ و باخ و گوڵزاری
پڕ لە سولاف و کانیی و ڕووباری
یانە و هێلانەی قومریی و هوزاری
نەخشاوی دەستی پەروەردەیگاری
بووکی بەهاری
دایکی دڵنەرمی، ڕۆڵەی کوردانی
لانەی شێرانی، « زەند » و « بابان »ی
خاکی « کرمانج » و « زازا » و « سۆران »ی
ڕاوگە و هەوارگەی « لوڕ » و « گۆران »ی
جێی « ئەردەڵان »ی «86»

« دڵزار » پێی وایە، ئەو بەهەشتەی یەزدانی گەورە، لە پەرتووکە پیرۆزە ئایینییەکدا باسیکردووە، بەڵێنی بە خواپەرست و خاوەن باوەڕەکان داوە، لە ئاوی شیرین و سازگاری، کانیی بەهەشت بچێژن، تامی میوەی بە تامی بکەن، لە « کوردستان »ەکەی خۆیدا، لە مێژە، خوا پێشکەش بە نەتەوەی کوردی کردووە. بۆیە گوتوویەتی:

بەڵێ، ئایینمان بەڵێنیداوە
بەهەشت، بۆ ئێمە تەرتیبدروا
بە حۆری جوان و گوڵشەن و ئاوی
کەوسەری شیرین نەخشیکراوە
جا هەر جار، خاکی کوردان ئەبینم
کانیی و سەرچاوە و باغان ئەبینم
کە پڕ لە شۆخی ناوقەد باریکن!
ئەڵێی لە خولدام، ڕیزوان ئەبینم! «309»

لە هۆنراوەی « گەردانەی پەریخان! »دا، هەستێکی گەلێ ناسکی، دەربارەی کیژە کوردێ دەربڕیوە و گوتوویەتی:

لە شەونمی بەرەبەیان
لە ئەستێرەی گەش و جوان

لە مرواریی و لە مەرجان
بۆ گەردنی « پەریخان »
ئەهۆنمەوە جوانترین
گەردانەی عیشق و ئەڤین
گەردانەیەک کە سەنگی
هێژاتربێ لە ڕەنگی
لە نایابیی و قەشەنگیی
چ کەس نەگاتە چنگی
ورشەی وەک ڕۆژی ڕووت بێ
بە ڕاستیی، سیحری ڕووت بێ! «142»

لە هۆنراوەی « سەردەم گۆڕاوە! »دا، « دڵزار » بە دوو تاکە هۆنراوە، هەستی خۆی دەربڕیوە و ئەوەی درکاندووە، کە سەردەمەکە چۆن بێ، ئەویش وا دەکا، بۆیە گوتوویەتی:

ئەوەی لەمەولا دەینووسم، هەرگیز
تەوری زەمانە نایبڕێتەوە
لافاوی کەفوکوڵی شۆڤێنیست
وەک جاری جاران، نایسڕێتەوە «253»

بە داخەوە، مێژووی نووسینی هۆنراوەکەی لە سەر نییە، تا بەتەواویی بزانین، لە کەیەوە، ئەو بڕیارەیداوە و شۆڤێنیستەکانی پشتگوێخستووە! وا دیارە، جاران هێندێ هۆنراوەی، بۆ گەل و نیشتمانەکەی نووسیوە، بەڵام، هاوڕێ عەرەبە کۆمۆنیستەکانی، لایان باش نەبووە، بە دەمارگیریی نەتەوەییان زانیوە! بۆیە گوتوویەتی: سەردەم گۆڕاوە. ئەگینا، گەر شۆڤێنیست، مەبەستی لە عەرەبەکانی ناو پارتی « کۆمۆنیست » نەبووبێ، مەبەستی لە کاربەدەسانی « بەعس » بووبێ، بۆ « بەعس »، هیچ کاتێ سەردەم نەگۆڕاوە! چونکە، ئەوان ئەوەتەی هەن، لەو بوارەدا نەگۆڕاون، کەمتەرخەمییان نەکردووە، ئەوەی پێیانکرابێ، هەرگیز سڵیان لە کەس و لە هیچ شتێ نەکردۆتەوە و کردوویانە!

« دڵزار »، لە هۆنراوەی « تاکەی »دا، گەلێ ڕەخنەی، لە خووڕەوشتە خراپەکانی، ڕۆڵەکانی گەلەکەی گرتووە، هوشیاریکردوونەتەوە و گوتوویەتی:

ئەی کوردە! تا کەی خەریک تالانی
خەریکی ماڵی خوێش و خزمانی؟
تا کەی، حەزئەکەن بە زەللەی یەکتر؟
تا کەی، هەر تینوون بە کەللەی یەکتر؟

تا کەی تێ ناگەن؟ تا کەی پێ ناگەن؟
تا کەی، بە پەند و بێژی کەس ناکەن؟
تا کەی فەسادیی؟ تا کەی کەسادیی؟
تا کەی هەر تیژی، لە سەر عینادیی؟
تا کەی مەینۆشیی؟ تا کەی بێ هۆشیی؟
تا کەی وولات و میللەت فرۆشیی؟
تا کەی، خەریکی رامیی و پۆکەری؟
تا کەی، مەراقی کاریی و جۆکەری؟
تا کەی حەقنێژی؟ تا کەی خوێنرێژیی؟
گلۆلەی ژینت، وا کەوتە لێژیی
تا کەی، لە دەقنی مەینەت چەقیون
لە ناو میللەتان، هەر وەک هەتیون؟
تا کەی، مەحکومی تەکییە و خانەقان؟
تا کەی بۆ وەتەن، بێ وەعدە و بەقان؟
تا کەی هەر ڕازین، بە نیری ملتان؟
تا کەی هەست ناکەن، بە زامی دڵتان؟ «303 - 302»

« دڵزار »، ڕۆژی « شـەشی ئـەیلوول »ی لە بیـر نەچووە، وەک زۆربەی هـۆنـەرە نیـشـتـمـانپـەروەرەکـانی دیکەی کـورد، یادیکردۆتەوە، دوای یازدە سـاڵ و لە ساڵی « 1941 »دا، هۆنراوەی بۆ گوتووە و گوتوویەتی:

ئەم ڕۆژەیە، ڕۆژی شەشی ئەیلوولێ لە عالەم
ڕۆژێکی گەلێ شووم و بەدی کوردی هەژارە!
ڕۆژێکە، پڕ ئاشووب و غەم و مەینەت و ئەستەم
ڕێژنەی خەفەت و غەم، وەکوو بارانی بەهارە!
ئەم ڕۆژەیە، ڕۆژی خەفەت و شیوەن و گریان،
ئەم ڕۆژەیە، ڕۆژی ڕەشی شوومی گەلی کوردان! «362»

« زەردەشت »، کوڕی « خەجێ » بوو، پێشمەرگەیەکی « باکووری کوردستان » بوو. کاتێ بە کەڵەک، لە ئاوی « خابوور » پەڕیونەتەوە، « زەردەشت » پەڕیوە و لە ئـاودا خنکاوە. « دڵزار »ی هـۆنەر، هەسـتـی نەتەوەیی پـاڵی پێـوە نـاوە، لە شارۆچکەی « قامیشلیی »، ڕۆژی « 23 .12 .1983 »، هۆنراوەیەکی درێـژی، « لە چلەی خنکانی زەردەشتی جوانەمەرگدا » هۆنیوەتەوە، باسێکی جوانی خنکاندنی، ئەو ڕۆڵە کوردەی کردووە، ئەو ڕووداوەشی، بە ژێردەسیی کوردەوە گرێداوە. ڕووی دەمی لە « خەجێ »ی دایکی کردووە و گوتوویەتی:

هۆ « خەجۆ !» خوشکا من « خەجۆ »
هەر وەک گرانە دەردی تۆ
دەردی مەژ هەمی گرانە
زۆر بە ژانە
خەفەت مەخۆ
خەفەتخواردن بێ هوودەیە
پێم نالێی، کێ ئاسوودەیە؟!
مالوێرانیی میللەتی کورد
لە سەرتاسەری « کوردستان »
هەر لە گەرمێن، هەتا کوێستان
لە چنگ توورکی میلیتاریست
سەگی پاسی کۆلۆنیالیست
« عێراق »ی چەپەلی فاشیست
« ئێران »ی پڕ کەڤنەپەرست
گوهی دنیا، تەژی دکا
نەفرین ژ خوینمژی دکا

خوشکا دەلال!
هەر وەک « زەردەشت »ی بچکۆلە
دەیان زارۆک، دەیان ڕۆلە
لە « داکان » و لە « سۆیا »
ژ گەل داک و باب و کالان
بە دەستی چەپەلی شەقی
بە ناهەقی
خڕ، ئاگریان تێ بەردرا
هەر وا لە « قارنە » و « نەغەدە »
زارۆک و لاو و پیر و پیرەک
خەلکی بێ تاوان و بێ چەک
بە نارەوا
خوێنیان ڕژا «200-201» *

« دلزار »، وەک هەموو هۆنەرەکانی دیکەی کورد نەیتوانیوە، لە ئاستی تراژیدیای کیمیابارانی شاری شیرنی « هەلەبجە »دا بێ دەنگبێ.

بۆیە، ڕۆژی « 10 - 12 .04 .1989 »، هۆنراوەی « سروودێک بۆ هەڵەبجە »ی داناوە. هەستی پەستیی و دەردی دەروونی خۆی دەربڕیوە. دوای ئەوەی، باسێکی جوانیی دەشتی پان و بەرینی سەوزی « شارەزوور » و کەژی بەهاری نێوچەکەی کردووە، لە باری ژیان و ئارامیی دانیشتووانەکەی دواوە، دەسی چەپەڵی داگیرکەری « بەعس »ی خستۆتەڕوو، وێنەیەکی ژاربارانی شارۆچکەی « هەڵەبجە »ی پیشانداوین، دەربەدەریی و پەرەوازەیی خەڵکی بێ تاوانی بۆ گێڕاوینەتەوە، ڕووی دەمی لە گەلەکەی کردووە و گوتوویەتی:

هەزاران ساڵە
لەماڵی خۆتا
لە خاکی خۆتا
بێ خاک و خۆڵی
ئێستا وەک قەرەج
بێ نیشتمانی
وەکوو گەڕیدەی
کەشکۆڵ بە کۆڵی
بێ نیشتمانی
هەرچەندە « کوردستان »
نیشتمانێکی
پان و بەرینە
هەر لە سەردەمی
« گۆتۆ » و « میدیا »وە
سەرچاوەیەکی
ژیار و ژینە
بە هۆی فاشست و
میلیتاریست و
کۆنەپەرستان
خاکمان وێرانە
گەلمان دەربەدەر
دوورە وڵات و
پەرتی شارانی
تێکڕای جیهانە
پاش « هێرۆشیما » و

« ناگازاکی »
کارەساتی وا
هیچ ڕووی نەداوە
نەک هەر « هەڵەبجە »
چوار هەزار گوندی
« کوردستان »ەکەم
خاپوورکراوە «234-233»

« دڵزار »، گەلێ گۆرانیی، بۆ گەلانی جیهان و پیاوە ناودارەکانیان چڕیوە، گەلێ هۆنراوەی، بۆ بۆنە و یادی کۆمۆنیستەکان هۆنیوەتەوە. بەڵام، لە ئاستی ڕووداوەکانی « کوردستان » و کارەساتە جەرگبڕەکانی نەتەوەی کورددا، دەنگ لە بەردەوە هاتبێ، دەنگ لەو پارتانە و گەلە پێشکەووتووخواز و شۆڕشگێڕانەوە نەهاتووە!

وا دیارە، هۆنەر بەرانبەر ئەو لایەنانە، تووشی ڕەشبینیی و نائومێدییەکی زۆر گەورە بووە. بۆیە، ڕۆژی « 01 .04 .1989 » و لە شاری « دیمشق »، هۆنراوەی « کوردقڕان »ی هۆنیوەتەوە، ڕووی دەمی گلەیی و ڕەخنەی تێ کردوون، زۆر بە ڕاشکاویی گوتوویەتی:

مردنی چەند حووت لە ناو دەریادا
کارەساتێکی گەورە و گرانە!
ڕەگ دەرێنانی کورد لە بنیادا
ئاخۆ، لەبەرچی سووک و ئاسانە!
کوانێ هاوکاری ئینتەرناسیۆنال
وا بە زیندوویی، دەخرێینە ناو چاڵ! «248»

« دڵزار »، تا بە هەورازی تەمەندا هەڵکشاوە، تا دەرد و مەینەتیی پتری دیوە، تا ژانی دوورە وولاتیی، پتر جەرگی بڕیوە، ڕۆژبەڕۆژ پتر، ملی ڕێی پیرۆزی خەباتی کوردایەتیی گرتووە. بۆیە، لە هۆنراوەی « لافاوی مێژوو بەربەست ناکرێ »دا، ڕۆژی « 22 .07 .1990 »، لە شاری « ستۆکهۆڵم »، بە حەوت چوارینە گوتوویەتی:

گەلێ کە بیەوێ، ئازادبێ، ئەوا
دەبێ، بە جەرگەی ئاگردا بڕوا
خودی دەروازەی شۆڕشە، کەوا
بەرەو ڕزگاریی و خۆبوونی ئەبا

جۆری خەباتمان، لەم کات و وەختە
یەکجار دژوار و ئاڵۆز و سەختە
بەڵام، ڕزگاریی و ئازادیی میللەت
کارێکە لای من، ڕووناک و جەختە

با هەندێ جاریش، کوردی بێ ئەنوا
لە بەر هەژاریی و نەبوونی بڕوا
وا هوزران بکا، مێژوو ڕاوەستا
ئیدی دژوارە، ئەم حاڵە بڕوا

بەڵام، بە دار و بە زنجیر و زیندان
بە ڕێژنەی گوللە و لە سێدارەدان
بە وێرانکاریی و ئاگر تێبەردان
ناگیرێ بەری، لافاوی گەلان

لافاوی مێژوو، بەربەست ناکرێ
میللەتی زیندوو، هەرگیز نامرێ
خاشاکی ژیان دەبێ، ڕادرێ
ژینی سەربەستیی، وولات داگرێ

ئەو ڕۆژە هەر دێ، خاکی نیشتمان
لە پڕ بە جارێ، ببێ بە گڕکان
کورد گەرم و گوڕتر، بێتەوە مەیدان
وەرگێڕێ، تەخت و بەختی فاشستان!

هەزاران « کاوە »ی دلێر و بێ باک
بۆ وەرگێڕانی تەختی « ئەژدەهاک »
دڵیان داناوە، لە سەر لەپی دەست
بۆ نەورۆزێکی ڕەنگین و ڕووناک « 250-251»

« دڵزار »، ڕۆژی « 1991. 12. 06 »، لە شاری « ستۆکهۆڵم »، لە هۆنراوەی « خۆری ئازادی هەڵدێ! »دا، بەرانبەر دواڕۆژی گەلەکەی، گەشبینییەکی زۆری پیشانداوە و بە چواردە نیوەدێڕە هۆنراوە گوتوویەتی:

کاری نەما، ڕۆژی بڕا میرغەزەب
نەشێ نها قرِکا، بە ڕاستە و بە چەپ
بڕیاری گەل حوکمە، دەبێ، بێتەدی
بکرێ بە پەند، ماکی نەیاریی و بەدیی
تەختی لەگەڵ عەردا دەبێ، تەختکرێ
حیسابی خۆی و تاقمەکەی سەختکرێ
وەک « هیتلەر » و « ئەتاتورک » و « ئەژدەهاک »
ڕەمزە، بۆ پیاوی بێ ویژدان و ناپاک
تا کورد هەبێ، کە هەر دەبێ، دەمێنێ
گۆمی دنیای بێ دەنگی، دەشڵەقێنێ
پەیامی کورد دەدا، بە تێکڕای گەلان
کە تا بەکەی، داگیرکرێ « کوردستان »
بەیانە، خۆری ئازادیی وا هەڵدێ
نیروی شەڕ و شومی زۆرداریی، هەڵدێ! «**261**»

سەیر ئەوەیە، هۆنەرێکی وەک « دڵزار »، ڕۆژی « **11 .08 .1941** »، هۆنراوەی بۆ چوارەمین بیرەوەریی « بەکر سدقی » نووسیوە و شینی بۆ گێڕاوە! چونکە، « دڵزار » ئەو کاتە، وەک کۆمۆنیستێ، لە « بەکر سدقی » نەڕوانیوە، بەڵکوو، وەک کوردێ تەماشایکردووە. ئەگینا، « دڵزار » و « بەکر سدقی »، دوو کەسی جیاوازن، دوو ڕێباز و باوەڕی جیایان هەبووە. با بزانین، چۆن لە « بەکر سدقی » ڕوانیوە:

دیسان، دووکەڵ و بوخاری ئەستەم
« کوردستان »ی گرت، چەشنی تۆز و تەم
باغی ژینی کورد، دیسان ساوابوو
ئەستێرەی بەختی، لە کەل ئاوابوو
هەیڤەکەی هیوای، پاش ئەوەی گەشبوو
بە هەوری مەینەت، تاریک و ڕەشبوو
ئاسۆی ئاسمانی، لە بەر هەڵمی غەم
وا ڕەش داگەڕا، بێ هەور و بێ تەم
« نە باکەی وەعدە، ڕابرد و ئەنگووت
نە بولبول خوێندی، نە غونچە پشکووت »
لای هەموو لایێ، شینە بە دەورە
بۆ « بەکر سدقی »، سەرۆکی گەورە

حەیف لە کوردا، هەرچی پێگەیی
بە ژیر و بیر بوو، لە حەق تێگەیی
بە گوللەی گەرمی، دەستی دوژمن چوو
لە نامەی ژیندا، ناوبانگی وونبوو
ئەسەف، بۆ گەورەی شەهیدانی کورد
حەیف، بۆ باوکی هەژارانی کورد
دریغ، بۆ شێری نێری مەیدانم
بۆ « بەکر سدقی »، ڕەئیس ئەرکانم
بۆ جەنگاوەری، بەهێز و گوردم
بۆ « ناپلیۆن »ی، میللەتی کوردم
شەمعەکەی ژینی، وا تووایەوە
ڕەوشەنی نەما، چا کوژایەوە
زەمین، کە « بەکر »ی دیت لە خوێنی گەش
سینگی ولاکرد، هاویشتیە باوەش
بلێ: ئەی « دلزار »، هەژاری خەمبار
بە ڕۆلەی ووردی، کوردی سیاچار
گەر پرسیار ئەکەن، لە مێژووی مەرگی
لە ڕۆژی ڕەشی، پچڕانی جەرگی
لە چەرخی بیستەم، سالی سیوحەوت
یازدەی ئاغستۆس، لە ژێر خاکا خەوت «**295-294**»

با بزانین، کۆمۆنیستێکی وەک « دلزار »، چۆن لە ژنی ڕوانیوە؟ سالی «**1947**» لە هۆنراوەی « ژن »دا گوتوویەتی:

ژنی بەد، ژان و ژنگی ژیانە
گەر خۆتی لێدەی، مالت وێرانە
برای شیرینم، جوانی خولقوخوو
بە کارێ تۆ دێ، نەک هی ڕەنگوڕوو
ژنێ پەسەندکە، ڕەوشتی چابێ
چالاک و خێرا، ژیر و زانابێ
هاوڕێی ژیان و هاوڕێی بیرتبێ
لە بەندیخانان، هاوزنجیرتبێ
لە کۆبوونەوە و هەرا و هەلچوونا
لە ڕێی ئازادیی و سەربەخۆبوونا

هەردەم ئامادە و شانبەشانتبێ
لە تەنگانەدا، پشتیوانتبێ
هەر وەکوو « تانیا » و « ژاندارک » و « خانازد »
لە ڕۆژی شۆڕش، دوژمن کا بەرباد
منداڵی بچووک، زۆرباش بەخێوکا
نەک بیترسێنێ و هاواری دێو کا
سەری شەتەکدا و دەستی ببەستێ
هەر گریا، مەمکی لە دەم بپەستێ
بە شەولەبان و ئایشەگوێدرێژ
زراویبەرێ، بیکا گێژوویژ

* * *

دایکێکی وابێ، خەریکبێ هەردەم
ڕۆڵەی بە قیمەت، بێنێتە بەرهەم
مێشکی، بە بیری بەرز ئاوبدا
تاریکی جەهل و قینی قاوبدا
ئامادەیکا، بۆ بەرزیی وڵات
بۆ نەهێشتنی بەڵا و کارەسات
بۆ خۆشکردنی، ڕێگەی دڵشادیی
بۆ هەڵگرتنی، چرای ئازادیی
بۆ وەرگێڕانی، قەڵاتی زۆردار
بۆ دەرهێنانی، ڕەگی ئیستیعمار
بۆ ژیانێکی، پڕ کامەرانیی
بۆ خزمەتکردن، لە ڕێی نیشتمان «74 - 75»
ڕۆژی « 08 .05 .1973 »، لە هۆنراوەی « ئافرەت و جگەرە »دا گوتوویەتی:
ڕاستە، ئافرەت و جگەرە هەر دوو
سنگی پیاو دەکەن، شەکەت و ماندوو
بەڵام، پیاو تووتن دادەگیرسێنێ
ئافرەت، بێ پەروا، پیاو دەسووتێنێ «143»
لای خۆی، « دڵزار » کۆمۆنیستە، ئەوانیش، لە هەموو لایە پتر بەوە ناسراون، کە ڕێزی ژن دەگرن و داوای یەکسانیان بۆ دەکەن، کەچیی، لە دوو نیوەدێڕ هۆنراوەدا، چاکە و خراپەی ژنی تێکەڵکردووە و گوتوویەتی:

هۆی کلۆڵیی و کامەرانیی زۆرەها کەس، هەر ژنە
گەنترین مایەی ژیان و چاترین گەوهەر، هەر ژنە! «148»

* * *

---

**تێبینی:**

* هەروەها، هۆنراوەیەکی بۆ جوانەمەرگی شەهید « سمایلی شەریفزادە » گوتووە. « تەماشای لاپەڕە **228**ی دیوانەکەی بکە » .
« شەریفزادە » ڕۆژی « **1968. 05. 02** » ، لە سنگەری خەباتی کوردایەتییدا، بە دەسی لەشکری داگیرکەری ئێران شەهیدکرا.
ئەم گوتارە، لە گۆڤاری شیعرستان، ژمارە6، دزگەی سەردەم، سولەیمانیی،2001 بڵاوکراوەتەوە.

**سەرچاوە:**

دلزار، دیوان، چاپی یەکەم، سوید ـ ستۆکهۆلم، 1992.

# نەورۆزی کورد
# و
# هۆنراوە!

هەموو نەتەوەیەک، لە مێژووی کۆن و نوێی خۆیدا، گەلێ جێژن و بۆنەی جیاجیای « مێژوویی، ئایینیی، فۆلکلۆریی، کۆمەلایەتیی، نەتەوەیی، نیشتمانیی و ڕامیاریی » هەبووە و هەیە. هەر بە هەمان شێوەش، لە مێژووی نەتەوەی کوردیشدا، هێندێ جێژن و بۆنەی جۆراوجۆرمان هەبووە و هەیە.
بەلام، لە نێو کۆمەلی کوردەوارییدا، هیچ جێژنێ، هێندەی جێژنی نەورۆز، لە لایەکەوە، هەم کۆن و نەمر، هەم پیرۆز و خۆش نەبووە و نییە. لە لایەکی دیکەشەوە، گرفت و قۆرتی زۆری، لە بەردەمدا قووت نەکراوەتەوە. چونکە، داگیرکەران هەمیشە ویستوویانە، بۆنە نەتەوەیییەکانمان لێ قەدەغەکەن و لە بیرمانبەرنەوە، یا، بە تەواویی و لە ژێر هەر ناوێکدا بێ، ڕووی گەشی جێژنەکانمان بشێوێن. لەبەرئەوە، جگە لەوەی، زۆربەی کات لێیان قەدەغە کردووین، دوو جۆرە گرفتی سەرەکییشیان، لە بەردەم جێژنی نەورۆزدا قووتکردۆتەوە.
1. گەلێ جار گوتوویانە: جێژنی نەورۆز، جێژنێکی کۆنی ئاگرپەرستانە، لەگەل جێژنە کۆنە ئایینییەکانی کورد و فارسەکاندا تێکەلیانکردووە. بۆیە، بە کردەوەیەکی سەردەمی نەزانین و گومڕاییان داناوە. تەنانەت هێندێ جار، بە ناوی ئایینەوە حەرامیانکردووە. بەلام لە ڕاستییدا، جێژنی نەورۆز، هیچ جۆرە پێوەندییەکی، بە سەر بۆنە ئایینییەکانەوە نەبووە و نییە.

2. به داخەوە، هێندێ لە هۆنەرانی کورد، هەر دوو جێژنی « نەورۆز » و « دارودرەخت »یان تێکەڵکردووە. ئەمەش، بەپێی بەرنامەیەکی نەخشە بۆ کێشراو، سەرانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دایانناوە و هۆنەرەکانی کوردیش، زۆر بێ ئاگایانە پێڕەویانکردووە. تەنانەت، هۆنەرێکی وەک « ا. ب. هەوریی »، (« نەورۆز »ی هەر لە بیر حوکوومەت بردەوە، ئەو ناوینا « جێژنی دارودرەخت » و بە ئاوازێکی دڵگیر و خۆشەوە، سالانێک منالانی قوتابخانەکان تێیاندەچریکان:

جەژنی دارودرەختە کۆتایی ڕۆژی سەختە

نەمام بنێژە وەختە نەمام بنێژە وەختە )«47،1»

ئەگینا، جێژنی « دارودرەخت »، خۆی لە خۆیدا، جێژنێکی جیاوازە، نەک هەر لە « کوردستان »دا هەبووە و هەیە، بەڵکوو، لە زۆربەی وولاتانی جیهاندا هەبووە و هەیە، سالانە یادیدەکەنەوە و چەندین هەزار نەمام دەڕوێنن. لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، کەمێ دەربارەی ئەو جێژنە بدوێم.

جێژنی « دارودرەخت »، سەرەتا لە « ئەمێریکا » سەریهەڵداوە. کاتێ، گەلە جیاوازەکانی « ڕۆژاوای ئەورووپا »، ملی ڕێی کۆچکردنیان، بەرەو ئەوێ گرتۆتەبەر، نێوچەکان وردەوردە جمکووتبوون. دانیشتووانی ئەو نێوچانە، بۆ ئەوەی، پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دابینکەن، داری دارستانە چڕەکانیان بڕیوەتەوە، تا، لە لایەکەوە: جێکەی چۆڵکەن و بۆ کاری کشتوکاڵ تەرخانیکەن. لە لایەکی دیکەشەوە: خانوو و پێوسیستییەکانی نێو ماڵی پێ درووستکەن. ئیدی، بێ ئەوەی دوارۆژ لێکدەنەوە، بە شێوەیەکی زۆر خراپ، دارەکانیان بڕیوەتەوە. تا، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، پیاوێکی دڵسۆز و شارەزای وەک « جولیۆس مۆرتۆن » لە وولاتی « نبراسکا »ی سەر بە « وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا » پەیدابووە و هەستی بەو مەترسییە گەورەیە کردووە. لەبەرئەوە، « کۆمەڵەی دۆستایەتیی درەخت »ی دامەزراندووە.

پاشان، هەوڵێکی زۆری داوە، تا، چی دیکە لەوە پتر، دار نەبڕنەوە. لە هەمان کاتیشدا، بە شێوەیەکی بەردەوام، نەمام بڕوێنن. بەو شێوەیە توانی، سەرنجی میریی « نبراسکا » ڕاکێشێ و (ڕۆژێ دابنێ، بۆ چاندنی درەخت و ناوی لێ بنرێ « جێژنی درەخت » و لە پارەی میریی، بەشێ تەرخانکرێ بۆ ئەم ڕۆژە پیرۆزە. میریی « نبراسکا » پێشنیازەکەی « جولیۆسس مۆرتۆن »ی پەسەندکرد وە دایاننا ڕۆژی « 22 » نیسان کە ڕۆژی لەدایکبوونی « جولیۆسس مۆرتۆن »ە، بکرێت بە جێژنی درەخت. وە خەلات دانرا بۆ ئەو شارەی کە زیاتر لە شارەکانی تر درەخت دەچێنێ وە دەیپارێزێ. تاکوو وای

لێهات، ژمارەی چاندنی دار لە وولاتی « نبراسکا »، گەیشتە بیست میلیۆن درەخت لە ساڵێکدا.)«76،8»
پاشان، لە هەموو وولاتەکانی « ئەمێریکا »، چاویان لەم کارە باشەی وولاتی « نبراسکا » کرد، دارێکی زۆریان چاند، هەر وولاتێ، ڕۆژێکی تایبەتییشیان، بۆ جێژنی درەخت دانا. ئیدی وردەوردە، ئەم بیرەی « مۆرتۆن »، لە کیشوەرەکانی دیکەی جیهاندا بڵاوبۆوە. (لە ساڵی « 1946 »دا، لە « عێراق » شالیارگەی نێوخۆ ڕێیدا، بۆ دامەزراندنی « کۆمەڵی دۆستایەتی درەخت » لە « بەغداد ». بەڵام، ئیشی ئەم کۆمەڵە، تەنیا بۆ « بەغداد » سوودی هەبوو. لەم ساڵانەی دواییدا، بەڕێوەبەری گشتیی ویستی، ئەم بیرە جوانە تازەکاتەوە و ڕۆژێ دانێ، بە ناوی تاقیکردنەوە لەو جێیەی کە نەمامی میریی لێ دەچێنرێ. پارێزگەی « هەولێر » بۆ ئەم ئامانجە پەسەندکرا. بەڕێوەبەری گشتیی دارستان سێ هەزار نەمامی دا بە شارەوانیی « هەولێر » بە خۆڕایی. ڕۆژی « 1952. 03. 06 »، متەسەریفی « هەولێر » لەگەڵ فەرمانبەران و پیاوە بەڕێزەکانی شار و قوتابی و مامۆستایانی ئامادەیی دەسیانکرد بە چاندنی ئەم نەمامانە و ئاهەنگێکی جوانیان پێکهێنا و ئەمە بوو بە سەرەتا کە گەلێ شاری تر لە « عێراق » ڕۆژێ دانێن بۆ جێژنی درەخت.)«77،8»
بە ئەم باسەدا بۆمان دەردەکەوێ، « جێژنی درەخت »، هەمووی پەنجاونۆ ساڵ لە « عێراق » و پەنجاوسێ ساڵیش لەمەوبەر لە « باشووری کوردستان » پەیدابووە. بەڵام، جێژنی « نەورزۆ »، پتر لە سێ هەزار ساڵ دەبێ، لە نێو گەلانی « ئاریا »دا سەریهەڵداوە!
بە کوردیی و کورتیی: جێژنی نەورۆز، تا بەم ڕۆژەی ئەوڕۆی گەیشتووە، بە گەلێ قۆناغی مێژوویی گرنگ و ترسناکدا تێپەڕبووە. ڕۆژانێ بووە، یادکردنەوەی نەورۆز، لە ڕووی ئایینەوە، بە گومڕایی و ئاگرپەرستیی، لە ڕووی نەتەوەیییەوە، بە کۆنەپەرستیی و جیاوازیخوازیی دانراوە.
لەبەرئەوە، نەک هەر سەرانی دەزگەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، دژی نەورۆز وەستاون و قەدەغەیانکردووە، بەڵکوو، هێندێ لە پیاوانی ئایینیی و کۆنەپەرستەکانی کوردیش، شانبەشانی هێزەکانی داگیرکەر، بەو پەڕی توانایانەوە، بەربەرەکانیی و دژایەتییانکردووە، تەنگیان بە نیشتمانپەروەرانی کورد هەڵچنیوە. بۆیە، هێندێ جار لە نەورۆزدا، هەرا و ئاژاوە، پێکدادان و تێکبەربوون درووستبووە، سەر و گوێلاکی تێدا شکاوە، لە لایەن سیخوور و پۆلیسەکانی دوژمنەوە، خەڵکی نیشتمانپەروەری کورد دەسگیرکراون و لە قوژبنی گرتووخانەکان توندکراون.

ئیدی، هەر بەو شێوەیە، ڕۆژبەڕۆژ تا هاتووە، نەورۆز لای ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، خۆشەویستربووە و پتر چەسپیوە. جا، گەر کورد توانیبێتی، چ بە نهێنیی، چ بە ئاشکرا، چ بە خۆشیی، چ بە ناخۆشیی، هەموو ساڵێ، یادی جێژنی نەورۆزی خۆی بکاتەوە، یا، لە بەر هەر هۆیە بووبێ، نەیتوانیبێ، یادی ئەو جێژنە بکاتەوە، ئەوا، هیچی لە باسەکە نەگۆڕیوە، هیچی لە بایەخ و پیرۆزیی ئەو جێژنە، کەم نەکردۆتەوە. بەڵکوو، ساڵبەساڵیش تا هاتووە، ئەو جێژنە، لە نێو دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورددا، پتر جێی خۆی کردۆتەوە، ئازیزتر، گەشەدارتر و پرشنگدارتربووە، ناوەڕۆکە نەتەوەیی و ڕامیارییەکەشی گۆڕاوە، دەوڵەمەنتر و قووڵتربۆتەوە.
بۆیە، نیشتمانپەروەرانی کورد، هەمیشە یادیانکردۆتەوە، خۆپیشاندانیان سازداوە، جێژن و سەیرانیانکردووە، وەک سیمبۆلێکی تێکۆشانی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورد، لێیان ڕوانیوە. لەو باوەڕەشدام، تا کوردێکیش بمێنێ، یادی جێژنی نەورزۆی کورد، هەر دەمێنێ و هەرگیز لەنێوناچێ. هەر وەک هۆنەری کورد « ع. ح. ب. »ش، لە هۆنراوەی « نەورۆز »ی ساڵی « **1967** »دا، بە نۆ چوارینە و لە سێ چوارینەی کۆتاییدا گوتوویەتی:

پشتاوپشتمان، هەتاهەتا
ئەم نەورۆزەمان، هەر بووە
لە ناو وەیشوومە و مەینەتا
زیاتر بڵێسەی سەندووە
***

لەم شێوە، بۆ ئەو شێوەیە
هەرچی شتە، ئەگۆڕێت
یا، ئەم شتانەی کە هەیە
بەشی زۆری مرد، بیرئەچێت
***

بەڵام، نەورۆز نە ئەگۆڕێت
نە لە گڕا، ئەتوێتەوە
نە بە لافاو، ئەشۆڕێت
نە هەرگیز، بیرئەچێتەوە «**147،10**»

یا، وەک « کاکەی فەللاح »، لە « سروودی نەورۆز »ی ساڵی «**1971** »دا، بە سێ نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

تا ئاگر ماوە
نەورۆز ئەمێنێ
گوڵی گەشاوە
نەمریی دێنێ «219،15»

هەروەها، «کامیل ژیر»یش، لە هۆنراوەی «کاروان و نەورۆز»دا گوتوویەتی:

ئەوەی وتی: نەورۆزی کورد
ئەبێ، نەبێ
مۆخ و مێشکی، ئەهاڕین ورد
چەن گەورەبێ «30،13»

لە ڕاستییدا، جێژني نەورۆز لە مێژوودا، بە جێژنێکی زۆر کۆن دادەنرێ. تا ئێستە، بە تەواویی زۆر ڕوون نەبۆتەوە، ئەم جێژنە، بۆ یەکەمین جار، لە کوێ سەریهەڵداوە؟ کەی پەیدابووە؟ کێ دایناوە؟ بە چ بۆنەیەکەوە دانراوە؟!! بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، لەو بارەیەوە، چەندین بۆچوونی جیاواز هەیە. زۆربەی نووسەرانی کورد و بیانیی، لەو باوەڕەدان، سەرەتای پەیدابوونی ئەم جێژنە، بۆ سەردەمی «پێشدادیی»یەکان دەگەڕێتەوە.

«حیلمیی عەلی شەریف»، دوای دەمەتەقێیەکی زۆر، لە بەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی «عەبدولڕەحمانی زوبێحیی»دا نووسیویێتی: (مامۆستا زەبێحیی، پشت بە «فیردەوسیی و دوکتۆر موعین»، باسەکەی گەیاندۆتە ئەو ئەنجامە، کە بڵێ: کورد خاوەنە ڕەسەنەکەی نەورۆزە. هەر چۆنێک بێت، لەم باسانەدا وا دەردەکەوێت، کە نەورۆز بە بۆنەی دامەزراندنی یەکەم دەوڵەتی «پێشدادیی»یەوە هاتۆتەکایەوە، کە ئەوانیش باپیرانی ماددن و ماددیش، بە باپیرە گەورەی کورد لە قەڵەم ئەدرێن.)«26،4»

لێرەدا، دوو خاڵی گرنگ خۆی دەسەپێنێ:( یەکەمیان: نەورۆز، لەگەڵ درووستبوون و دامەزراندنی یەکەم پاشانشینی «جەمشید»، واتە: یەکەم دەوڵەتی «پێشدادیی»دا دامەزراوە و پەیدابووە. ئینجا، بە دوای ئەواندا، لە شێوەیەکی نوێ و پێشکەوتووانەتردا بووشە بە جێژنی ئیمپراتۆریای «ماد». دووەم: کورد لە هەموو گەلە «ئاریایی» نەژادەکانی تر، زیاتر خاوەنی ڕەسەنی ئەم جێژنەیە.)«27،4»

لێرەدا نامەوێ، بە درێژیی لە جێژنی نەورۆز بدوێم، چونکە، نووسەران و هۆنەرانی کورد، گەلێکیان لە سەر نووسیوە. گەلێ هۆنراوەیان بە سەردا هەڵداوە. بەڵام پێویستە، ئەوەش بزانین، هەر تەنیا لای کورد، نەورۆز پیرۆز نییە، هەر تەنیا کورد، یادی ئەو جێژنە ناکاتەوە. بەڵکوو، هێندێ گەلانی

دیکەی وولاتانی وەک: « هیندستان، پاکستان، ئەفگانستان، بلوژستان، ئێران و ئازربایجان »یش، خۆیان بە خاوەنی، ئەم جێژنە دەزانن و یادیدەکەنەوە. چونکە، (کورد و ئەفگانیی و پاکستانیی و هیندیی و ئێرانیی و بلوژیی ... هەموو، مێژووی « پێشدادیی » بە سەرەتا و بناغەی مێژووی نەتەوایەتیی خۆیان دەزانن.)«**48،4**»

لەبەرئەوە، هیچ گومانی تێدا نییە، (نەورۆز، هی هەموو نەتەوەکانی « ئاریا » زەمینە. بەڵگەش ئەوەیە: کە هیچ تیرە و ڕەگەزێک نییە، تا ئەم چەرخەش، کە جێژنی سەرساڵی خۆی، پێ هەوێن نەکردبێ و چاوی باستانی دێرینەی پێ نەڕشتبێ، ڕەی ئەفسانەکانی پێ ئاراییش نەدابێ، چ لە فارست، لە کوردت، لە ئازەربایجانیت، لە ئەرمەنیت، لە ئەفگانیت، لە تورکت، لە مانگۆلت، لە تیرەکانی چینت، لە سووریانت، لە کلدانت، لە سەبتیت، لە ئەرسەدۆکست، لە پرۆتستانت، لە بوزایی و براهمانیی و لامابییت، لە تیرە ئەوروپاییەکانت کە لە ڕێی مانوییەتەوە وەریانگرتووە. ئەمانە هەموویان، بەپێی عەنعەنە و دابودەستووری میلیی کۆنیان، هەر یەکە سەرنجێکی لە بارەی ڕۆژی نوێی سەری ساڵی تازەوە هەیە و هەست و نەستێکی تایبەتیی تیایا پەنگاوەتەوە، چ لە کەلتووری فۆلکلۆرییانەوە، یا نیشتمانیی و نەتەوایەتییەوە، یا لە ئەفسانە و ئایینەکانیانا ڕەنگاویداوەتەوە و کەم و زۆر، بووە بە بەرگر و بەرگەمای باستانیان)«**11-10،10**»

ئاشکرایە، نەورۆز کارێکی زۆری، لە بۆچوونی مێژوونووسەکانی عەرەبیش کردووە. لەو بارەیەوە « عەلادین سەجادیی » نووسیوێتی: ( تەنانەت گەلێکیان ئەڵێن: ڕۆژی دروستکردنی جیهان و دروستکردنی « ئادەم »، هەر دووکیان لەم ڕۆژەدا بوون. وەکوو چۆن « مەقریضیی، طەبەریی و مەسعوودیی » ئەڵێن: ئەم ڕۆژی نەورۆزە، لە دەوری « ئەخمینمیی »یەکانیشدا، سەری ساڵی تازە بووە و هەموو جۆرە زەماوەند و ئاهەنگێکیان تیایا گێڕاوە. ئەم ڕەوشتە مایەوە، تا کەوتە دەوری ئیسلامیی. تەنانەت، « موعتەضید » خەلیفەی « عەبباسیی » ویستی، لایبەرێ، وە یا سووکتریکاتەوە، پێی نەکرا.)«**2،9**»

هەروەها نووسیوێتی: (ڕۆژی « شەم ئەلنەسیم »ی « میسر » و « دەورەت ئەلسەنە »ی « عێراق »، هەر ئەو بۆنەیان لێ دێ. بۆیە کردوویانە بە ڕۆژی ئاهەنگ و چوونەتە دەرەوە بۆ سەیران.)«**3،11**»

بەڵێ، هەر گەل و وولاتێ، بە جۆرێکی جیاواز، لەو جێژنەی ڕوانیوە و دەڕوانێ، یادیکردۆتەوە و یادیدەکاتەوە. هەر چۆنێبێ، وا دەردەکەوێ، جێژنی نەورۆزی گەلانی « ئاریا » بە گشتیی، نەورۆزی کورد بە تایبەتیی، ڕەگێکی

زۆر قووڵی مێژوویی هەیە. واتە: ئەوەتەی ئەو گەلانە، لە نێوچەکەدا نیشتەجێ بوون، ئەو جێژنە هەر هەبووە و هەر هەشە. یا دەتوانم، بە شێوەیەکی دیکە بڵێم: جێژنی نەورۆز، هێندەی کۆنیی و ڕەسەنیی ئەو گەلانە و کورد لە نێوچەکەدا، ڕەگی خۆی داکوتاوە. هەروەها دەتوانم، بڵێم: ئەم جێژنە، وەک بۆنەیەکی ئایینیی و نەتەوەیی گەلانی « ئاریا »ی کۆن تێکەڵاوبووە. بە تایبەتیی لای کورد، لایەنە نەتەوەییەکەی، لە لووتکەی تێپەڕاندووە!

ئەوەی جێی سەرنج و بایەخیشە، ئەوەیە: چ پێش زایین و چ دوای زایین، چەندین میرنشین، دەوڵەت و ئیمپراتۆریا، لە نێوچەکەدا دامەزراون، گەلانی نێوچەکەی، لە نێو سنووری چوارچێوەی دەسەڵاتی خۆیدا کۆکردۆتەوە. ئەو فرمانڕەوا و دەسەڵاتدارانە، زۆر بە پەرۆشەوە، پارێزگاریی ئەم جێژنەیان کردووە، بە شێوەیەکی جوان، ڕێکوپێک و جیاواز، هەمیشە یادیانکردۆتەوە، جێژنیانکردووە و شاییانگێڕاوە. لەبەرئەوە، لە لایەکەوە: لەگەڵ گۆرانیی، هۆنراوە و چیرۆکی فۆلکلۆریی، ئەو گەلانە و کورددا تێکەڵاوبووە. لە لایەکی دیکەشەوە: ئەوەتەی ئەو گەلانە و کورد فێری خوێندنەوە و نووسین بوون، هۆنەر و نووسەرەکانیان، لە هۆنراوە و چیرۆکەکانیاندا، وەک کەرەسەیەکی نەتەوەیی و وێژەیەکی میللیی بە پێز، کەڵکیان لە جێژنی نەورۆز وەرگرتووە، وەک باسوخواسێکی دەوڵەمەند، تێکەڵاوی بەرهەمەکانیان کردووە.

بۆیە، زۆر لە نووسەرانی « فارس، عەرەب، تورک، ئازەر، بلووژ و کورد »، باسی نەورۆزیان، لە بەرهەمەکانیاندا کردووە و بە گەلێ شێوەی جیاواز، بۆچوونەکانی خۆیان دەربڕیوە. هەڵبەتە، (لەو کاتەی نەورۆز کراوە بە جێژن و ڕۆژێکی دیار و پیرۆز، چ لە نێو سەرجەم گەلانی « ئاریا »دا، یاخود لە دواییدا وەکوو جێژنێکی نەتەوایەتیی لە نێو کورددا، کە نێوانیان چەند هەزار ساڵێکە و پێشوونەکەی یەکجار کۆنە، هەر ئەبوو بە داستانی ئەفسانە و خەیاڵپۆش برازێنرێتەوە. هەر دوو لایەکەشی تێدا ڕەچاوبکرێت، خێر و شەڕ، چاکە و خراپە، ڕووناکیی و تاریکیی، زۆرداریی و دادپەروەریی)«23،4»

جێژنی نەورۆز لای کورد، تەنیا هەر، بە سەرەتای بەهار و ڕزگاربوون لە دەس سەرماوسۆڵەی زستان دانانرێ. تەنیا هەر، گوڵی ژاڵە دەم ناکاتەوە و نادرەوشێتەوە. تەنیا هەر، ڕیحانەڕەشەی بۆنخۆش، گیای پەلک سەوزی ناسک و نازدار، گوڵەکێویلە جوانەکانی وەک: « نێرگز، بەیبوون، هەڵاڵە، گوڵاڵەسوورە » سەر دەرناهێنن، چاو هەڵناهێنن و ناگەشێنەوە. تەنیا هەر، ڕووی زەویی، کراسی قەدیفەی سەوزی گوڵگوڵیی ڕەنگاوڕەنگ ناپۆشێ. تەنیا هەر، دارودرەخت گۆپکە دەرناکەن و گەڵای سەوز ناگرن. تەنیا هەر، خوڕەی

قەڵبەز و چەم و ڕووبارەکان، گوێی سروشت پڕ ناکەن. تەنیا هەر، مەلە جوانە باڵنەخشینەکان، بە چریکە و ئاوازی خۆشیان، گۆرانیی بۆ ژیان ناچڕن. تەنیا هەر، گەردوون ڕووناک و خەڵک دڵخۆش نابن. تەنیا هەر، دڵداران شایی ناگێڕن و پێک ناگەن. تەنیا هەر، جێژنی خۆشیی و شادیی نییە. تەنیا هەر، زەویی و ئاسمان سەما ناکەن. بەڵکوو، جگە لەوەی نەورۆز، مژدەی وەرزێکی نوێ بە کورد دەدا، لە هەمان کاتیشدا، بە سەرەتای ساڵی نوێ دادەنرێ. واتە: « 21/مارس »ی هەموو ساڵێ، بە یەکەمین ڕۆژی سەری ساڵی نوێی کوردیی دەژمێررێ. چونکە، شەو و ڕۆژ یەکسان دەبن.

وەک « شێخ محەمەدی خاڵ »یش، چلوحەوت ساڵ لەمەوبەر نووسیوێتی: (شەوی « 21 .03 .1958 »، لە کاژێری دوازدەی نیوەشەوا، ڕۆژ لە کەلووی نەهەنگ ـ بورجی حووت ـ ەوە چووە ناو کەلووی بەرخ ـ بورجی حەمل ـ شەو و ڕۆژ وەک یەک وێستانەوە. واتە: شەو دوازدە کاژێر و ڕۆژ دوازدە کاژێرە، نە ئەو زۆر و ستەم لەم، وە نە ئەم زۆر و ستەم لەو ئەکات.)«22،16»

هەروەها، جێژنی نەورۆز لای کورد، واتا و بایەخێکی گرنگی نەتەوەیی و ڕامیاریی هەیە. بە سیمبوڵی خەبات و شۆڕش دەژمێررێ، بە نیشانەی سەربەخۆیی و ئازادیی دەناسرێ، بە هاندەرێکی گەورەی ڕێی ڕزگاریی و خۆشیی دادەنرێ. چونکە نەورۆز، جێژنی هەموو تاکێکی کوردە. نیشانەی سەرکەوتن و سەفرازیی کوردە. دژی ستەم و زۆرداریی مرۆڤ و سروشت، بە شۆڕشێکی درێژخایەنی مێژوویی کورد دەژمێررێ. بە کورتیی، دوای ئەوەی، ( « کاوە »، گەلەکەی خۆی لە « زوحاک » ڕزگارکردووە، جارێکی تر نەورۆز، بە ئازادیی و ڕزگاریی موتوربەکراوە و جێژن بووە بە سێ جێژن: جێژنی دامەزراندنی یەکەم دەوڵەت و جێژنی ڕزگاربوون لە قاتوقڕی زستان و جێژنی ڕووخاندنی شایەکی زۆرداری ڕژێمێکی کۆیلەیی.)«30،4»

لەبەرئەوە، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، کەم هۆنەری کورد هەیە، یەک یا پتر، لە نەورۆزنامەیەکیان نەنووسیبێ، هۆنراوەیان بۆ نەورۆز نەگوتبێ، گۆرانییان بۆ نەچڕیبێ! بۆ نموونە: هەر لە مێژوویەکی دێرینەوە تا ئەوڕۆ، بە سەدان کەڵەپیاوی نووسەر و هۆنەری کوردی وەک: « بابەتایەری هەمەدانیی، مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی، شەرەفخانی بەتلیسیی، پیرشالیاری هەورامیی، مەولەویی، مەلای جەباریی، حاجی قادریی کۆیی، وەفایی، خەلیل منەوەر، پیرەمێرد، صابریی، کەمالیی، فوواد، شێخ نووریی شێخ ساڵح،، سەلام، شێخ مەحموودی حەفید، خادیم، قانیع، مەلا نامدار، شێخ جەلالی شێخ جەمیلی نەقشبەندیی ـ نووریی، ئەحمەد

شوکریی، گۆران، برایم ئەحمەد، بەختیار زێوەر، عەونیی، کاردۆخیی، دڵدار، جاهید، مەدهۆش، دلزار، هێمن، هەژار، ا. ب. هەوریی، ئەحمەد هەردیی، مەغدید سۆران، محەمەد تۆفیق وردیی، ع. ح. ب.، دیلان، ع.ع. ش.، کەریم شارەزا، کاکەی فەللاح، کامەران موکریی، خاڵە رەجەب، ئەمین شێخ عەلائەددین نەقشبەندیی، حەسەن عەوالانیی، حەسیب قەرەداخیی، خالید دلێر، مەدحەت بێخەو، لەتیف بەرزنجیی، جەلال خۆشناو، پیربال مەحموود، قادر برسیی، عەبدولکەریم رەباتیی، د. عیزەددین مستەفا رەسووڵ، د. ئیحسان فوواد، عومەر رەزا ئاغا، محەمەد بەدریی، مەجید نەدیم، شێرکۆ بێکەس، جەمال شارباژێڕیی، رەووف بێگەرد، محەمەد ئەمین پێنجوێنیی، رازیی، ئەحمەد تاقانە، د. نافیع ئاکرەیی، سالح عەلی گوللیی، غ. س. غەمبار، کاکە شوان، عوسمان مستەفا خۆشناو، نووری عەلی ئەمین، عەبدوڵڵا پەشێو، سەلاح شوان، ئازاد دلزار، سەلام محەمەد، لەتیف هەڵمەت، مکەڕەم رەشید تاڵەبانیی، نەژاد عەزیز سورمێ، مارف عومەر گوڵ، سەعدوڵڵا پەرۆش، بەهجەت محەمەد هروریی، سەباح رەنجدەر ... » و لە نێو شاژنە کوردەکانیشدا، چەن هۆنەرێکی وەک: « خانم رەسووڵ ئەحمەد، دایکی سۆلاف، خورشیدە بابان، سامیە مەشخەڵ، میهرەبان ... تاد » بە سەدان هۆنراوەیان، بۆ نەورۆزی کورد و « کاوە »ی ئاسنگەر هۆنیوەتەوە.

لە سەدەی بیستەمیشدا، زۆربەی هۆنەرانی کورد، هۆنراوە و سروودیان، بۆ جێژنی نەورۆز داناوە. یەکەمین کەسێ، بە کوردیی، هۆنراوەی بۆ ئەو جێژنە هۆنیبێتەوە و گۆرانیی بۆ چڕیبێ، « حەمدیی » هۆنەر بووە.

لەو بارەیەوە، « نەجمەدین مەلا » گوتوویەتی: (ئەووەڵ کەس نەورۆزی کوردیی لە « سلێمانیی »یا وت، « ئەحمەد حەمدیی بەگ » بوو. چونکە، لەوەو پێش نەورۆز بە « فارسیی » بوو)«**161،3**»

گەلێ لە هۆنەرانی کورد، چ لە کۆن و چ لە سەردەمی نوێماندا، هۆنراوەیان بۆ نەورۆز هۆنیوەتەوە. هێندێ هۆنەریشمان هەبوون، پتر لە هۆنراوەیەکیان گوتووە. لێرەدا دەتوانم، لە باسی نەورۆزدا، هۆنەرەکان، بە سەر چەن دەستەیەکدا دابەشکەم. چونکە، هۆنەرەکانی کورد، بە چەن جۆرێکی جیاواز، هۆنراوەیان بۆ نەورۆز گوتووە:

1. هێندێ هۆنەر هەبوون، تەنیا هەر، وەک سەرەتای کەژی بەهار و ساڵی نوێی کوردیی، لە جێژنی نەورۆزیان ڕوانیوە و باسیانکردووە. تەنیا بە « گوڵ و گوڵزار، ئاو و هەوا، دەشت و دەر، چیا و چۆڵ، نەغمەی بولبول و چریکەی مەل، ئاسمانی ڕوون و شین ... »دا هەڵیانداوە. واتە: تەنیا وەک جێژنێکی

سروشتیی، له یادی ڕۆژی نەورۆزیان ڕوانیوە. ئەمانەش پتر خۆیان له هۆنەرە کلاسیکییەکاندا دەبیننەوە. بۆ نموونە: « حەمدیی » هۆنەر، ساڵی « 1925 »، بە سیوشەش دێرە هۆنراوەی گەلێ جوان گوتوویەتی:

بەهبەه، چە ڕۆژێکی نەوە — هەیهەی، چە عومرێکی نەوە
هەوا، دەریایی پڕتـــــەوە — گوڵ بۆ چەمەن، بە سەر ڕەوە
سـەوزە، جلەوکێشی ئەوە — دنیا، وەک باســـی خوسرەوە
شیرینە جێی سـەیرانەکەم
ئەمما بـــــدەی جەژنانەکەم «161،3»

2. هێندێ هۆنەری دیکە هەبوون، باری نەتەوەیی و ڕامیاریی کوردیان، لەگەڵ کەژی بەهاردا تێکەڵکردووە و بە شێـوەیەکی زۆر جـوان ڕازاندوویانەتەوە. بۆ نموونە: « کامەران موکریی » نووسیوێتی:

نەورۆز، گوڵاڵەی نایە سەر پەرچەم — نێرگسی ڕشتە، دەشت و کەنار چەم
لەگەڵ توانەوەی سەهۆڵا چرۆ — تیایا توایەوە، پرشنگی ئاسۆ
ئەم ڕۆژە تەنیا، بۆ بەهار نییە — هەر جەژنی گوڵ و لالەزار نییە
یادی ڕۆژێکە، کوردی قارەمان — قەڵا سەختەکەی، دوشمنی ڕمان
کورد دلێرانە، خۆی ئەدا بە کوشت — بۆ ئازادیی بوو، خوێناوی ئەڕشت
«25،12»

3. هێندێ هۆنەری دیکەش هەبوون، جەختیان لە سەر لایەنە نەتەوەیییەکەی کردووە، زۆر بایەخیان، بە باسی کەژی بەهـار نەداوە. بۆ نموونە: « ژیر »، له هـۆنراوەی « نـەورۆزی کـــورد »دا، بە حـــەوت چوارینە، بـاسی جـــوانیی و ڕازاوەیی نیشتمـانی کردووە. ڕەنگی « سووری گوڵ، بەفری سپی و چیمەنی سـەوز »ی، بە ئاڵای « کـوردستـان » چواندووە. داوای یەکگرتنەوەی خـاک و لەنێوبردنی بندەسیی کوردی کردووە. له ڕێباز و بیرە ڕامیارییەکەی خۆی دواوە، بە تاکـە ڕێبـازی نەتـەوەی کـوردی داناوە. بەڵێنی بە ڕۆڵەکـانی کـورد داوە، تا سـەر واز نەهێنێ و « کوردستـان » لە دوژمن پاککاتەوە، تا، تیشکی گزنگی خۆری باوەڕی نوێ بیرازێنێتەوە و هەمیشە وەک نەورۆز نەمربێ. بۆیە گوتوویەتی:

ئەمڕۆ نەورۆزە، جەژنە هەرایە
سەر پڕ لە سۆزی، شایی و ئاهەنگە
کوردستان، بەرگی ئاڵووالایە
بووکی ڕازاوە و فریشتەی شەنگە
***

گزنگی زەردی، خۆری زێڕ دیمەن
ئەدا لە لووتکەی، چیای سپیپۆش
لە گوڵاڵەی سوور، سەوزەگیای چیمەن
بەهەشتی ژینە، کوردستانی خۆش
***

ئەمڕۆ، لە لای من خەنەبەندانە
ئاڵای چوار ڕەنگم، لا هەڵکراوە
سوور گوڵ و سپی بەفری کێوانە
سەوزی چیمەن و زەردی هەتاوە
***

سروشتیش ئەڵێ: کوردی قارەمان
ئەبێ، سەربەخۆ هەڵکا ئاڵاکەی
یەکبگرێتەوە کوردستانی جوان
دیلیی و ژێردەستیی، ئیتر هەتا کەی؟!
***

مژدەم ئەداتێ، نەورۆزی ئەم ساڵ
باوەڕی هەیە، تازەیە و وردە
پیرۆز و بەرز و ڕۆشن و ساماڵ
تاکە ڕێبازی، نەتەوەی کوردە
***

بەڵێنبێ، ئێمەی کوردی کوردپەروەر
مژدە و باوەڕی تازە، لەبەرکەین
کوردایەتیی بێ، ڕێمان هەتا سەر
بەم بڕوایەوە، دوژمن بەدەرکەین
***

بە باوەڕی نوێ، ئەم کوردستانە
ئەبێ ڕازاوە و ئاوا و پیرۆزبێ
ببێ بە ڕووگەی، ڕووی ئەم جیهانە
هەمیشە بەرگی، وەکوو نەورۆز بێ «13، 33-34»

4. بەڵام، کاتێ لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا، باوەڕی ڕامیاریی و ئایدۆلۆژیا پێشکەوت، بزووتنەوەی ڕووناکبیریی گەشەیسەند، بیری چینایەتیی، لە هۆنراوەی هێندێ لە هۆنەرە چەپەکانی کورددا ڕەنگیداوەتەوە،

لێکدانەوەیەکی تایبەتیی و نوێیان، بۆ ناوەڕۆکە چینایەتییەکەی، ڕاپەڕینەکەی « کاوە » کردووە. « کاوە »یان، وەک سەرکردەیەکی چینی چەوساوە و « زوحاک »یشیان، وەک سیمبوڵی چەوساندنەوە و زۆرداریی، لە هۆنراوەی کوردییدا پێشکەشکردووە. یا، بابەتی چینایەتییان، تێهەڵکێشی ڕووداوە نەتەوەییەکان کردووە.

هەرچەندە، زۆربەی ئەو هۆنراوانەی لە کۆندا، بۆ یادی جێژنی نەورۆزی کورد دانراون، پتر باسی کۆتاییهاتنی وەرزی سەختی زستان و مژدەی هاتنی وەرزی نوێی بەهار دەکەن. بەڵام، لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانەوە، زۆربەی هۆنراوەکان، پتر مۆرکێکی نەتەوەیی و ڕامیارییان پێوە دیارە، ناوەڕۆکێکی نەتەوەیی بەهێز، لە خۆیان دەگرن. بۆ نموونە: پاشای « کوردستان » و هۆنەرێکی دەنگدلێری وەک: « شێخ مەحموود »ی نەمر، بە یادی « کاوە » و دەس و چەکوشەکەی باپیرییەوە فەرموویەتی:

« فەرهاد »ی کێوی کوردم و هاواری کورد ئەکەم
دوژمن بە پیکی « کاوە »، وەکوو شیشە وردئەکەم «5»

« شێخ سەلام »ی هۆنەر، جێژنی « نەورۆز »ی لە ڕۆڵەکانی کورد پیرۆزکردووە و بە چوارخشتەکییەک گوتوویەتی:

جەژنی نەورۆزتان، یا خوا پیرۆزبێ
شەوتان هەر ڕۆژ و ڕۆژتان هەر نەورۆزبێ
هەر ئەم ڕۆژە بوو، « کاوە »ی کوردی گورد
مێشکی « زوحاک »ی، بە چەکوش وردکرد «217،7»

« شێخ نووریی شێخ ساڵح » نووسیوێتی:

ئاگری نەورۆز، بە شاپلیتە و پەڕۆ ناکرێتەوە
زوو ببێتە خۆڵەمێش و تینی دابمرێتەوە
ئاگری نەورۆز، بە گیان و دڵ ئەبێ، خۆشکرێ
گەر بە خووڕ، « دیجلە و فووڕات »ی بێتە سەر، نەکوژێتەوە
هاتو کە شێتانە، مەنعی جێژنی نەورۆزت کرا
لازمە گیانت، بە مەردیی بیخەیە ژێر پێتەوە
دەست و پێ، ئێسکی شکاو، چیلکەوچەوێڵی چاوگە بێ
لاشە هەر وەک داری « زەنگەقلیشە » کۆبکرێتەوە
خوێنی لاوان نەوت و بەنزین بێت و بڕژێتە سەری
کڵپەیەکی وا بستێنێ، شەوقی دا نەمرێتەوە
پیاو بزیڕێنێ، وەکوو شێری ژیان هەڵمەتبەرێ

ژن بە دەوری ئاگرا، بگری و بلاوینێتەوە
خۆشئەبێ ئەوسا، بلێسەی ئاگری نەورۆزەکەت
ئەو حەلە سەیری گوڵی کە، چۆن دەمی ئەکرێتەوە
دەسئەکاتە پێکەنین، بۆ بولبولی باخی وەتەن
هەر بە یەک سرووەی بەیان، ئەشنێتەوە و ئەخەنێتەوە
چەن بە خۆشیی، بولبولی خۆشخوان ئەخوێنێ بۆ گوڵان
چۆن چریکەی سەر چڵی، عەرشی عەزیم ئەگرێتەوە
بەو زوبانی حاڵە خۆشە، ئەم نزایەت بۆ ئەکا
ڕەببی، ئەم ڕۆژە، هەموو ساڵێ بە خۆشیی بێتەوە «17، 298 - 299»
هەر لە بارەی جێژنی نەورۆزەوە، « ع.ع. شەونم » گوتوویەتی:
جەژنە، جەژنی کوردستانە، جەژنی نەورۆزە
بە تیشکی ئاگر ئەنووسم، جەژنە پیرۆزە
چاوگی ئاگر، هێز و گیانمە
باوەڕی بەرزی کوردستانمە
سەیرکەن، سەیرکەن، سەیرکەن
شاخ و دەشت و شار و گوندم، تاویسەندووە
گۆڕی مەرگی دوژمنام، لێ هەڵکەندووە
پڕ بە دەم بانگئەکەم، سەربەستیم ئەوێ
کوردستانم جێی شێرانە، ئەبێ سەرکەوێ
شەرتە ئەگەر وایە، بسووتێم و نەمێنم
بە ڕووناکی لەشم، پەردەی شەو بدڕێنم
سەیرکەن، سەیرکەن، سەیرکەن
جەرگ ئەسووتێ، بۆکڕووزی گەییە ئاسمان
تا لە ئێوە ئاشکرابێ، ئەی گەلی جیهان
مێژوومان چەند زوحاک و ماری خستە چاڵ
چەند کەسی کرد بە گوڵ، بۆ بەهاری ساڵ
شەرتە سا گەر وایە، بسووتێم و نەمێنم
بە ڕووناکیی لەشم، پەردەی شەو بدڕێنم
سەیرکەن، سەیرکەن، سەیرکەن
ڕۆژی ئازادییە، نەک زەبوونییە
ئەی منیش وەک گەلان، مافم بۆ نییە
بۆچی تاوانە، گەر دیلی کەس نەبم

یا پلیشاوەی، ژێر هەرەس نەبم
شەرتە، سا گەر وایە، بسووتێم و نەمێنم
بە ڕووناکیی لەشم، پەردەی شەو بدڕێنم
سەیرکەن، سەیرکەن، سەیرکەن «38،6 - 39»

« خالید دلێر »ی هۆنەر، چەن هۆنراوەیەکی کورت و درێژی، دەربارەی جێژنی نەورۆز داناوە. بۆ نموونە: ساڵی « **1965** »، لە هۆنراوەی « نەورۆزی دوور وولات »دا گوتوویەتی:

ساڵێکی تریش، وا داهاتەوە
ڕۆژی « نەورۆزی کورد »، هەڵهاتەوە
بەم هاتنەوەیە، « نەورۆز » ئەم جارەش
دەرسی تێکۆشان، دائەداتەوە
***
هەوڵدانی« مەرگ »، بۆ « ژیانکوشتن »
« دەزگەی هەمیشە مردن » داڕشتن
بێ سوود بوو ئێستا، نیشانەی ژیان
کە هەموو جۆرە گوڵن، درشتن
***
هەندێ ویستیان، کورد سەردانەوێنێ
لە ڕێگەی خەبات لادا، وازبێنێ
چۆن وازدەهێنێ لە ڕێیێ، کەوا
بەختیاریی تەنیا، لەودا ببینێ؟!!
***
لەگەڵ نەورۆزا، دەرکەوت نیشانە
هی ڕیسوابوونی، ئەو ڕووڕەشانە
بە پێچەوانەی، ئارەزووی مردن
ئێستا میللەت، وا لە تێکۆشانا
***
ئێمەش سڵاو، لە دوور وولاتەوە
بە گوڵی سووری، ڕێی خەباتەوە
ئەنێرین بۆ هەر نەبەردێ، کەوا
مەشخەڵی شۆڕش، هەڵبکاتەوە «10،192-193»

هەروەها، « کاکە شوان »ی هۆنەریش، لە هۆنراوەی « نەورۆز جەژنی ڕزگاریی کورد »دا گوتوویەتی:

ڕۆژی نەورۆز، جەژنی سەربەستیی و خەباتی میللەتە
وەک نیشانەی لابەری، کۆستی هەژاریی و مەینەتە
جێژنی نەورۆز، خوێنی دڵمان تێکەڵاوی بەستەتە
ڕێیە بۆ سەربەستیی بڕوا، دیارە سەخت و زەحمەتە!
ڕەنجی « کاوە »، قارەمانی زۆری وا هەڵسانوە
هێز و ئیمان و برووسکەی ئەو، لە سنگا چانوە!
لاوی کورد هەرگیز، برووسکەی باوەڕی گەرم و گوڕە
ڕاست و سەربەرزە، لە ڕێگای کۆششا شێری دڕە
لاپەڕەی مێژووی وولاتمان، میللەتی جوڵانەوە
یادی ... سوور و گەش، دیارە بە ڕووی لاوانەوە «97،14»

« برایم ئەحمەد » لە « نەورۆزی من »دا گوتوویەتی:

پێم ئەڵێن: نەورۆزە ئەمڕۆ، ڕۆژی جەژن و خۆشییە
وەختی هەڵپەڕکێ و سەمایە، مەوسمی تەڕپۆشییە
دەشت و دەر گوڵ پۆشە، ئەم ڕەشپۆشییەت، بێ هۆشییە
مۆنی ڕووت بێ جێیە، عالەم کەیلی بادە نۆشییە
من ئەڵێم نەورۆز و شادیی و جەژنی دیل: ئازادییە «3،2»

هەروەها، « شێرکۆ بێکەس »ی هۆنەریش، لە هۆنراوەی « بە یادی نەورۆز » و ساڵی « 1958 »، بە هۆنراوەیەکی هەژدە دێڕیی، یادی مێژووی لە خوێن هەڵکێشراومانی بیرخستوینەتەوە و گوتوویەتی:

یادێک: وەک ڕەنگی خوێن گەش و سوورە
دەنگێک: لە پەردەی گوێ ئەدا دوورە
ئاوازێک: لە قوڵایی دڵا، زەنگێ
ئەشڵەقێنێ، دنیای تاریک و مەنگی
هەستانێک: وەک شەپۆلی ئاگری بورکان
بە سەر شەوا، تەقییەوە و پشتی شکان
پەیامێک: هیوای بەرزی ژیانە
ڕێگەی خەباتی، قەت* کۆڵ نەدانە
داستانێک: وێنەی کوردی نەبەردە
نیشانەی باوەڕ، لە هەق نەبووردە

***

ئارەمانێک: هەتا کوردێک بژی و بمێنی
بە یادی ئەو هەڵمەتئەبا، تۆڵەئەستێنێ
بە یادی ئەو، سروودی « کوردستانیی »
هەتاهەتا، ئەیڵێتەوە زمانی
بە یادی ئەو، سنوورەکەی دوژمن ئەشکێنێ
کەللەی زۆری، وەکوو « زوحاک » ئەپژێنێ
بە یادی ئەو، یەکیئەخا بەشبەشی
ئەتوێتەوە شەوەزەنگی، سامدار و ڕەشی
***

بە یادی ئەمڕۆی، سەر لە پێناوە
قۆچی قوربانی، گۆمی خوێناوە
بە یادی ئەمڕۆی، چاو هەڵئەهێنێ
ئاڵای ڕزگاریی، دائەچەقێنێ
سوێندئەخوا بە کورد، بە « کوردستان »ی
بە کفنی سووری، « قوودسیی » و « پیران »ی
بە « سمکۆ » و « خۆشناو »، دوکتۆر « فوواد »ی
جوانمەردانی ڕێ « مەهاباد »ی
جەنگاوەرێک بێ، « کاوە »ی ئێستا بێ
گیانی لە بەری لەپە و دەستا بێ
هەتا بستبەبست، خاکی نیشتمان
ئەسێنێتەوە، لە داگیرکەران
بیکاتەوە، نەورۆزەکەی لە « وان »ا
لە « سابلاغ »ا، لە چیاکەی « بەرزان »ا
لە « قامیشلیی » و « نەقچەوان » و « حسکو »دا
لە سەر لووتکەی، شاخەکانی « پشتکۆ »دا
تا نەبینێ، ئاڵای بەرز و پیرۆزی
بێ تامە لای، یادی جێژنی نەورۆزی «9»

ستۆکهۆڵم
2004. 03. 21

* * *

**تێبینی:**

* لە هۆنراوەکەدا نووسراوبوو: « قەد ». بەڵام ئەوە هەڵەیە. چونکە « قەد » و « قەت »، دوو واتای جیاوازیان هەیە. « قەد » بۆ قەدوباڵای مرۆڤ و بۆ قەدی دار دەبێ. « قەت »یش، لە « قط »ی « عەرەبیی »یەوە هاتووە و لەگەڵ واتای هۆنراوەکەشدا دەگونجێ.

* ئەم گوتارە، لە گۆڤاری « گزینگ »، ژمارە « 31 »، بەهاری ساڵی « 2001 »، لە شاری « ستۆکهۆڵم » بڵاوکراوەتەوە. بەڵام، جگە لەوەی، سەرنووسەری گۆڤارەکە، لەبری بەرپرسی سانسۆری « کوردستان »، بە ئارەزووی دڵی خۆی، قەیچیی تێخستبوو، لێی بڕیبوو و قرتاندبووی، هێندێ هۆنراوەشی کورتکردبۆوە و ناشیرینیکردبوو، بێ ئەوەی، پرس بە خۆم بکا! کاتێ لە هۆکەشیم پرسی، گوتی: هەر هێندە جێم هەبوو!

بۆیە، بە پێویستم زانی، دەستێکی پێدا بێنم، کەموکووڕییەکانی پڕکەمەوە، بۆ دووەمین جار، لەم سایتە خۆشەویستەدا « **Kurdistanpost** » بڵاویکەمەوە، تا خوێنەری هێژای کورد، هەموو گوتارەکە بە تەواویی ببینێ.

* بەو بۆنەیەشەوە، زۆر بە گەرمیی، پیرۆزبایی جێژنی نەورۆز، لە هەموو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی کورد دەکەم، لە کانگەی دڵێکی خاوێنەوە، هیوای لەشساغیی و تەمەندرێژییان بۆ دەخوازم. هیوادارم، جێژنی نەورۆز، هەر گەشەدار و بەردەوامبێ، نەتەوەی کوردی بندەسیش، لە کوردستانێکی ئازاد و دێمۆکراتدا، بە سەربەستیی و سەربەخۆیی بژی!

## سەرچاوەکان:

1. ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی، پێویستی ئەو شیعرانەی پێویستنین، چاپی یەکەم، چاپخانەی سلێمانی، کوردستان ـ سلێمانی، 2000.
2. برایم ئەحمەد، نەورۆزی من، هیوا، گۆڤار، ژمارەی تایبەتی « نەورۆز » 35، بەغدا، 1962.
3. حەمدی، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆڤیست، بەغدا، 1984.
4. حلیمی علی شریف، داستانی نەورۆز و نەورۆزی کوردستان، چاپی یەکەم، چاپخانەی « دار ئەلحوریە » بەغدا، 1991.
5. ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە 210، ڕۆژ 1974/03/21.
6. سروود بۆ قوتابیان، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی زێوەر، چاپخانەی ڕاپەڕین، سولەیمانیی، 1971.
7. سەلام، دیوان، چاپی دووەم، چاپخانەی ئەلحەوادث، بەغدا، 1991.
8. شفیق صابر، جەژنی دارودرەخت، هیوا، گۆڤار، ژمارە 9، ساڵی 1، بەغدا، مارت 1958.
9. شێرکۆ بێکەس، ڕۆژنامەی ژین، ژمارە 1435، ڕۆژی 1958/03/19.
10. عبدالرحمن زەنگنە، نەورۆزنامە، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەلجاحیز، بەغدا، 1985.

11. علاء الدین سجادی، مێژوویەکی کورتی نەورۆز، وە کورد و خزمەتکردنی بە سەقافەتی عەرەب، هیوا، گۆڤار، ژمارە 32، سالی 4، 1961.
12. کامەران موکری، نەورۆز، هیوا، گۆڤار، ژمارە 9، سالی 1، بەغدا، مارت 1958.
13. کامیل ژیر، کوردایەتی، چاپی یەکەم، چاپخانەی نەجاح، بەغدا، 1960.
14. کاکە شوان، نەورۆز جەژنی رزگاری کورد، هیوا، گۆڤار، ژمارە 9، سالی 1، بەغدا، مارت 1958.
15. کاکەی فەلاح، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەلحەوادث، بەغدا، 1980.
16. شێخ محەمەدی خاڵ، بەهار، هیوا، گۆڤار، ژمارە 9، سالی 1، بەغدا، مارت 1958.
17. شێخ نووری شێخ سالح، دیوان، بەرگی یەکەم، بەشی 2، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئەجاحیز، بەغداد، 1989.

# ڕووداوەکانی مانگی « نۆڤەمبەر »
# لە مێژووی کورددا

کەم نەتەوە هەیە، هێندەی نەتەوەی کورد، تانوپۆی ڕۆژمێری مانگەکانی ساڵی، بە « ژان، ناخۆشیی، نائومێدیی، هەرەس و تێکشکان » تەنرابێ. لە مێژووی تاریکونووتەکی دوور و نزیکیدا، هێندە دووچاری « داگیرکردن، دابەشکردن، کوشتن و بڕین، کاولکردن، ئاوارەبوون و چەوساندنەوە » بووبێ. گەر سەرنجێ، لە ڕۆژمێری مانگنامەی ڕووداوەکانی ساڵ بدەین، ئەوا دەبینین، هێندەی پەڵەهەوری چڵکنی ڕۆژی ڕەش و تاریک، ڕۆژی ئازار و پڕ لە خەم، باڵی بە سەر کۆمەڵی کوردەوارییدا کێشاوە، هێندە، ڕۆژە پڕ لە خۆشیی و بەختەوەرییەکان، دەس لە ملانی نەتەوەکەمان نەبوون. هێندەی بەری خۆری ئازادیی و سەربەخۆیی کورد، بە دێوجامەی پیلانەکانی داگیرکەران گیراوە، هێندە، ترووسکەی هیوا، لە ئاسۆی ئەرخەوانیی نەتەوەکەماندا بەدی ناکرێ. هەمیشە، زۆربەی ئارەزووەکانی گەلەکەمان، بە پێچەوانەوە بەدیهاتوون. شیرین بە تاڵ، خۆشیی بە ناخۆشیی، گەشبینیی بە ڕەشبینیی و سەرکەوتنمان بە ژێرکەتن گۆڕیوەتەوە. چونکە، هەرگیزاوهەرگیز، بە هەڵەکانی ڕابردووی خۆماندا نەچووینەتەوە، کردارەکانمان هەڵ نەسەنگاندووە، کەڵکمان لە پەندەکانی مێژووی خۆمان و گەلانی دیکە وەر نەگرتووە. بۆیە، بەو شێوەیە بندەس و چەوساوەین، دواکەوتووین و دەناڵێنین. گەر بەو چەشنەش ڕەفتاربکەین، ئەوا تا ماوین، هەر لە دواوە دەبین و لە ژێر دەس و پێدا پاندەبینەوە!

هەر نەتەوەیەک، ڕۆڵەکانی، بە چاوێکی پڕ لە خۆشەویستیی و ڕێزەوە، لە ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر، هونەرمەند، ئەکادیمیک، ڕامیار، نیشتمانپەروەر و پیاوە قارەمانەکانی خۆیان نەڕوانن، تا لە ژیاندا بن، ڕێزیان لێ نەگرن، لە دوای مردنیشیان، بە ڕێزەوە ناویان نەبەن و یادیان نەکەنەوە، ئەوا جگە لەوەی، ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەیە، بێ ئەمەکن و پەروەردەی نەتەوەییان تەواو نییە. لە هەمان کاتیشدا، بە نەتەوەیەکی خۆخۆر، یەکنەگرتوو، ناکۆک و دواکەوتووش دادەنرێ. هەر لەو ڕوانگەیەشەوە، هەر کوردێ، بە چاوێکی سووک، لە کۆشش، ماندووبوون، خەبات و گیانفیدایی شۆڕەسوارانی ڕاستەقینەی گۆڕەپانی هونەر، وێژە، زانست و ڕامیاریی نەتەوەکەی خۆی بڕوانێ، پێش هەموو کەسێ، ئەو کوردە، سووکایەتیی بە خۆی و پاشان بە کەلەپوور، مێژوو و پیاوە هەڵکەوتووەکانی نەتەوەکەی خۆی دەکا. چونکە، ناسنامەی میلliی هەر نەتەوەیەک، سامانی هونەر و وێژەی هەر نەتەوەیەک، تاپۆی مێژوویی هەر نەتەوەیەک، تەنیا لە نووسین، بەرهەم، کار و کردەوەکانی ڕۆڵە دەسڕەنگینەکانیدا دەردەکەوێ. هەر بەو شێوەیەش، لەو بوارانەدا، نەتەوەیەکی پێشکەوتوو، لە نەتەوەیەکی دواکەوتوو جیادەکرێتەوە. لەبەرئەوە، نەتەوەکانی جیهان، نەک هەر ڕێز لە گەورە پیاوانی خۆیان دەگرن و یادیان دەکەنەوە، بەڵکوو، لە هەموو سەردەمە مێژووییەکانیشدا، ئەو تێڕوانینەیان بۆیان نەگۆڕاوە و ناشگۆڕێ.
زۆر سەیرم لێدێ، هێندێ کەس، پیاوە ناودارەکانی نەتەوەکەی خۆیان، لا پەسەند نییە و زۆر بایەخیان پێ نادەن! کەچیی، لە هەمان کاتدا، ڕێز لە کەسانێکی بیانیی دەگرن و سالانە یادیاندەکەنەوە! دیارە، ئەو جۆرە کەسانەی، بەو چەشنە بیردەکەنەوە، پێش هەموو کەسێ، خۆیان دەخەڵەتێنن. چونکە، هەر مرۆڤێ، ئەمەکی بۆ ئەو ڕۆڵە و قارەمانانەی نەتەوەکەی خۆی نەبێ، کە لە بواری ڕاژەکردنی نەتەوەکەیاندا، بێ ئەوەی لە زیان پتر، هیچ جۆرە قازانجێکیان دەسکەوتبێ، هەمیشە، ڕووناکییان بۆ دەوروپشتەکەی خۆیان هەبووبێ و وەک مۆم توابنەوە، ئەوا، بە دڵنیاییەوە دەڵێم: ئەو جۆرە کەسانە ناتوانن، کەسێکی دیکەی بیانییان خۆشبوێ!
هەڵبەتە، نووسەر و هۆنەرەکانی کورد، زۆر لە مێژە، هەستیان بەو ڕاستییە کردووە، چونکە، تا لە ژیاندا بوون، زۆر ڕێزیان لێ نەگیراوە و یارمەتییان نەدراوە. بەڵکوو، دوای مردنیان، چەن جارێ یادکراونەتەوە و پاشان بیرچوونەتەوە. بۆیە، هۆنەرێکی نیشتمانپەروەری وەک « موفتی »، لە کۆتایی هۆنراوەی « ئەڵقەلەگوێ »دا گوتوویەتی:

پیاوی گەورەمان، نایەتە بەر دڵ
تاکوو ئەو ڕۆژەی، ئەچێتە ژێر گڵ
ئینجا بۆی ئەگرین، بە جۆش و بە کوڵ
گۆڕەکەی ئەکەین، بە باخچە و بە گوڵ
« موفتیی »، قسەی تۆ ساغە و ڕووبەڕوو
حورمەتی زیندووش. بگرە نەک مردوو
بازێ کە بەربوو، لە دەستت دەرچوو
بۆ مردوو مەگری، بگری بۆ زیندوو «202،7»

گەرچی، زۆربەی زۆری لاپەڕەکانی ڕۆژمێری مانگەکانی ساڵ، بە هەواڵی دڵتەزێن و کارەساتی نەتەوەیی ڕەشکراونەتەوە. گەرچی، کەم مانگ هەیە، چەن هەواڵێکی خۆشی تێدابێ. بەڵام، لە هەمان کاتیشدا، لاپەڕەکانی ڕۆژمێری هیچ مانگێ، هێندەی مانگی « نۆڤەمبەر »، بەو چەشنە، باڵی ڕەشی پڕ لە خەم و ماتەمی، بە سەر کۆمەڵی کوردەوارییماندا نەکێشاوە، هەواڵی کۆچیدوایی نووسەر، هۆنەر، هونەرمەند و لە سێدارەدانی نیشتمانپەروەرانی کوردی تێدا تۆمار نەکراوە. چونکە، لەم مانگەدا بوو، گەلێ نیشتمانپەروەری ئازا و مەردی وەک: « مەحموود جەودەت، سەیید ڕەزای دەرسیمیی، شەهابی شێخ نووریی، شێخ جەعفەر، ئەنوەر و زۆراب »، لە پێناوی ئازادیی و سەربەخۆیی نەتەوەکەیاندا، بە دەسی داگیرکەرانی « کوردستان »، لە سێدارە دران و گیانی پاکیان، بە خاکی پیرۆزی نیشتمان بەخشی. هەر لەم مانگەدا بوو، هێندێ مامۆستا و هونەرمەندی بلیمەتی گەورەی وەک: « ڕەفیق چالاک، شەماڵ سایب »، بۆ دوا جار، ماڵاواییان لە دایکی نیشتمان، موزیک، ئاواز و گۆرانیی کوردیی کرد. دیسانەوە، هەر لەم مانگەدا بوو، گەلێ هۆنەری ناوداری پایەبەرزی گەورەی وەک: « ئاریی، زێوەر، حەمدیی، دڵدار، گۆران و کەمالیی »، بۆ دوا جار، چاویان لێکنا و ووشەی کوردییان، بە هەتیویی بەجێهێشت! جا گەر وا نییە، چۆن دەتوانین، وەک نموونەی خەروارێ، مشتێ لەو ڕووداوانە پێش چاوخەین؟

1. « نەجمەدینی حاجی مەلا رەسووڵ ـ ئاریی »، هۆنەرێکی خەمخواری کورد بوو، نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆی، زۆر خۆشویستووە. گەلێ هۆنراوەی جوانی، لە بوارەکانی هۆنراوەی نیشتمانیی، دڵداریی، کۆمەڵایەتیی، فەلسەفیی، جوانیی سروشتدا داناوە. بەڵام، زۆربەی زۆری هۆنراوەکانی، بۆ باسی ناکۆکیی و یەکێتیی ڕیزەکانی نەتەوەکەی تەرخانکردووە. « ئاریی »، بە شێوەیە نیشتمانەکەی خۆی خۆشویستووە، دڵە گەورەکەی، تەنیا جێی ئەوی

تێدا بۆتەوە. بۆیە، لە هۆنراوەی « خۆشەویستیی وولات »دا، بە دوازدە دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

لە هێلانەی دڵا، تۆوێ ڕواوە
ڕەگ و ڕیشەی، لە گشت گیانا بڵاوە
لە قووڵی توێی دەروون و ناخی گیانم
بە جۆرێ، بنج و بێخی داکوتاوە
کەوا، ئەو توێی دەروون و ناخی گیانە
ئیتر، جێگەی شتی کەی تیا نەماوە
ئەویش بەرزیی و سەرفرازیی وولاتە
کە چەن هەوڵ و خەباتی بۆ دراوە

پاشان گوتوویەتی:

هەموو ناکۆکییە، وا تاکوو ئێستا
بە دیلیی ماوە، مافیش خوراوە
خوا! ناکۆکیی ئەم هۆزە هەتا کەی؟
بەسە ئیتر، هەتا ڕێی چارە ماوە
ئیتر « ئاریی »، لە ڕێگەی ئاو و خاکی
ئەبێ سەر دابنێی، ڕێگەی نەماوە «36-35،8»

دیارە « ئاریی »، زۆر چاوەڕوانبووە، نیشتمانە خۆشەویستەکەی، لە دەس بندەسیی، داگیرکردن و کاولکردن، ڕۆڵەکانی نەتەوەکەشی، لە دەس ژان و چەوساندنەوە ڕزگاریانبێ. ئاڵای « کوردستان »ەکەی، لە ئاسمانی ڕوون و بەریندا، بە دەم شنەبای بەهاری ئازادیی نیشتمانەکەیەوە بشەکێتەوە. بەڵام بە داخەوە، ئەو ئاواتەی لەگەڵ خۆیدا گۆڕکردووە، ڕۆژی « 1968. 11. 03 »، مەرگ لاپەڕەی ژیانی پێچاوەتەوە و مردووە. تەنیا ڕاسپاردەیەکیشی هەبوو بێ، ئەم چەن دێڕە هۆنراوەیە بووە، تا لە سەر کێلەکەی بنووسن:

چاوەڕوانبووم، بۆ هەڵکردنی ئاڵا
بردمە گــــۆڕ، بە داخەوە سکاڵا «56،8»

هۆنەر، خۆپەرست نەبوو. بەڵکوو، ئازادیی و شادیی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆی، لە پێش هەموو شتێکەوە دانابوو. بۆیە گوتوویەتی:

تو خوا، دوای من، ئەگەر دیتان ئازادیی
لە سەر گۆڕم، بە گەرمیی بکەن شادیی
لە بیرم چێ ئازار، خــــــەوم لێ کەوێ
بۆ ئەوەی گیان، لە ناو گــــۆڕا بسرەوێ «56،8»

2. لە مێژووی تێکۆشانی نەتەوەکەماندا، گەلێ کارەساتی خوێناویی و کوشتنی بە کۆمەڵی وەک: « قەڵای دمدم، شیوی زیلان، ئەشکەوتی سۆیە و دەکان، سینەمای شارۆچکەی عاموودە، کیمیابارانی هەڵەبجە ... »ی تێدا هەیە. هەروەها، ڕەشەکوژییەکەی ڕۆژی « 1980 .11 .04 »، کە پەنجاوسێ کوردی بێ تاوان و بێ دەسەڵاتی « ڕۆژهەڵاتی کوردستان »، لە گوندەکانی « ئیندرقاش، سوکنەد و خانەگیی »، لە نزیک شاری « مهاباد » شەهیدکران، یەکێ لەو جینۆسایدە گەورانانە بوو، کە لاپەڕەی مێژووی نەتەوەکەمانی سوورترکردووە!

3. ڕۆژی « 1986 .11 .07 »، ئاوازە بە سۆزەکانی « ئەرە لەیلێ، هاتی بۆ هاتی، شوانە هۆ شوانە »، لەگەڵ موزیک و ئاوازی کوردیی نوێدا، بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، لە ئاهەنگێکی کوردانەی پڕ لە ماتەمینییدا، یادی هەژدە ساڵەی کۆچیدوایی مامۆستای هونەرمەند « شەماڵ سایب » دەکەنەوە.

4. هەموو ساڵێ، لە تاو کۆچیدوایی « زێوەر »ی هۆنەر، هەر دوو پیرەچیای « ئەزمەڕ » و « گۆیژە » زەردهەڵدەگەڕێن. « پیرەمەگروون »، بە مێزەری سپییەوە سەردادەنەوێنێ. مەلە خۆشئاوازەکان، لە خوێندن دەکەون. لاولاو، لە قەد و باڵای چنار دەتۆرێ. کارمامزەکان، گوانی دایکیان ناگرن. ئاسمان، ڕەش دادەگەڕێ. لاوە دڵدارە خوێنگەرمەکان، « زێوەر » ئاسا، دڵۆپە عەرەقی ڕووی یەکدی دەخۆنەوە، تا غەم لە دڵیاندا لابەرێ. بەڵێ، دیمەنە جوانەکانی « کوردستان »، لە نێو قووڵایی دڵ و شانەکانی مۆخی هۆنەردا دەژیان، بە هێزی خۆشەویستیی نیشتمانەکەی، خوێنە گەشەکەی قوڵپیدەدا. بۆیە، گەر سەریشی بۆ لە قوڕنێن، لۆمە ناکرێن. چونکە لە لایەکەوە، « گەیاندبوویە ئەنوەری فنوونی شیعر و شاعیری ». لە لایەکی دیکەشەوە، هەمیشە، وەک نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز، خۆشەویستیی خۆی، بەرانبەر خاکی نیشتمانەکەی دەربڕیوە، بۆیە گوتوویەتی:

ئەی « وەتەن »! چەند خۆشەویستی ڕۆحی شیرینی منی
مەزرەعەی توخمی نیشات و باعسی ژینی منی
بێت و گەر من « کۆهکەن » بم، وەسڵی « شیرین »م ببێ
تیشەیی نادەم لە بەردت، تۆی کە شیرینی منی

پاشان گوتوویەتی :

نەوبەهاران، بەو هەوای زۆر سافەوە، وەک جەنەتی
فەسڵی زستانیش، سەراسەر باغی نەسرینی منی
بوجی نەقدی جیسم و جانی خۆم، بە شاباشت نەکەم؟

خاکراهی حوکمڕانی عیزز و تەمکینی منی
ئارەزووی فیکری سیاحەت ناکەم، ئیتر ئەی وەتەن
تۆ لە جێگای « قاهرە و تاران و بەرلین »ی منی «14،2»
ڕاستە، « زێوەر » ڕۆژی « 10 .11 .1948 » مرد. بەڵام، بەرهەمە نیشتمانییەکانی زیندوون، لە بیری ڕۆڵەکانی گەلەکەیدا دەژین. ڕاستە، خوێندکاری وردیلەی کوردی هەتیوکرد. بەڵام، بێ سروود جێی نەهێشتوون و گەلێ سروودی نیشتمانیی پێشکەشکردوون. بە نیشتمانە ئازیزەکەیدا هەڵداوە، تا منداڵانی کورد، هەر لە ساواییەوە، فێری خۆشەویستیی « کوردستان »ەکەیان بن. ئاخر، هیچ شتێ، گەواهیی ئەم بۆچوونانەم بۆ نەدا، ئەوا، چەندین سروودی وەک: « ئەی کوردینە، وا وەتەن، تا دەس لە مل هیوا نەکەم، براینە لە خەو هەڵسن، ئەی وەتەن، چەن شیرینە لام، بولبول بە نەغمە، ئەی وەتەنی کوردی عەزیز... » ئەو مافەم دەدەنێ، پێ لە سەر بۆچوونی خۆم داگرم و بڵێم: « زێوەر »ی هۆنەر، مامۆستای سروودی کوردیی بوو. ئەوەتە، بە هەشت نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
« وەتەن »ی من « کوردستان »ە، یادگاری « ئەجداد »مانە
بەهەشتی ڕووی سەرزەمین، خاکی پاکی « کوردستان »ە «118،2-119»
هەروەها، لە گۆرانیی « ئەی کوردینە »دا، بە شێوەیەکی یەکجار بە سۆز، بە دڵێکی خاوێن و پڕ لە جۆشەوە، داوای تەبایی و یەکێتیی، لە ڕۆڵەکانی کورد کردووە و بە شەش نیوەدێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:
ئەی کوردینە! ئەی مەردینە! با دەست لە ناو دەست کەین هەموو
بۆ بەرزێتی خاکی « وەتەن »، بۆ یەکێتی# بچین هەموو، کوردین هەموو
بێ کەس نییە دایکی « وەتەن »، ئێمەش « فیدا »کاری ئەوین
تا کورد لە « عالەم » دەرکەوێ، بۆ یەکێتی بچین هەموو، کوردین هەموو
« ئەجداد »مان شێری زەمان، حوڕبوون و سەربەستی جیهان
باکمان نییە، ئێمەش لە کەس، بۆ یەکێتی بچین هەموو، کوردین هەموو
«110،2»
5. ئەدی کوا « حەمدیی » هۆنەر و نیشتمانپەروەر، بێ پەردە، کەموکوڕییەکانی کۆمەڵی کوردەوارییمان بۆ لەقاودا؟ کوا ئەو شێرەپیاوە، ڕەخنەی توندوتیژ، لە هەڵەکانی سەرانی کورد و کەموکووڕییەکانی دەوڵەتە « فیدراڵ »ەکەی ئەوڕۆ بگرێ، هەر وەک کاتی خۆی، ڕەخنەی توندی دڵسۆزانەی، لە دەوڵەتەکەی « شێخ »ی نەمر دەگرت؟!! بەڵێ، نەما! ڕۆی! ئەویش ڕۆژی « 12 .11 .1936 »، ماڵاوایی لێ کردین. بەڵام، گەرچی خۆی

ڕۆی، هۆنراوەکانی ماون. کام هۆنراوە؟!! ئەو هۆنراوانەی، هەر پیتێکی بە گەوهەرێ دەچی؟!! بۆیە، یەکێکی وەک مامۆستا « نەجمەدین مەلا »، بە خۆڕایی ئەم چەن دێڕە هۆنراوەیەی بۆ نەگوتووە:

گوفتاری « حەمدیی »، بالآیەکی والآیە
وەک فەرشـــــی زومروود، ئالووالآیە
شیعری تالی، وەک شـــــەکر وایە
بۆ خۆێندەواران، بوو بە دەســـــمایە «30،1»

ئەدی، هەر « حەمدیی » نەبوو، شانازییەکی زۆری، بە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیەوە دەکرد؟ هەر « حەمدیی » نەبوو، هەمیشە، بیری لە بندەسیی و کەساسیی وولاتەکەی دەکردەوە؟ ئاخر بۆیە، زۆربەی ژیانی، بۆ ڕاژەکردنی نەتەوەکەی خۆی تەرخانکردبوو. هەمیشە و بە هەموو شێوەیە هەوڵیداوە، ژان و ئازاری نەتەوەکەی دەربڕێ، زۆر بە توندیی دژی داگیرکەرانی نیشتمانەکەی ڕاوەســتــاوە. بۆیە لە هۆنراوەی « کــوردســتــان ... » و ســاڵی « 1927 » گوتوویەتی :

ئەی وەتەن! ڕۆم و عەجەم، موشتاقی « کوردستان »تە
ئیفتخاری میللەتی کورد، شەوکەتی عینوانتە
بەستە، سەربەرزیی ئێواران و سبەینان، مانگ و ڕۆژ
وەک نیشانی ئیفتخاری، سنگ و نەجمەی شانتە
بەرقئەدا و ئەڕژێ، وەکوو ئەمواجی گەوهەر چەشمەکان
ئاوە، یا ڕۆحی ڕەوانی چەشمەی حەیوانتە
ئاوە یا نوورە، لە عەکسی خۆر کە ئەبریسکێتەوە
ئەهلی حیکمەت وا ئەزانێ، دووڕەکانی « کان »تە
گوڵگوڵی سوور و سپی، خاڵخاڵی ڕەش ئەڵێی
بۆدرەی ڕووخسار و سوورمەی ڕشتنی چاوانتە
عاشقی ڕەنگی خەزانی تۆیە، بۆیە دی بەهار
فەسڵی هاوین گەرمە، مەیلی بەفرەکەی زستانتە
بۆچی، ئەنباری زەخیرەی کائناتە « شارەزوور »
« شەهربازاڕ »، خوانی میوانە لە بەر میوانتە
باسی میوەی تۆ ئەکەم، بۆیە قەڵەم هاتووەتە بەر
بەستەکانم، بەستەی ئەهلی دڵ و عیرفانتە
بۆ ئەمەی جارێ، بە سەرتا پێ نەنێم ئەفکاری من
یا بە سەر، سەر ڕۆیشتنە، یا سەربەسەر هیجرانتە

پڵپڵەی پشتێنی زێڕینی، حەبیبی قەومی کورد
زرێزە و پشتێنەیی بەردینی، قەد شاخەکانتە
بۆیە « سیروان » و « زەڵم »، بۆ شاڵی چۆغە و ڕانکت
وەک حەریر، « دیجلە »ی « جەزیرە » بائەدەی « بۆتان »تە
کورد « کوڕەکاژاو »ی لوتی، وا بڵند کردووەتەوە
هەر وەکوو « شەمدین »ی « بادین »، ئارەزووی بورزانتە
ئاسمان و شاخی بەرز و سەتحی ئەرزت دەردەخا
ماڵی کوردی تۆ، ئەوە دیوار و حەوشە و بانتە
« پەیکوڵ »ی تا « قەسری شیرین »، ڕاکشاوە پێی کوڵی
دەستی « قەندیل »ت درێژە، بۆ چراچی « وان »تە
« پیرەمەگروون »، تاجی شاهانەی بە سەربەرزی فڕاند
تەم « دەماوەند » داگرێ، مەحجووبی « هەورامان »تە
خەتتی دیوانی شکستەی گرد و لووتی بەرزی شاخ
واضیحە بۆ سەربەخۆیی، طوڕەیی فەرمانتە
جاربەجار « حەمدیی » گلەت گەر لێ بکا، ناحەق نییە
جەردە ڕامەگرە، نەڵێن خەڵقی کە جانی جانتە «1، 81-82»

6. دەبێ، چ کوردێ هەبێ، ناوی « دڵدار »ی نەبیستبێ؟!! دەبێ، چ کوردێ هەبێ، چەن جارێ لە ژیانی خۆیدا، گوێی لە سروودی « ئەی ڕەقیب » نەبووبێ و نەیگوتبێ؟!! بەڵێ، « دڵدار » و « ئەی ڕەقیب »، دوو یاقووت و زمرووتن، لە یەکدی جیا ناکرێنەوە. چونکە، هەر وەک چۆن، « دڵدار » بە « ئەی ڕەقیب » ناسراوە، « ئەی ڕەقیب »یش بە « دڵدار »ەوە، جێی خۆی لە دڵ و دەروونی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەردا کردۆتەوە!

بۆیە، گەرچی « دڵدار »، ڕۆژی « 12 .11 .1948 »، بە جەستە مرد و جێیهێشتین، بەڵام، « ئەی ڕەقیب » نەمردووە و جێی نەهێشتووین! لەبەرئەوە، تا کوردێ لە ژیاندا مابێ، « دڵدار »یش لە دڵە گەورەکەی کورددا هەر زیندووە و نامرێ! گەرچی « دڵدار »، لە هۆنراوەی « ئەی ڕەقیب »دا، تراژیدیای جەرگبڕی نەتەوەی کوردمان بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام، هەرگیز نائومێد نەبووە. بەڵکوو، بە بڕوایەکی پۆڵایین و زۆر بە گەشبینییەوە، لە پاشەڕۆژی کوردی ڕوانیوە، ڕووی لە دوژمنی داگیرکەر کردووە و بە « 8 » دێڕ هۆنراوە گوتوویەتی:

ئەی رەقیب! هەر ماوە قەومی کورد زوبان
نایڕمێنێ، دانەیی تۆپی زەمان

ئێمە، ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین
سەیریکە، خوێناویە ڕابووردوومان
ئێمە، ڕۆڵەی « میدیا » و « کەیخوسرەو »ین
دینمان، ئاینمانە نیشتمان
کەس نەڵێ: کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە، هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان
چەند هەزار، لاوانی کوردی نەڕەشێر
بوون بە قوربانیی و هەموویان نێژران
لاوی ئێستاش، حازر و ئامادەنە ...
جانفیدانە، جانفیدانە، جانفیدان
لاوی کورد، هەڵسانە سەرپێ وەک دلێر
سا، بە خوێن نەقشیئەکەن تاجی ژیان
کەس نەڵێ: کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە، هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان «174،3»

7. ئینگلیزەکان، ڕۆژی « 14 .11 .1919 » شارۆچکەی « ئاکرێ »یان داگیرکرد.

8. هەرچەندە، ئەو سەرکردە کوردانەی، گیانی خۆیان بە نەتەوە و نیشتمانەکەیان بەخشیوە، چاوەڕوانی سۆز و بەزەیی، گیانکێشەکانی دوژمنانیان نەکردووە، شەرمەزاری لای خوا و کورد نەبوون، لە لاپەڕەکانی مێژووی کوردیشدا، بە ترسنۆک و بودەڵە ناویان تۆمار نەکراوە، بە پەنجەکانی دەس دەژمێررێن. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا کەمبوون، کەچیی، زۆر مەردانە و ئازایانە، ڕووبەڕووی دوژمنی داگیرکەر و مەرگ بوونەتەوە. گیانبازیی و قارەمانێتیی سەرانی کورد، مەگەر هەر تەنیا، لە کەسێتیی چەن سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی وەک « سەیید رەزای دەرسیمیی »دا دەرکەوتبێ! ئەو سەرکردەیەی ڕۆژی « 18 .11 .1939 »، بڕوانامەی دڵسۆزیی و شەهیدیی وەرگرت، توورکە « کەمالیی »یەکان، لە سێدارەیاندا. بەڵام، لە ئاستی دوژمندا، بەرد نەرمبوو، ئەو نەرم نەبوو، چیا جوڵا، ئەو نەجوڵا، ئاسمان قیژاندی، ئەو نەیقیژاند، دوژمنەکانی ترسان، ئەو نەترسا. بەڵکوو، کاتێ پەتی سێدارەیان لە ملەوە ئالان، قیژاندی و گووتی: (هەر وەک ئاگاتان لێیە، بزووتنەوەکەی « دەرسیم » شکا. بەڵام، کورد و « کوردستان »، هەروا لە سەر پێی خۆی ڕاوەستاوە، ژیانی خۆی ڕادەبوێرێ، هەرگیزاوهەرگیز نامرێ. گەنجەکان بە هیچ چەشنێ نایەڵن، ئەو بزووتنەوەیە بکوژێتەوە. ئەوان تۆڵەی

من دەستێننەوە. بژی کورد و « کوردستان »، بڕوخێ دەزگەی زاڵمان، ستەمکاران و نەفرین لێبووان.)«**212،4**»

**9**. ئەدی گەر « گۆران »ی هۆنەر، ڕۆڵەیەکی کورد نەبووایە، لە « پوشکێن »ی ڕووس، « نازم حیکمەت »ی توورک و « نزار قەبانیی » عەرەب پتر نەدەناسرا؟!! ئەدی گەر « گۆران »، ڕۆڵەی نەتەوەیەکی خاوەن دەوڵەت بووایە، بەو شێوەیە ناو و ناوبانگی بڵاودەبۆوە؟!! هەرچەندە، « گۆران » لای کورد، بە خوای هۆنراوەی کوردیی نوێ دادەنرێ، بەڵام، جگە لەوەی، لە ژیاندا خۆشیی نەدی، هەر خۆشی بوو، گللەیی لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی کردووە و گوتوویەتی:

بەڵێ، دیارە، لە ناو قەومی بەسیتا، قەدری سەنعەتکار

وەکوو عەکسی قەمەر وایە، لە ناو حەوزێکی لیخندا «**119،6**»

« گۆران »ی دەس و پەنجە زێڕین، « گۆران »ی تابلۆ ڕەنگینەکانی نێو « بەهەشت و یادگار، فرمێسک و هونەر، گەشتی هەورامان و قەرەداغ، سروشت و دەروون، لاوک و پەیام ... تاد »، گەر لە « کوردستان »ی بەهەشتی سەرزەمیندا، چاوی هەڵ نەهێنایە، ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکی ئەم خاکوخۆڵە نەبووایە، ئایا وەک هونەرمەندێ، دڵۆپی مرواریی بۆ کۆدەکرایەوە؟!! وەک هەنگەزەردە، شیلەی شیرینی گوڵی باخچەی بەهاری دەمژی؟!! یاقووت و زمڕووتی ووشەی دەچنی؟!! هۆنراوەی لە پەڕەی ناسکی، گوڵاڵەسوورەی چیاکان دەهۆنییەوە؟!! تاجەگوڵینەی هۆنراوەی، بە پەلکەزێڕینەی ئاسمان دەڕازاندوە و پێشکەش بە شۆڕەژنانی کوردی دەکرد؟!! دیارە، ئەوە هەمووی جوانیی سروشتی « کوردستان » بووە، وا بەو شێوە کاریگەرە، کاری لە هەست و هۆشی ئەو هونەرمەندە بلیمەتە کردووە. سەراپای هۆنراوەکانی، وەک خشڵێکی زێڕ، تاهەتایە، لە بەرۆکی هونەر و وێژەی کوردیی بدا و بەو نەمرییە بمێنێتەوە! گەرچی ڕۆژی « **1962. 11. 18** »، ئەو هۆنەرە گەورەیەی کورد، بە نەخۆشیی « شێرپەنجە » جێیهێشتین و مرد، بەڵام، هەمیشە خۆی و هۆنراوەکانی زیندوون. ئێمەش لەگەڵ گیانی پاک و ڕەوانیدا، خۆمان بە ڕۆڵەیەکی بە ئەمەکی ئەم خاکە دەزانین و دەڵێین:

ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ! تا قیامەت ئاخ و داخ!

من کە سنگم بەردە، طەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ،

من کە خوێنم ئاگرە،

چوونە جۆشم حازرە،

من کە مایەی فەخری تەئریخی بەڕووم،

تاقە ڕەنگی ئابڕووم

مەردیی، بێ باکیی، دلێریی بوو هەموو ...
کوا؟ مەگەر ئەصڵی نەبوو؟
بۆ سەرم نەرمە، لە عاستی بەندی دیلیی، داخەکەم؟
بۆ لە نزمیی و پەستییا، وەک گۆمی « لووط »ە شاخەکەم؟
ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
نەگبەتیی کوردی هەژار، ئاخ! ...
بۆچی، ئەو سنگەی سپەر بوو بۆ پەلاماری عەدوو
بوو بە پەردەی سەر قەفەز، بۆ دەربڕینی ئارەزوو؟
بۆ زوبانی بێ گرێم
نایەڵێ، سەربەست بڵێم؟
ڕێبوارم، سەربەخۆیی کەعبەمە،
دەشتی خوێن گەر ڕێگەمە،
بێ خوطوورەم، بەردەبازم کەللەیە،
تا ئەگەم بەو قیبلەیە! ...
بۆ نەهاتە سەر دەمم، ئەم چەشنە گوفتارانە قەت؟
بۆ نەبوومە پاڵەوانی، کردەوەی ئازانە قەت؟
ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
غیرەتی کوردی هەژار، ئاخ !...
ئەی ئەوەی قەومانی بەشبەشکرد بەپێی خاک و زمان،
دای بە هەر قەومێ نگین و تاج و تەختی حوڕیان!
کوا نگینی بەختی من؟
کوانێ تاج و تەختی من؟
بۆ لە خاکی پاک و زاری بێ گرێم،
غەدر ئەکەی؟ نابەخشی پێم؟
یا ئیلاهی، حەققی خۆم داوا ئەکەم:
کوا نگین و تەختەکەم،
بۆ لە عەرشی دادپەروەر ـ بۆ دڵی کوردی هەژار! ـ
تاقە تیرێکی ستەم، عەکسی بکات و بێتە خوار؟
ئۆف، هەزار ئۆف! ئاخ، هەزار ئاخ!
خالیقی کوردی هەژار، ئاخ! ... «186،185،6»

**10**. هەر لەم مانگەدا بوو، پیاوێکی نیشتمانپەروەر و خۆشەویستی شارە گەشاوەکەی « سولەیمانیی »، گیانی پاکی بە کورد بەخشی. بەڵێ، ڕۆژی

« 1937. 11. 20 » بوو، « مەحموود جەودەت » لە سێدارەدرا. هێندێ لە هۆنەرانی کورد، هۆنراوەیان بۆ هۆنییەوە. خەڵکی شار، سەریان بۆ لە قوڕنا و چاویشیان گریا.

11. خۆ گەر، سەرکردە و قارەمانێکی وەک « سەیید ڕەزای دەرسیمیی »، شەستوپێنج ساڵ لەمەوبەر، بە ئازایەتیی و چاوقایمیی خۆی، زراوی گیانکێشەکانی بردبێ و مەرگی ڕاونابێ، ئەوا، هەمووی بیستوهەشت ساڵ لەمەوبەر بوو، چەن سەرکردە و قارەمانێکی دڵسۆزی تێکۆشەری دیکەی وەک: « شەهابی شێخ نووریی، شێخ جەعفەر، ئەنوەر و زۆراب »، زۆر ئازایانە، بە پیر مەرگەوە چوون، لە پێناوی سەربەخۆیی خاکی « کوردستان » و ئازادیی ڕۆڵەکانی کورددا، پەتی سێدارەیان بە خەڵات زانی، لە گرتووخانە سامناکەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »دا، ڕۆژی « 1976. 11. 21 »، لە سێدارەدران و خاکی « کوردستان »ی ئازیزیش، باوەشی پڕ لە ئەمەک و دڵسۆزیی، بۆ ئەو چوار بێچووە شێرە کوردپەروەرە کردەوە. ئاخر، ئەوانیش وەک « سەیید ڕەزا » وا بوون، نەک هەر لە مەرگ نەترسان، نەک هەر ورەیان نە ڕوخا، نەک هەر نەپاڕانەوە، بەڵکوو بە شانازییشەوە، پێشوازییان لە مەرگ کرد و بەگژ بکوژەکانیشیاندا چوونەوە!

12. ئەدی کام کورد هەیە، ساتێ لەگەڵ ئاواز و دەنگەخۆشەکەی، هونەرمەندی بلیمەتی کورد « ڕەفیق چالاک »دا نەژیابێ؟ کام خوێنەری کورد هەیە، گوتارێکی ئەو نووسەرە دەسڕەنگینەی نەخوێندبێتەوە؟ کام هونەر دۆستی کورد هەیە، تەماشای یەکێ لە کارە هونەریی و شانۆگەرییەکانی نەکردبێ؟ بەڵێ، ئێستەش هەموو ڕۆژێ، بە یادی ئەو پیاوە گەورەیەوە، گۆرانیی و ئاواز، پەخشان و کورتەچیرۆک، شانۆ و شانۆگەریی، پرسە بۆ بەهرە و لێهاتوویی « چالاک » دادەنێن. ئێستەش « دوو ئاوانەکەی پیرەمێرد » لێکدەدەن و پێکدەگەن، دڵۆپدڵۆپ، فرمێسکی مرواریی، بە چاویاندا دێتەخوارێ. ئێستەش، « ئاواتی دوورییەکەی گۆران »، وەک « چاوی بازی نێو قەفەس »، خەو لە چاوی ناکەوێ. ئێستەش، « بابەبابەکەی شێرکۆ بێکەس »، وەک منداڵێ باوکی مردبێ، « چالاک »ەڕۆیەتی! ئەمانە هەموویان پێکەوە و پێکڕا، تێرتێر، بە سەر لانەی وێران و هەواری خاڵیی هونەر و وێژەی کوردییدا، بۆ « چالاک »ی دەنگخۆش، نووسەر، هونەرمەند و بلیمەت دەگرین. هەڵبەتە، گەر « چالاک »یش کورد نەبووایە، هەرگیز، لە هێندێ هونەرمەندی نەتەوەکانی دیکەی جیهان کەمتر نەدەبوو. هەرچەندە، ئەو هونەرمەندە بەرزەش، ڕۆژی « 1973. 11. 30 » ماڵاوایی لە هونەر و گەلەکەی کرد، بەڵام،

تا کورد و هونەر مابێ، ناوی لە لاپەڕەکانی مێژوودا، بە نەمریی دەمێنێتەوە.
13. ئاخ بۆ « کەمالیی » و هەرگیز، داخم بۆی ناچێ! چ هۆنەرێکی گەورەی ڕۆمانسیی، چ نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز و بە ئەمەک بوو! هەڵبەتە، هۆنەرێکی وەک « گۆران »ی بلیمەت، بە خۆڕایی نەیگوتووە:

ئەی کاکە « کەمال »! شاعیری خۆشخوانی هونەرمەند
بلبل نییە، تۆی تەیری تەڕەننوم لە سەحەردا
دەک خۆشبێ دەم و پەنجە و نووکی قەڵەمی تۆ
بۆ دادێ کە دات کاکە: لە مەیدانی هونەردا «30،5»

ئاخر، دوای « کەمالیی » کێ بێ، هۆنراوەی کلاسیکیی دڵداریی، بۆ ڕۆڵەکانی کورد بهۆنێتەوە و بڵێ:

وام ئەزانی، چاوەکەت تەنیا دڵ و گیانم ئەبا
کافرە، ئێستا خەریکە، دین و ئیمانم ئەبا
موسحەفی ڕووت، ئاشنایکردم بە ئیسلام و کەچیی
کوفری زوڵفت، دائیما بۆ کافرستانم ئەبا «42،5»

ئاخر، بۆچی چاوی « هەڵەبجە »، لە بری فرمێسک، بۆ مەرگی « کەمالیی »، خوێن نەڕێژێ؟ بۆچی کارئاسکەکەی دەشتی « شارەزوور »، بە کوڵ و بە خوڕ نەگری؟ بۆچی غەزالەکەی دەشتی چین وەحش نەبێ؟ خۆ تازە، دوای مەرگی « کەمالیی »، ئولفەت لەگەڵ کەس ناگرێ؟!! ئەدی هەر ئەو نەبوو، خۆی بە قوربانی کارمامزەکەی سەحرای « هەڵەبجە » دەکرد، ئیدی، بۆ جارێکی دیکە، مەیل بە کەس بدا؟!! کوا ئەو جەژنەی، هەموو کەس دەس لە مل یار بوون؟!! بۆ تەنیا هەر، « کەمالیی » بڕەنجێ و یارەکەی دەس لە ملی نەکا؟!! دە با ئێمەش، ساتێ گوێ بۆ دەردی دڵ و ناڵەی بێ دەنگی ڕاگرین:

ئەزانی، بۆچ فەلەک، گەردووش بە کامی ئەهلی دڵ ناکا
بەبێ ئەمر و مەرامی پیاوی دوون، قەت گەرد و خول ناکا
شتی خۆماڵیی، هەر بێ قەدرە، گەر ڕاستت ئەوێ بە خوا
هەزار « قۆڵۆنیا » لام، قیمەتی دەنکێ « سمڵ » ناکا
دڕک، خۆ پاسەوان و هاودەمە دائیم لە دەوری گوڵ
سەرم سووڕماوە، بۆ بولبول، پەرستش بۆ چقڵ ناکا؟
غەزالەی دەشتی چین وەحشن، لەگەڵ کەس ناگرن ئولفەت
فیدای کارئاسکەکەی سەحرای « هەڵەبجە »م من، کە سڵ ناکا
ئەزانێ، ڕۆژی عاشق ڕەش ئەبێ، وەک بەختی بەر گەشتەی
نیگاری دیدەکاڵم، بۆیە چاوی فێری « کل » ناکا

ئەوا جەژنە، هەموو کەس دەس لە مل یارن بە دڵشادیی
بە تەنیا یارەکەی بێ ڕەحمەکەم، دەستم لە مل ناکا
بە « لوقمان » و « ئەرەستۆ » ناکرێ، چارەی هەتا مردن
بە غەیرەز ماچی لێوت، کەس عیلاجی دەردی دڵ ناکا
ڕەقیب وەک سپڵی لاوورگە، بە خەنجەر بیکوژن ئامان
بە غەیری زەڕبی خەنجەر، هیچ شتێ چارەی « سپڵ » ناکا
نەوەک بەربێ لە دوایی، پەرچەمی لوولی دڵی عاشق
« کەمالیی »، بۆیە یارم پەرچەمی خۆی خاو و شل ناکا «38،5»
ئاخر، کێ وەک « کەمالیی » بلیمەت، بەو ڕاشکاویی و بەو شێوەیە، زۆر بە ئاشکرا، شانازیی بە کوردێتیی خۆی و زمانەکەیەوە کردووە؟ ئای کە بەرزە، کاتێ فەرموویەتی:
من فەخرئەکەم، کە کوردم و کوردیی زوبانمە
ئەم شاخ و کێوە دڵکەشە، وا نیشتمانمە
ئەم خاکە پاکە جێگەمە، کە هەر زەڕڕەیەکی ئەو
خاڵ و برۆ و سەری شەهی « زەند » و « بەبان »مە
ئەم خاکە، تووتیا سیفەتە پاکەیە کەوا
دەرمانی چاوی پڕ گڵ و پڕ دەرد و ژانمە
پاشان، دوای ئەوەی، باسێکی زۆر جوانی یارە شیرینەکەی کردووە، جارێکی دیکەش، ئاوڕی لە نیشتمانەکەی داوەتەوە، بایداوەتەوە و گوتوویەتی :
لادە « کەمالیی »، بێرەوە سەر باسی نیشتمان
ئەم نیشتمانەی، دلبەری پڕ حوسن و ئانمە
ئەم نیشتمانە جوانەیە، وا وردە بەردی ئەو
یاقووت و دووڕ و گەوهەر و ئەڵماسی کانمە «106،5»
ئەو هۆنەرە بەرزەی کورد، کە دڵ و دەروونی لاوان و ئەویندارانی نەتەوەکەی خۆی، بە شنەبای بەرەبەیانی سازگاری هۆنراوە ڕۆمانسییەکانی فێنک دەکردنەوە، ئەو هۆنەرە گەورەیەی کورد، کە ئاوڕشێنی بیر و ئەندێشەی دڵدارانی دەکرد، ڕۆژی « 1974. 11. 30 » بە یەکجاریی، ماڵاوایی لە نیشتمان و هەموو ئەویندارانی کورد کرد. فریا نەکەوت، دەس لە ملی « کارئاسکەکەی سەحرای هەڵەبجە » بکا! وەک ئەوەی، لەگەڵ هونەرمەندی گەورەی کورد « ڕەفیق چالاک »دا بڕیاریاندابێ، لە یەک ڕۆژ، لە یەک مانگ و لە دوو ساڵی جیاوازدا بەجێمانبێڵن، باخە گەورەکەی هونەر و وێژەی کوردیی چۆڵکەن!

هەزاران سڵاو، لە گیانی پاکی ئەو پیاوە مەرد و ڕەندانە بێ، کە بەشێ لە ژیان و گیانی خۆیان، بۆ ڕازەکردنی نەتەوە و نیشتمانەکەیان تەرخانکردووە. منیش، هەر هێندەم بۆ دەکرێ، گوڵبەندی خۆشەویستیی و ئەمەک، لە سەر مەزراکانیان دابنێم و بڵێم: هیوادارم، بەهەشتی بەرین، جێی حەوانەوەیان بێ، تا، ماندوویی شەکەتی گیانیان دەرچێ.

ستۆکهۆلم
2004. 11. 30

* * *

---

تێبینی:

* لە دیوانەکەی خۆیدا، لە بری ووشەی « یەکێتیی »، « اتحاد » نووســــراوە. بەڵام، من هەر « یەکێتیی »یەکەم دانا. چونکە، لە نامیلکەی « سروود بۆ قوتابیان »دا وا نووسراوە. ئەمەیان جوانترە و کێشی هەڵبەستەکەش لەنگ ناکا.


سەرچاوەکان :

1. حەمدیی، دیوان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفیست، بەغدا، 1984.
2. زێوەر، دیوان، سۆزی نیشتمان، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، 1958.
3. عەبدولخالق عەلادین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، دیوان، چاپی یەکەم، بەغدا، 1985.
4. کریس کۆچێرا، مێژووی کورد ...، وەرگێڕانی محەمەد ڕەیانی، چاپی یەکەم، تاران، 1369.
5. کەمالی، دیوان، چاپی یەکەم، بەغدا، 1986.
6. گۆران، دیوان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، بەغدا، 1980.
7. موفتی پێنجوێنیی، دیوان، چاپی یەکەم، بەغدا، 1990.
8. نەجمەدین مەلا ـ ئاریی، هۆنراوەکانم، دیوان، چاپی یەکەم، بەغدا، 1969.

# کۆرپە تاقانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم
# « Med TV»

دەمێبوو، چاوەڕوانی بارانێکی، پڕ لە سۆز و بە پیتی وا بووم، تا، هەموو گوڵاڵەسوورەکانی دەشت و چیا سەرکەشە سوتێنراو و وشککهەڵاتووەکانی « کوردستان »ەکەم بژێنێتەوە! کوڕگەل مژدەبێ، وا لەم زستانە سکپڕەی، وەرزی بەڵا و نەهامەتی کورددا باری.
دەمێبوو، چاوەڕوانی دەنگێکی زوڵاڵ و ڕەسەنی کوردیی بووم، تا، هەستی نەتەوەیی سڕبووی، هەموو کوردزمانەکان ببوژێنێتەوە! براییینە مژدەبێ، وا ڕەزی سەوزی دەنگەکان، هێشووی بیستنتانی گرت.
دەمێبوو، خەونم بە پەلکەزێڕینەی ڕەنگاوڕەنگی، ئاسمانی چانسی کوردەوە دەبینی، تا، لە قوژبنی هەموو ماڵێکدا، چرایەکی گەشی ڕۆشنبیریی هەڵکا، کوڕینە مژدەبێ، وا تەمی سەر خەونە گەورەکانتان ڕەوینەوە.

### ئەی « Med TV »

هەمووو ئێوارەیە، لە بەر دەنگی پڕ بە جۆشی « ئەی ڕەقیب »ەکەی تۆ، هەموو دوژمنانی نەتەوەی کورد، هەموو داگیرکەرانی « کوردستان »ەکەت، زارەترەک دەبن.
هەموو ئێوارەیە، لە هەر شوێنێ کوردی لێ بژێ، چەندین میلیۆن منداڵی ڕەشوڕووتی خێرنەدیوی نەتەوەکەت، بێ ئارام، چاوەڕوانی زایەڵەی زەنگی کاروانی « نەوبەهار »ەکەتن.
هەموو ئێوارەیە، چەندین میلیۆن مرۆڤی کورد، ڕوو لە ڕووگەی ئەڤینی پاکی تۆ دەکەن و زۆر بە پەرۆشەوە، گوێ بۆ « دەنگوباس » و هەواڵە جەرگبڕەکانی « کوردستان »ە لەتوپەتکراوەکەت ڕادەگرن.

هەموو هەفتەی جارێ، چەن هەزار ڕۆشنبیری کورد، لە ئێسگەی « هەواری ڕۆشنبیریی » تۆدا، پێکدەگەن و دەمەتەقێی گەرم، لە سەر ڕەوشی هونەر و وێژەی کوردی دەکەن .
هەموو هەفتەی جارێ، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی ڕوون و بێ گەردی تۆدا، ئەستێرە پرشنگدارە گەشەکەی چانسی « گەلاوێژ »ی تۆ هەڵدێ و بەرپێی لاوانی نەتەوەکەت ڕۆشندەکاتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « ژیانی گەل »ەکەی تۆ، هۆش و بیر، بە بەر مێشکی سڕکراوی لاوانی نەتەوەکەتدا دێنێتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « هەقپەیڤین »ەکانی تۆ، چەندین بەستەڵەکی درۆ، پڕوپاگەندەی ژاراویی دوژمنان و داگیرکەرانی نیشتمانەکەت دەتوێنێتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « یادی نەمران »ەکەی تۆ، ئاگرلە جەرگی نەتەوەپەروەر و نیشتمانپەروەرانی کورد بەردەدا، بەو ڕێزگرتن و بەسەرکردنەوەیەش، گیانی پاکی ئەو کەڵەپیاوانە، لە گۆڕی پڕ لە ئارامیاندا شاددەکا.
هەموو هەفتەی جارێ، « دیرۆک »ەکەی تۆ، بانگی مێژووی لە خوێنداگەوزاوی هەزار ساڵەمان، بە گوێی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردا دەدا.
هەموو هەفتەی جارێ، باخچەی ژینی بینەرانت، بە دەیان چەپکەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ و ڕیحانەڕەشەی بۆنخۆشی وەک: « نەوبەهار، جەوانان، هەواری ڕۆشنبیریی، دەنگوباس، شیرۆڤە، ڕەوشی جیهان، هەقپەیڤین، دیرۆک و گەلاوێژ » دەڕازێنیتەوە.

بۆیە ئەی « **Med TV** »
هەر تۆ، دەنگ و ڕەنگی بەرنامەکانت، لە ڕاژەی ووشەی پیرۆزی کوردیی و بیری کوردایەتیی دایە.
هەر تۆ، دەنکە مرواریییە جوانە پساوەکانی گەردانەکەی، کەژ و کێوی چوار پارچەی « کوردستان »ەکەم بۆ دەهۆنیتەوە.
هەر تۆ، دێوەزمەی ناقۆڵای، سنوورە دەسکردەکان دەبەزێنی، تۆوی باوەڕی کوردایەتیی و بڕوابەخۆبوون، لە نێو ئینجانەی بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی گەلدا دەچێنی.
هەر تۆ، زراوی دوژمنان دەتۆقێنی و گەرای مەرگ، لە هێلانەی دڵ و دەروونە ڕەشە پڕ لە قینەکانیاندا دەخەی.
هەر تۆ، سەراپا داستانی پڕ لە خوێناویی، مێژووی هەزار ساڵەی ژێردەسیی و چەوساندنەوەم بیردەخەیتەوە.

هەر تۆ، وانەی ڕاستەقینەی ئەڤینی میللیی، فێری منداڵانی نەتەوە هەژارە چەوساوەکەم دەکەی.
هەر تۆ، چەپکێ گوڵاڵەسوورە، لە باخە تەلبەندکراوەکەی « دیاربەکر »ی « شێخ سەعید »ی شەهید دەچنی و لە شاییەکی خوێناوییدا، لە بەرۆکی بوکی ڕەشپۆشی کۆستکەوتووی شاری ئابڕوومەندی « مهاباد »ی « پێشەوا قازیی » دەدەی.
هەر تۆ، هەواڵی پۆلەچۆلەکەی سەربڕاوی، کۆڕی هۆنراوەی ئەڤین و خۆشەویستیی نیشتمانم، لە شاری هەڵمەت و قوربانیی « شێخ مەحموود »ی نەمرەوە، بە بوکەشووشەی دڵە ساواکەی منداڵانی بێچارەی، شارە خنجیلانەکەی « قامیشلۆ »ی « جگەرخوێن »ی، شەیدای نیشتمان و ئاوارە ڕادەگەیەنی.

## ئەی « Med TV »

تۆ پۆستەبەری و لە دەروازەی خڕداخراوی، هەموو ماڵە کوردێ دەدەی، مژدەی ژیاندنەوەی زمانی شیرینی کوردیی، بوژاندنەوەی کەلەپوری پڕ لە فەڕی میللیی نەتەوایەتییمان و گەشەسەندنی بیری « کوردستانیزم »، بە گوێی هەموو تاکێکی کورددا دەدەی.
تۆ « میر شەرەفخان »ی و لە قەڵا قایمە بەردینە بەرزەکەی « بەدلیس »ەوە، بە « شەرەفنامە »یەکەوە، سەر بە هەموو ماڵە کوردێکدا دەکەی، چیرۆکی پڕ لە قێزۆناکی « ناکۆکیی، ناتەبایی، دووبەرەکیی، نۆکەریی، خۆخۆریی، جەنگی کوردکوژیی » و هەموو پەندەکانی مێژووی پڕ لە شەرمەزاریی کوردیان، بۆ دەگێڕیتەوە.
تۆ « خانیی » و لە پێدەشتەکانی « بۆتان »ەوە، بە « مەم و زین »ێکی کوردیی پڕ لە ئەفسووناوییەوە، لە دەرگەی هەموو ماڵە کوردێ دەدەی، نەوجەوانانی کورد، فێری ئەوینی پاک و خۆشەویستیی ڕاستەقینەی خاک دەکەی، داوای لێبووردن و برایەتیی، یەکێتیی و تەبایی کورد، ڕزگاریی و سەرفرازیی، سەربەخۆیی و ئازادیی « کوردستان »یان لێ دەکەی.
تۆ « حاجی قادر »ی و لە شارە خنجیلانە جوانە دوژمنبەزێنەکەی « کۆیە »وە، بە پشکۆی پیتی گەرمی گەشی، نێو ئاگردانی جۆشدراوی هۆنراوەتەوە، سەر بە کۆشی هەموو خێزانێکی خێرنەدیویی کورددا دەکەی و منداڵان، فێری زمانی زکماکیی خۆیان دەکەی، بۆ تێکۆشانی کوردایەتیی و مەردایەتیی جۆشیاندەدەی.

تۆ « نالیی » و لە هەوارگەی دەربەدەریی و ئاوارەییـیەوە، بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، بە هەناسەی ساردەوە، بە دڵێکی پڕ لە حەسرەت و ئاخوداخەوە، ڕۆژی سەدان جار، خۆت بە قوربانی، تۆزی ڕێی بادی خۆشمرور دەکەی، چونکە، بادی خۆشمرور، پەیکێکی شارەزای شاری « شارەزوور »ە و سلاو بۆ هەموو « حەبیبە »کانت دەبا.

تۆ « بێکەس »ی نیشتمانپەروەری ئازا و نەترسی کوردیی، لە شارە گەشاوە کۆڵنەدەرەکەی « عەولەسیس »ی قارەمان و « ئەختەر »ی شێرەژنی کوردەوە، نوکی خەنجەری تیژی پەنجەی ئازایەتیی و مەردایەتییت، لە نێو قووڵایی چاڵی چاوی زەقی هەموو « ئەدمۆنس »ە داگیرکەرەکانی « کوردستان » دەچەقێنی و کوێریاندەکەی.

تۆ « مام هەژار »ی دەربەدەر و دێوانەی، ووشەی پاراو و هۆنراوەی پڕ لە تاموچێژی کوردیی و خاکی پیرۆزی « کوردستان »ی، لە دەشتە پڕ بە پیت و پانوبەرینەکانی « موکریان »ەوە ڕەودەکەی، هەر دەڕۆی، ڕاناوەستی، سەراپای « کوردستان »، بە پێی پەتیی و سەری قووتیی دەگەڕێی، بە « مەم و زین، مەلای جزیریی، شەرەفنامە، هەمبانەبۆرینە و قورئان »ێکی کوردییەوە، هاواری پاراستنی زمان، کەلەپوور و ژیاندنەوەی نەتەوەی کورد، لە ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوە بندەسە هەژارە دەکەی.

تۆ تەتەری ئازا و جەربەزەی پێشمەرگەی، لە لووتکەی هەموو چیا سەرکەشەکانی « کوردستان »ەوە، زۆر بێ باکانە، وەک هەڵۆ، تەلبەندی دڕکاویی هەموو سنوورە دەسکردەکان دەپچڕێنی، بە هەواڵە جەرگبڕەکانت، دڵی هەموو کوردپەروەران دادەخورپێنی، بە سەرکەوتنە مەزنەکانی پێشمەرگە گیان لە سەر دەسەکان، پتر وولاتپارێزان، بۆ کۆڕی خەبات و کوردایەتیی ڕاستەقینە جۆشدەدەی.

تۆ شەمەندەفەری باوەڕی کوردایەتیی و بیری پیرۆزی « کوردستانیزم »ی، لە دوورگەی ڕۆشنبیریی، بیر و فەلسەفەوە دێی، کاتێ، لە ئێسگەی هەر نێوچەیەکی کاولکراوی « کوردستان »ەکەتدا ڕادەوەستی، بە هەزاران کوڕوکالانی نەوەی نوێی کوردت، لێ خڕدەبێتەوە.

ئەی « **Med TV** »

دەبا، « هەواری ڕۆشنبیریی، وێژەیی و هونەریی » تۆ، بە هەزاران ڕۆشنبیری کورد، لە ئامێزبگرێ و لە هەواری ڕۆشنبیریی هەموو گەلانی دیکەش، گەرمتربێ.

دەبا، ئەستێرە وورشەدارەکەی « گەلاوێژ »ی تۆ، بە دەنگ، بە ڕەنگ، بە بیر، هەموو کونوقوژبنێکی « کوردستان » ە تاریکونووتکە کاولکراوە چۆلوهۆڵە بندەسەکەمان ڕۆشنکاتەوە، پێش هەموو ئەستێرەکانی دیکەی ئاسمانی، پانوبەرینی داگیرکەرانی « کوردستان »یش بکەوێ.

دەبا، دەنگی ڕەوا و ڕەسەنی « بیلال »ی « کوردستانیزم »ی تۆ، دەنگی ئازادیی، ژیاندنەوە و یەکێتیی کوردی تۆ، دەنگی چل میلیۆن مرۆڤی چەوساوە و بێ دەوڵەتی تۆ، دڵ، دەروون، بیر و هۆشی هەموو کوردێ پاراوکا، هەموو ئەو دەنگە نزم و ناسازانەی دیکەی « تورکچێتیی، ئێرانچێتیی، عێراقچێتیی و سووریاچێتیی »ش، لە بیابانی کاکیبەکاکی گەرووی وشکیاندا بتاسێنێ.

ئازیزەکەم! با دەنگبێ، کێ بێ، دەنگی لە دەنگی بە سۆزی تۆ خۆشتربێ.

ئازیزەکەم! با ڕەنگبێ، کێ بێ، ڕەنگی لە ڕەنگی زەرد و سوور و سەوزی ئاڵای تۆ، جوانتربێ.

* * *

---

تێبینی:

1. ئەم پەخشانە، بۆ یادی ساڵڕۆژی دامەزراندنی « **15 .05 .1995** ـــــ **Medtv** » نووسراوە و پێشکەش بە خۆشیان کراوە. بە داخەوە، « **Medtv** » بۆ ماوەیە داخرا. بەڵام، ڕۆژی « **14 .08. 1996** » ، بۆ دووەمین جار، دەسی بە بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی خۆی کردەوە و کوێراییشی بە چاوی دوژمنەکانیدا هێنا. بەو هیوایەی ئەم جارە بۆ تاهەتایە، پرشنگی خۆری ئازادیی خۆی، لە هەموو ماڵە کوردێکدا پەخشکاتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژیش، پتر بەرەو پێشکەوتن بڕوا. پاشان، لە گۆڤاری گزینگ، ژمارە **13**، سوید، **1996** بڵاوکرایەوە.

2. هەموو ئەو ناوانە: « نەوبەهار، جەوانان، هەواری ڕۆشنبیریی، دەنگوباس، شیرۆڤە، ڕەوشی جیهان، هەقپەیڤین، دیرۆک و گەلاوێژ » ، لەو سەردەمەدا، ناونیشانی بەرنامەکانی « **Medtv** » بوون.

3. بۆ نووسینی ئەم پەخشانە، کەڵک لە بەرهەمی هۆنەران: « شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، پیرەمێرد و نالیی » وەرگیراوە.

4. ئەم پەخشانە، لە سەردەمێکدا نووسراوە، « **Medtv** » لە هەموو جیهاندا، تاکە تێلێفیزیۆنی کوردیی بوو، تەنیا تروسکاییەک بوو، ماڵیی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆزی ڕووناکدەکردەوە. لەبەرئەوە، هیچ پێوەندییەکی بە هەڵوێستی نووسەرەوە نییە ، کە لەگەڵ « **.P.K.K** » بووبێ، یا نەبووبێ!

# بەهەشتی کــــــوردەواریی!

ڕۆژی « 04 .12 .2004 »، هەشتەمین فیستیڤاڵی « گەلاوێژ »، لە شارە گەشاوەکەی « سولەیمانیی » دەسیپێکرد و ڕۆژی « 10 »ی مانگ تەواوبوو. واتە: ماوەی یەک هەفتەی ڕێکی خایاند. منیش، یەکێ لەو دەیان میوانانە بووم، بانگهێشتکرابووم.
ئەز لێرەدا، قسەم لە سەر ئەوە نییە، لە ڕووەکانی بەڕێوەبردن، ئاستی وێژەیی و کاردانەوەی بەشداربووان، لە فیستیڤاڵەکە بدوێم و هەڵیسەنگێنم. بەڵکوو، ئەوەی زۆر لای من گرنگە، ئەوەیە: چەندین « خوێندەوار، ڕووناکبیر، هونەرمەند، نووسەر، هۆنەر، چیرۆکنووس و کۆڵەر »ی نەتەوەکەمان، لە زۆربەی زۆری شار و شارۆچکەکانی « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، « خۆرهەڵات و خۆراوای کوردستان » بە گشتیی هاتبوون، لەوانە هەبوون، میوانبوون، هەشبوون، بە « هۆنراوە، چیرۆک و کۆڵینەوە »، بەشدارییان لە فیستیڤاڵەکەدا کردبوو.
بە کورتیی: لەم گوتارەدا دەمەوێ، لە ڕووی « کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی »یەوە، باسی فیستیڤاڵەکە بکەم و لە کەڵکەکانی بدوێم. بە ڕاستیی، فیستیڤاڵەکە، وەک کۆبوونەوەیەکی نەتەوەیی کەلتووریی وابوو، خوێندەوار و ڕووناکبیران، پەیتاپەیتا، خۆیان بە یەکدی دەناساند، دەمەتەقێیاندەکرد، بیر و ڕایان دەگۆڕییەوە، ناونیشانیان لە یەکدی وەردەگرت و تێکەڵاوییەکی زۆر باش، لە نێوانیاندا دروستبووبوو.

هەر لە یەکەمین ڕۆژدا بوو، کۆمەڵێ کوڕ و کیژی لاوی هێژای « ڕۆژهەڵاتی کوردستان »م ناسی. خۆشبەختانە، لە ڕێی بەرهەمەکانمەوە بە گشتیی و گوتارەکانی « Kurdistanpost »ەوە بە تایبەتیی، لە دوورەوە دەیانناسیم. هەروەها، منیش هێندێکیانم وەک ناو، هەر لە دوورەوە دەناسی، بێ ئەوەی، پێشتر هیچمان یەکدیمان دیبێ.
بەڵێ، ماوەی یەک هەفتە، هەموو ڕۆژێ: بەیانیان، پاش نیوەڕوان و ئێواران، تا دەرەنگ، پێکەوە بووین، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە گرفتێ ڕوویدا. هەموومان بە تەواویی، هۆگری یەکدی بووبووین. گەلێ یادگاری خۆش و شیرینمان، لە لاپەڕەکانی بیر و هۆشماندا تۆمارکرد. کاتێ فیستیڤاڵەکەش تەواوبوو، هەر کەسەی لە کوێوە هاتبوو، بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە. بەڵام، هێندێ لەو خوشک و برایانەی « ڕۆژهەڵات »، زۆر بە گەرمیی، داوایان لێ کردم، کاتێ لە « ئێران »ەوە دەگەڕێمەوە، سەریان لێ بدەم. منیش، دڵم نەشکاندن و بەڵێنم پێ دان، بەسەریانکەمەوە.
ئەوەبوو، ڕۆژی « 2004. 12. 20 »، شڕوشیتاڵم کۆکردەوە و بارگەم پێچایەوە، سواری ترۆمبێل بووم و گەڕامەوە. دەمەو نێوەڕۆیەکی درەنگ، لە شاری « سنە »ی خۆشەویست دابەزیم. هەر زوو، پێوەندییم بە یەکێ لەو دۆستە بەڕێز و ئازیزانەوە کرد. بەڵام، هەر هێندە، زەنگم بۆ لێدا، ئیدی وەک لە ئاسمانەوە بارییبێتم، پاش ماوەیەکی کەم، خۆی و کوڕە گەورەکەی، بە ترومبێلێکەوە پەیدابوون و لە بەردەممدا وەستان. دابەزین، یەکدیمان ماچ کرد، سواربووین و بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین. بە ڕاستیی، ئەوەی ئەو خێزانە بەڕێزە، بۆ منیان کردووە، باوەڕ ناکەم، هیچ برایەکی دایک و باوکیی، یا، هیچ هاوڕێیەکی گیانیبەگیانییش، لە ژیانمدا بۆیان کردبم!
دوای ماوەیەکی کەم، نانی نیوەڕۆمان خوارد. ئینجا، بە ترومبێل، نێو شارەکەیان گێڕام، شوێنە گرنگ و خۆشەکانی شاریان پیشاندام. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و شایانی باسکردنبێ، بە چەن خاڵێ باسیدەکەم:
1. کاتێ ساڵی « 1974 »، لە هێزی « خەبات » پێشمەرگە بووم، بۆ یەکەمین جار، شاری « سنە »م دی. بەڵام، هیچ گومانی تێدا نییە، لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا، شارەکە، گۆڕانێکی چەندایەتیی و چۆنایەتیی گرنگی، بە خۆیەوە دیوە. زۆر گەورەبووە، ژمارەی دانیشتووانی زیادیکردووە، گەلێ خانووی گەورە و تەلاری بەرزی جوانی تێدا درووستکراوە، بە تەواویی گەشەیکردووە و وەک بووکی « ڕۆژهەڵاتی کوردستان »، ڕازاوەتەوە. جادەی پان و بەرین، پردی زۆری سەر زەویی و هەڵواسراوی پەڕینەوە، دارودرەختی سەر

گردەکان، بلواری خنجیلانە و ڕێکوپێک، هێندەی دیکە، دیمەنی شارەکەیان جوانترکردووە و سەرنجی ڕێبوار، بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. بە تایبەتیی، بۆ یەکێکی وەک من، زۆر دڵگیر و خۆشبوو، چونکە، لە زۆر ڕووەوە، لە شاری « سولەیمانیی » دەچوو و هەستم بە نامۆیی نەدەکرد، بە تایبەتییتریش، کاتێ بە چیای سەرکەشی « ئابیدەر »دا سەرکەوتین، لە سەر لووتکە بەرزەکەی گیرساینەوە، تەماشای شارمان کرد، یەکسەر، چیای « ئەزمڕ » و ئێوارانی « سولەیمانیی »م بیرکەوتەوە. چونکە، کۆمەڵێ چیای گەورە و گچکە، بەرز و نزم، دەوری هەر دوو شاریان داوە، دەشتێکی پان و بەرینیش، لە ئامێزیان گرتوون، بە ئارامیی، لە باوەشی پڕ لە نازییاندا ڕاکشاون، دەڵێی، خەویان لێ کەوتووە! لە دووریشەوە، گڵۆپەکانی شار دەبریسکانەوە و جریوەیان دەهات، ختووکە و خۆشییەکی تایبەتییان، بە گیانی شەکەتی بینەران دەدا. بەڵام، باشتر وایە، مرۆ دان بە ڕاستییدا بنێ و بڵێ: شاری « سنە »، گەلێ لە شاری « سولەیمانیی » خاوێنتر، ڕێکوپێکتر، شیرینتر و ڕازاوەترە. کەچیی، لە ڕووی جوڵەی هاتوچۆوە، تا بڵێی، بێ یاسایی پێوە دیارە، بە شێوەیە، هیچ جۆرە یاسا و ڕێسایەکی هاتوچۆ پێڕەو ناکرێ!

جاران، چیای « ئابیدەر »، جگە لە چەن درەخت و کانییەک، هیچی دیکەی لێ نەبوو. بەڵام ئێستە، تا سەر لووتکەکەی، جادەی پان و گەورەی قیرتاوکراوی بۆ ڕاکێشراوە، مرۆ زۆر بە ئاسانیی دەتوانێ، سەرکەوێ و هەر چوار دەوری شار ببینێ. زۆربەی زۆری چیاکەش، بە درەختی هەمەچەشنە ڕازاوەتەوە، گەلێ کیۆسک، چایخانە، ڕێستۆرانتی جوان و خاوێنی لێ کراوەتەوە. بە ڕاستیی، کاتێ لەو بەرزاییەوە، تەماشای شارم دەکرد، هێندە جوانبوو، هەر لە « بەهەشتی کوردەواریی » دەچوو، جوانییەکەی بە شێوەیە بوو، هێزی پێم نەبوو، بگەڕێمەوە و بەجێیبێڵم.

ئاخ! خۆزگەم هەموو کوردێ، توانای ئەوەی ببووایە، سەردانێکی ئەو شارە دێرینەی « کوردستان »ی بکردایە و چەن ڕۆژێکی تێدا بمایایەتەوە، تا، لە ئەفسوونی جوانیی شار، لە ڕووخۆشیی و میوانداریتیی دانیشتووانەکەشی، بێ بەش نەبووایە. خۆزگەم، لە ڕووی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییشەوە، ئازادیی تەواویان هەبووایە، ئینجا دەمزانی، پێتەختی خان و بەگەکانی دەوڵەتی « ئەردەلان »، چەن جوانتر و پێشکەوتووتر دەبوو!

2. ئەو ئێوارەیە، دوا ڕۆژی کەژی پاییز بوو. واتە: یەکەمین شەوی وەرزی زستان بوو. بەڵێ، ڕۆژی « 20 »ی مانگی هەموو ساڵێ، هەموو دانیشتووانی دەوڵەتی « ئێران » بە گشتیی، دانیشتووانی شاری « سنە » بە تایبەتیی،

کەژاوەی کەژی پاییزی پرچ زەرد بەڕێدەکەن، خۆیان ئامادەدەکەن، پێشوازیی لە بێشکەی ساردوسڕی، وەرزی زستانی پرچ سپی بکەن. بۆیە، لە سەرانسەری « ئێران »دا، ئەو شەوە، جێژن دەگێرن، بە زمانی فارسیی « شەوی یەلدا » و بە کوردییش، « شەوچلە »ی پێ دەڵێن. گوایە: یەکەمین ڕۆژی زستانە، بە درێژترین شەوی ساڵی « ئێران »یش دادەنرێ.
لەبەرئەوە، دەمەو ڕۆژاوابوون، شەقامەکانی شار جمەیاندێ، ڕێ بەر ڕێبوار ناکەوێ، کۆمەڵانی خەڵک، بە نێو بازاڕەکاندا دەگەڕێن، کەرەسەی پێوست بکڕن و خۆیان بۆ ئەو شەوە ئامادەکەن. دوای ئەوەش، هەر سەر لە ئێوارە، هەموو دووکان و بازاڕەکان دادەخرێن، دەرگەی چایخانە و ڕێستۆرانتەکان دەبەسرێن. واتە: گەر ئەو شەوە، ڕێبوارێ ڕێی لەو شارە بکەوێ، بێ شێو سەردەنێتەوە. چونکە، هەموو خێزان و بنەماڵەکانی شار، لە ماڵی گەورەیەکیان کۆدەبنەوە، پێکەوە نان دەخۆن و جێژن دەکەن. وەک بیستم، فارسەکان زیاتر « پلاو » و کوردەکانیش « یاپراخ » لێدەنێن. دوای ئەوەی نانی ئێوارەش دەخۆن، ئیدی ئەو شەوە، بە قسەی خۆشەوە بەسەردەبەن، سەرگوزشتەی کۆن دەگێڕنەوە. چەرەس، شیرینیی و میوە دەخۆن، تا درەنگانێ پێکەوە دادەنیشن، بە خۆشیی و کامەرانیی ڕادەبوێرن. لێرە و لەوێش، لە ناکاو، گوێت لە دەنگی فیشەکەشێتە و دەمارقاچان دەبێ. ئەم کەلتوور و جێژنە گەورەیەشیان، لە سەردەمی پەیامبەر « زەردەشت » و ئیمپراتۆریای « میدیا »وە بۆ ماوەتەوە، پشتاوپشت پاراستوویانە، شانازیی پێوە دەکەن و زۆر بە پەرۆشیشەوە، ڕێزی لێ دەگرن و یادیدەکەنەوە!
3. هەر بەو بۆنەیەشەوە، خوێندکارانی وانەی کوردیی زانکۆی « ئازاد » لە شاری « سنە »، بە هەزار ناری عەلی، مۆڵەتیان لە لایەنە بەرپرسەکان وەرگرتبوو، تا، ئاهەنگێکی کوردانە سازکەن. ئەو دۆستە ئازیزانە، منیشیان بانگکرد و کۆڵێ گەورەیان کردم. ئاهەنگەکە، لە سەر شانۆی زانکۆ سازکرا و کاژێری « 30 .18 » بە کاتی « ئێران » دەسپێکرد. کاتێ لە دەرگەی هۆڵەکە نزیکبووینەوە، پۆلێ کوڕ و کیژی کورد، بە جلی کوردیی و دەم بە پێکەنینەوە، زۆر بە گەرمیی، بەرەو ڕوومان هاتن، پێشوازیی و خۆشهاتنیان لێ کردین، پێش خۆیان داین، لە ڕیزی پێشەوەی هۆڵەکە، جێیان بۆ ئامادەکردبووین و ئێمەش دانیشتین.
بە ڕاستیی، زۆر سەرم سووڕمابوو، نەمدەزانی، ئەوە خەوە یا ئەندێشەیە! ئاخر، من چی دەبینم؟!! چی دەبیستم؟!! تۆ بڵێی، ئەو کۆبوونەوە « هونەریی و وێژەیی »یە گەورەیە، لەو شارە سوورەدا سازکرابێ؟!! تۆ بڵێی، چەرخ و

دەوران گۆڕابێ، وا ڕۆڵەکانی کورد، بە ئاشکرا، خۆیان دەنوێنن؟!! ئاخر، چۆن سەرم سووڕ نەمێنێ، ئەو هۆڵە گەورەیە، بڕبڕبووبوو، یەک کورسیی بەتاڵ نەمابوو، تەنانەت خوێندکارەکان، لە سەر پلیکانەی نێوەڕاستی هۆڵەکە دانیشتبوون و لە قەراغ دیوارەکانیش، بە پێوە وەستابوون! جگە لە من و هێندێ میوانی دیکەش، زۆربەی هەرە زۆریان، چ نێر و چ مێ، جلی کوردیی ڕەنگاوڕەنگیان پۆشیبوو، ئەو هەموو کوڕە قنجە قیت و قۆزە، ئەو هەموو شەکرەکیژە کارمامزە نەرمە ناسکە جوان و نەشمیلانە، بە جلی کوردیی ڕەنگین و پشتێنی شۆڕەوە، دەهاتن و دەچوون، دەتگوت، لە هۆڵی پیشانگەی پۆشاکدا دانیشتووین و جوانترین خۆپیشاندەری پۆشاک، بە بەردەماندا دێن و دەچن. هەموویان بالابەرز، نێوقەد باریک، شلومل و چاوبەڵەک، بە نیگای ئەفسووناوی چاو و زەردەخەنەی شیرینی سەر لێویان، بەندی دڵیان دەپساند و هەزاران پیری سەرسپی وەک منیشیان، گەنج دەکردەوە!
سەر شانۆکە، بە پرۆژێکتۆری ڕەنگاوڕەنگ و دیکۆری کوردەواریی جوان ڕازابۆوە، چەن جۆرە خواردەمەنیی و شەوچەرەیەکیش دانرابوو. ئاهەنگ دەسپێکرد، خانمەکوردێکی بەڕێز و نەشمیلانە دانیشتبوو، بەرنامەکانی پێشکەشدەکرد، بەشداربووانی بە گشتیی و منی میوانیشی بە تایبەتیی، بەخێرهێنا. ئینجا، یەک لە دوای یەک، کوڕ و کیژە لاوەکان، بەرنامەی تایبەتیی خۆیان، لە « هۆنراوە، پەخشان و چیرۆک »، پێشکەش بە ئامادەبووان کرد. ناوبەناویش، تیپێکی موزیکی کوردیی، ئاهەنگێکی موزیک و گۆرانیی کوردییان بۆ دەگێڕاین و هێندەی دیکە، کۆڕەکەیان گەرمتردەکرد، تاووتینیان بە لاوەکان دەبەخشی. یا، کۆمەڵێ کوڕی لاو، هەموویان ڕانکوچۆغەیان لەبەردابوو، کڵاشی « هەورامیی »یان لەپێدابوو، لە سەر ئاوازی گۆرانیی فۆلکلۆری کوردیی، هەڵپەڕکێیەکی گەلێ جوان و ڕێکوپێکیان پێشەکەشدەکرد، بە قیژەوقریشکەیان، ئارەزووی ئامادەبووانیان دەجوڵاند. بە ڕاستیی، هێندە جوان هەڵدەپەڕین، هەر لە خۆیان دەهات و کەم هەڵپەڕکێی وا جوانم، لە « باشوور » دیبوو!
دوای هەموو چالاکییەکیش، هارەی چەپڵە و هاواری ئامادەبووان، هەموو کون و قوژبنێکی هۆڵەکەی پڕدەکرد، بە تایبەتیی کاتێ ناوی چەن زاراوەیەکی وەک: « شەهید » یا « کوردستان »، لە هۆنراوە و پەخشانەکاندا دەهات، ئیدی، لە بەر هاوار و قیژە، هۆڵەکە دەلەرییەوە و لە سنووری تێ دەپەڕاند.
هەرچەندە خوێندکارەکان، بە مەرجێ مۆڵەتی ئاهەنگەکەیان وەرگرتبوو، بە هیچ شێوەیە، ناوی « کوردستان، ئازادیی و سەربەخۆیی » نەبەن و

گۆرانییەکانی هونەرمەند « ناسری ڕەزازیی »ش نەڵێنەوە. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بەو شێوەیە، هاواریاندەکرد و دەیانقیژاند، هەر ئەوە نەبوو، بۆ « کوردستان »ە ئازیزەکەی خۆیان، شێت و هار نەبن، خێراخێراش، بە یەک دەنگ هاواریاندەکرد، « ڕەزازیی، ڕەزازیی، ڕەزازیی ». منیش، لەو کات و ساتانەدا، بیرم لەوە دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خوایە، ئەمە چ سەردەم و ویژدانێکە، ئازادیی لە مرۆ قەدەغەکرێ، تەنانەت نەیەڵن، ئەم لاوە کوردانە، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، گۆرانییش بچڕن؟!!
بە ڕاستیی، کاتێ گوێم لە بەرهەمە جوانەکانیان بوو، وەک گوڵ گەشامەوە، تۆوی هیواکانم، لە ئینجانەی بیر و هۆشمدا، چەکەرەیکرد و گوتم: گەلێ ئەم ڕۆڵە ئازا و مەردانەی هەبێ، ئەم ڕۆڵە بە جەرگانەش، ئەو هۆنراوە پڕ لە جۆشوخرۆشانە بخوێننەوە، هەرگیز ناکرێ و نابێ، تا سەر، دەرگەی ئازادیی و سەربەخۆییان لێ داخرێ، هەر بەو شێوەیە بمێننەوە، مافە نەتەوەییەکانی خۆیان بە دەس نەهێنن! ئیدی، زۆر دڵم خۆشبوو، لە خۆشیاندا خەریکبوو، شاگەشکەدەبووم و بێ ئەوەی، ئاگام لە خۆم بێ، منیش وەک ئەوان، گەرم بووبووم، چەپڵەم لێدەدا و لە بەر خۆمەوە، بۆم دەسەندنەوە. بەڵام هەرچەندە، لە لایەکەوە، بستبست باڵامدەکرد. کەچیی، لە لایەکی دیکەشەوە، دڵم پڕبووبوو، بۆ باری نالەباری ئەو نەتەوە هەژارە بندەسە داگیر و دابەشکراوە، وەک مەنجەڵی سەر ئاگر قوڵپیدەدا، بیرم لەوە دەکردەوە و دەمگوت: ئاخر خوایە، تا کەی « **40** » میلیۆن کورد، بەو شێوەیە بژین و بچەوسێندرێنەوە؟!!
سەیر ئەوەبوو، خوێندکارەکان هێندە بەڕێز و خاوەن هەستی بەرزی کوردایەتیی خاوێن بوون، دەستەدەستە دەهاتن و خۆشهاتنیان لێ دەکردم، وێنەیان لەگەڵ دەگرتم و چەندین جار پێیان دەگوتم: ئاهەنگەکەت ڕازاندەوە، مایەی شانازییمانە، کوردێکی « باشوور »، بەشداریی جێژنەکەمان دەکا! بەڵێ، ئەوە یەکەمین جاربوو، بە چاوی خۆم و لە نزیکەوە، ئاهەنگێکی وا جوان و ڕێکوپێک، لە پارچەیەکی دیکەی دڵمدا ببینم، ئەوە یەکەمین جاربوو، لە نزیکەوە، ئەو هەستە نەتەوەییە خاوێنە، ئەو هۆشە گڕگرتووەی کوڕوکاڵانی « ڕۆژهەڵات »، هەست پێ بکەم، گوێم لەو چەن ووشە بەرز و پڕ واتایانە بێ، ئیدی، ناهەقمە، گەر شاگەشکەشبم؟!!
پاشان، چەن شێرەکوڕ و شەکرەکیژێکی خوێندکار، شیرینییان گێڕا، وردەوردەش، ئاهەنگەکە، بەرەو کۆتایی دەڕۆی، تا، کاژێری « **10** »ی شەو، خانمە بەڕێزە ئاهەنگێڕەکەی سەر شانۆ، سوپاسی هەموو لایەکی کرد و کۆتایی ئاهەنگەکەی ڕاگەیاند. پێش ئەوەی، بڵاوەشی لێ بکەین، پۆلپۆل

خوێندکاران هاتن و لە نزیکەوە، جارێکی دیکە، خۆشهاتنیان لێ کردم، تێکەڵبووین و بە دەم قسەکردنەوە، هێندێ باری سەرنجمان گۆڕییەوە و چەن وێنەیەکیشمان، بۆ یادگار گرت. پاشان، بڵاوەمان لێ کرد و ئێمە گەڕاینەوە.
ئەو شەوە، لە ماڵی باوکی خانەخوێکەمەوە، خواردن کرابوو، خوان بە چەندین جۆر « سەوزە، سەلاتە، ترشیات، میوە، ماست، یاپراخی سلّق و کەلەرم » ڕازابۆوە، خواردنێکی کوردانەی بە تام و چێژیان ئامادەکردبوو. تا درەنگانێکیش دانیشتین، قسە و باسی خۆشمان دەگێڕایەوە.
4. ڕۆژی دوایی، بەرچاییمان خوارد و کاژێری « 10 » دەرپەڕین. یەکەمین جار، سەرمان لە ماڵی « ئاسەفی گەورە » دا. ئەم ماڵە، بە یەکێ لە ماڵە گەورەکانی بنەماڵەی خانەکانی « ئەردەلان » دادەنرێ. لە دوو بەشی جیاواز پێکهاتووە: بەشی سەرەوەی، نزیکەی « 250 - 300 » ساڵ و بەشی خوارەوەشی، نزیکەی « 105 - 110 » ساڵ لەمەوبەر دەبێ، دروستکراون. ئێستە، ماڵەکە وەک ئاسەواری کۆن پارێزراوە، خەڵکی شار و توریست، سەردانیدەکەن. منیش، بە هەلم زانی و ئەو دەرفەتەم لە کیس خۆم نەدا، بلیتمان بڕی و خۆمان پێدا کرد. هەر چووینە ژوورەوە، پەیکەرێکی نیوەی هۆنەری گەورەی کورد « مەولەویی تاوگۆزیی »، بەرانبەرمان دانرابوو، بە ڕیش و سمێڵێکی درێژی سپییەوە، بە کڵاو و مێزەرێکی کوردانەوە، پێشوازیی لێ کردین، چاوە بەردینەکانیشی، لە چاومان چەقاندبوو. کاتێ لێی نیزکبوومەوە، بە فارسیی نووسرابوو: « مولوی کرد »، لە تەنیشتیشێوە، کورتەیەکی ژیان و ناوی بەرهەمەکانی ڕیزکرابوون.
پاشان ڕەتبووین و ڕۆیشتین. هەموو حەوشە و حەوز، دالان و هەیوان، ژووربەژووری ماڵەکمان پشکنی. هەموو دیوار و شوێنەکانیش، بە چەندین « تابلۆی جوان، پەیکەری نایاب، دیمەنی دڵفڕێن، وێنەی پیاوە گەورەکانی کورد، نووسینی مێژوویی، نەخش و نیگار »ی کەم وێنە ڕازابوونەوە. بە ڕاستیی، هەر سەرم لەوە سووڕمابوو، ئەوەی لە مێژووی ئەو شارە، بابەتی کەلتوور و فۆلکلۆری کوردیی دیم، هەر ئەو جۆرە شتانەبوون، کاتی خۆی، لە « سکانسن »ی شارە ڕازاوەکەی « ستۆکهۆڵم » لە « سوید » دیبووم، بە تایبەتیی، « ژووری مەلا، شاگرد، خوێندن، میوان، موبەق، نانکردن، نانخواردن، جلشتن، کۆبوونەوەی خەڵک لەگەڵ دەمڕاستی خاندا، پۆشاکی شارە جیاوازەکانی کوردستان، دارتاشیی، ئاسنگەریی، مسگەریی، ناڵبەندیی، کورتاندروون، وێنەی سەردارانی کورد و گەلێ شتی فۆلکلۆریی جوانی دیکە »، هەموویان بە مانیکانی جوان، جل و بەرگی کوردیی

جۆراوجۆر و ڕازاوەوە دروستکرابوون. جگە لەوەی، ژوورێکی گەورەشیان، بۆ هونەرمەند و کارمەندەکان تەرخانکردبوو، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاریان لە ماڵەکەدا دەکرد و بابەتی فۆلکلۆریی نوێیان دروستدەکرد.
سەیر ئەوبوو، یەکێ لە نەوەکانی « ئاسەفی گەورە »، خۆی لەوێ کاریدەکرد، پیاوێکی کورتەباڵای لاواز بوو، قژ و ڕیشێکی سپی جوانی درێژی هێشتبۆوە، چاوەکانی بە قووڵا چووبوون، غەمێکی زۆری تێدا بەدیدەکرا، لە پشت کورسیی و مێزێکی کۆنەوە دانیشتبوو، شتی دەنووسی. کاتێ لێی نزیکبوومەوە و هێندێ پرسیارم لێ کرد، یەکسەر گوتی: خەڵکی کوێی؟
گوتم: « سولەیمانیی ».
ئیدی، وازی لە نووسین هێنا، بە درێژیی، مێژووی ئەو ماڵە و بنەماڵەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە. ئاخر، پتر سەرم لەوە سووڕمابوو، لەو سەردەمەدا، چۆن بەو شێوە جوانە زانستانە و ئەندازیارانەیە، ئەو هەموو کۆشک و سەرایە، حەوز و ئاوە، گەرماو و ئاودەسە خاوێن و ڕێکوپێکانەیان دروستکردووە؟!!
هەڵبەتە، کوردیش وەک نەتەوەیەک، مێژوویەکی پرشنگدار و پڕ لە شارستانیی خۆی هەیە، بۆیە، پاشا و سەردارەکانی کورد، بەو شێوەیە ژیاون! کەواتە: مایەی ئەوەیە، شانازیی بە نەتەوەکەمانەوە بکەین!
دوای گەشتێکی « **40** » خولەکیی، کۆتاییمان بە سەردانەکە هێنا. پاشان، سەردانی مزگەوتێکی کۆنی شارمان کرد، کە خۆیان بە « جامع » ناویدەبەن.
ئەم مزگەوتە، ساڵی « **1227** » کۆچیی دروستکراوە، واتە: نزیکەی « **200** » ساڵ دەبێ، هەیە و ئێستەش، پایە و دیوارەکانی هەر بە پێوە وەستاون و بەرگرییدەکەن، ئێستەش، نوێژی ڕۆژی هەینیی لێ دەکرێ. بەڵام، بە داخەوە، سەردانی ماڵی « مەستوورە خانمی کوردستانیی »، مۆزێی شار و قەڵا بەرزەکەمان نەکرد. چونکە، هێندێکیان داخرابوون، هێندێکی دیکەشیان، سوپای تێدابوو، قەدەغەبوو، لێی نزیککەوینەوە! جگە لەوەی، درەنگیشبووبوو، دەبووایە، هێندێ دیارییم بکڕیایەوە و بەرەو ماڵ بگەڕاینایەتەوە، تا خۆم ئامادەکەم و کاژێری « **22. 00** »، بەرەو « تاران » بەڕێکەوم.
خودا یاربێ، لە دەمێکی دیکەدا، سەردانێکی دیکەی ئەو شارە شیرینە دەکەم، هەموو شوێنە مێژوویی و یادگارە دێرینەکانی « ئەردەلان » بەسەردەکەمەنەوە، تا ئاسەواریی مێژوویی دێرینی ئەو شارە، لە نزیکەوە ببینم، وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر، زاخاوی چاوەکانمی پێ بدەمەوە، دڵ و دەروونە کەیلەکەشمی پێ بگەشێنمەوە!*

ستۆکهۆڵم
**2004. 12. 30**

تێبینی:

رۆژی « 2005 .01 .12 »، جارێکی دیکە، بۆ هەڵبژاردن، سەردانی « کوردستان »م کردەوە. بە داخەوە نەمتوانی، لە « سنە » لادەم، بەڵکوو، یەکسەر لە « مەریوان » دابەزیم.
بەڵام، کاتێ ڕۆژی « 02 .08 » گەڕامەوە، پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ، کاژێری « 14. 00 » گەیشتمە شاری « سنە » و چاوم بە بینینی دۆستە ئازیزەکانم ڕۆشنبۆوە. پێشتر، چەن جارێ تێلێفۆنم بۆ کردبوون. لەبەرئەوە، هەر چاوەڕێیاندەکردم. دوای ئەوەی، نانی نیوەڕۆمان خوارد، سەردانێکی پەرتووکخانەی گشتیی شارمان کرد. لە نهۆمی چوارەم، کۆبوونەوەی « ئەنجوومەنی ئەدیبانی کوردستان » هەبوو. منیشیان بانگردبوو. دەمی ئێوارە و کاژێری « 18.00 » بوو، ماوەیە، گوێم لە هێندێ نووسەر و هۆنەر گرت، بەرهەمەکانی خۆیان خوێندەوە. پاشان، لەناکاو، داوایان لێ کردم، دەربارەی بەرهەمەکانی خۆم و پرۆسەی هەڵبژاردن لە « کوردستان »، بەشداریی لە کۆڕێکی پرسیار و وەڵامدا بکەم. منیش، بە خۆشییەوە پەسەندمکرد. کۆڕەکە، ماوەی دوو کاژێری تەواوی خایاند، دەمەتەقێیەکی تێروتەسەڵمان، لە سەر ڕەوشی کورد کرد.
پاشان، شیرینیی بەخشرایەوە و لە نزیکەوە، لەگەڵ ئەو خۆشک و برایانەدا، یەکدیمان ناسی.
ئێوارە، لە ماڵی خانەخوێکەم، کۆمەڵێ نووسەر و ڕۆژنامەنووس بانگرابوون، لەوانە: هەر دوو سەرنووسەری ڕۆژنامەی « ئاسۆ » و « سیروان »، کاک « ئەحمەدی محەمەدیی » وەرگێڕ ئامادەبوون. کاک « محەمەد »، باوکی خانەخوێکەمە. تا ئێستە، دە پەرتووکی لە کوردییەوە، بۆ سەر زمانی فارسیی وەرگێڕاوە. لەوانە: « چیم دی »، مێژووی ژیانی « شێخ مەحموود، قازی محەمەد و مەلا مستەفای بارزانیی ». بە ڕێککەوت کاک « حەمە ئەمین پێنجوینیی »ش لە « سنە » بوو. ئەویش زانیبووی، من لەو ماڵەم، هاتبوو. خواردنێکی زۆر ئامادەکرابوو. دوای نانخواردنیش، دەمەتەقێ گەرمبوو. بەڵام بە داخەوە، ئەو شەوە نەمتوانی، زۆر بمێنمەوە، چونکە دەبووایە، کاژێری « 22. 00 »، سواری ترۆمبێل بم و بەرەو « تاران » بەڕێکەوم.
ئەوە دووەمین جاربوو، لە نزیکەوە، لەگەڵ هێندێ لە کوردپەروەرانی پارچەیەکی دیکەی نیشتمانەکەمدا دانیشم، دید و بۆچوون ئاڵوگۆڕکەین. ئاخر، خەڵکی ئەو شارە تێکۆشەرە، ئاگردەکەنەوە و زۆر بۆ کێشە ڕەواکەی خۆیان بە پەرۆشن.
بڕیار وایە، زانکۆی « کوردستان » بە فەرمیی، بانگهێشتتم بۆ بنێرن، چەن ڕۆژێ لایان میوان بم، چەن کۆڕێکی وێژەیی و زمانەوانیی، بۆ خوێندکارانی کورد بگرم.
# لە ڕاستییدا نەمویست، ناوی هیچ دۆست و برایەکی کوردی ئەو شارە بێنم، بەڵکوو، هەر ویستم،، بە شێوەیەکی گشتیی، دەربارەی ئەو شارە شیرینە قارەمانەی « کوردستان »، شتێ بنووسم. تا ئەو کوردانەی، لە نزیکەوە نەیاندیوە، هەم لە دوورەوە، شتێکیان گوێ لێ بێ، هەم هانیانبدەم، سەردانێکی ئەو بەشەی « کوردستان »یش بکەن.

* * *

# کۆرپە تاقانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم
# « Med TV»

دەمێبوو، چاوەڕوانی بارانێکی، پڕ لە سۆز و بە پیتی وا بووم، تا، هەموو گوڵاڵەسوورەکانی دەشت و چیا سەرکەشە سوتێنراو و وشکهەڵاتووەکانی « کوردستان »ەکەم بژێنێتەوە! کوڕگەل مژدەبێ، وا لەم زستانە سکپڕەی، وەرزی بەڵا و نەهامەتی کورددا باری.
دەمێبوو، چاوەڕوانی دەنگێکی زوڵاڵ و ڕەسەنی کوردیی بووم، تا، هەستی نەتەوەیی سڕبووی، هەموو کوردزمانەکان ببوژێنێتەوە! برایینە مژدەبێ، وا ڕەزی سەوزی دەنگەکان، هێشووی بیستنتانی گرت.
دەمێبوو، خەونم بە پەلکەزێڕینەی ڕەنگاوڕەنگی، ئاسمانی چانسی کوردەوە دەبینی، تا، لە قوژبنی هەموو ماڵێکدا، چرایەکی گەشی ڕۆشنبیریی هەڵکا، کوڕینە مژدەبێ، وا تەمی سەر خەونە گەورەکانتان ڕەوییەوە.

ئەی « **Med TV** »

هەمووو ئێوارەیە، لە بەر دەنگی پڕ بە جۆشی « ئەی ڕەقیب »ەکەی تۆ، هەموو دوژمنانی نەتەوەی کورد، هەموو داگیرکەرانی « کوردستان »ەکەت، زارەترەک دەبن.
هەموو ئێوارەیە، لە هەر شوێنێ کوردی لێ بژێ، چەندین میلیۆن منداڵی ڕەشوڕووتی خێرنەدیوی نەتەوەکەت، بێ ئارام، چاوەڕوانی زایەڵەی زەنگی کاروانی « نەوبەهار »ەکەتن.
هەموو ئێوارەیە، چەندین میلیۆن مرۆڤی کورد، ڕوو لە ڕووگەی ئەڤینی پاکی تۆ دەکەن و زۆر بە پەرۆشەوە، گوێ بۆ « دەنگوباس » و هەواڵە جەرگبڕەکانی « کوردستان »ە لەتوپەتکراوەکەت ڕادەگرن.

هەموو هەفتەی جارێ، چەن هەزار ڕۆشنبیری کورد، لە ئێسگەی « هەواری ڕۆشنبیریی » تۆدا، پێکدەگەن و دەمەتەقێی گەرم، لە سەر ڕەوشی هونەر و وێژەی کوردی دەکەن .
هەموو هەفتەی جارێ، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی ڕوون و بێ گەردی تۆدا، ئەستێرە پرشنگدارە گەشەکەی چانسی « گەلاوێژ »ی تۆ هەڵدێ و بەرپێی لاوانی نەتەوەکەت ڕۆشندەکاتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « ژیانی گەل »ەکەی تۆ، هۆش و بیر، بە بەر مێشکی سڕکراوی لاوانی نەتەوەکەتدا دێنێتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « هەقپەیڤین »ەکانی تۆ، چەندین بەستەڵەکی درۆ، پڕوپاگەندەی ژاراویی دوژمنان و داگیرکەرانی نیشتمانەکەت دەتوێنێتەوە.
هەموو هەفتەی جارێ، « یادی نەمران »ەکەی تۆ، ئاگرلە جەرگی نەتەوەپەروەر و نیشتمانپەروەرانی کورد بەردەدا، بەو ڕێزگرتن و بەسەرکردنەوەیەش، گیانی پاکی ئەو کەڵەپیاوانە، لە گۆڕی پڕ لە ئارامیاندا شاددەکا.
هەموو هەفتەی جارێ، « دیرۆک »ەکەی تۆ، بانگی مێژووی لە خوێنداگەوزاوی هەزار ساڵەمان، بە گوێی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردا دەدا.
هەموو هەفتەی جارێ، باخچەی ژینی بینەرانت، بە دەیان چەپکەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ و ڕیحانەڕەشەی بۆنخۆشی وەک: « نەوبەهار، جەوانان، هەواری ڕۆشنبیریی، دەنگوباس، شیرۆڤە، ڕەوشی جیهان، هەقپەیڤین، دیرۆک و گەلاوێژ » دەڕازێنیتەوە.

بۆیە ئەی « **Med TV** »
هەر تۆ، دەنگ و ڕەنگی بەرنامەکانت، لە ڕاژەی ووشەی پیرۆزی کوردیی و بیری کوردایەتیی دایە.
هەر تۆ، دەنکە مرواریییە جوانە پساوەکانی گەردانەکەی، کەژ و کێوی چوار پارچەی « کوردستان »ەکەم بۆ دەهۆنیتەوە.
هەر تۆ، دێوەزمەی ناقۆڵای، سنوورە دەسکردەکان دەبەزێنی، تۆوی باوەڕی کوردایەتیی و براوبەخۆبوون، لە نێو ئینجانەی بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی گەلدا دەچێنی.
هەر تۆ، زراوی دوژمنان دەتۆقێنی و گەرای مەرگ، لە هێلانەی دڵ و دەروونە ڕەشە پڕ لە قینەکانیاندا دەخەی.
هەر تۆ، سەراپا داستانی پڕ لە خوێناویی، مێژووی هەزار ساڵەی ژێردەسیی و چەوساندنەوەم بیردەخەیتەوە.

هەر تۆ، وانەی ڕاستەقینەی ئەڤینی میللیی، فێری منداڵانی نەتەوە هەژارە چەوساوەکەم دەکەی.
هەر تۆ، چەپکێ گوڵاڵەسوورە، لە باخە تەلبەندکراوەکەی « دیاربەکر »ی « شێخ سەعید »ی شەهید دەچنی و لە شاییەکی خوێناوییدا، لە بەرۆکی بوکی ڕەشپۆشی کۆستکەوتووی شاری ئابڕوومەندی « مهاباد »ی « پێشەوا قازیی » دەدەی.
هەر تۆ، هەواڵی پۆلەچۆلەکەی سەربڕاوی، کوڕی هۆنراوەی ئەڤین و خۆشەویستیی نیشتمانم، لە شاری هەڵمەت و قوربانیی « شێخ مەحموود »ی نەمرەوە، بە بوکەشووشەی دڵە ساواکەی منداڵانی بێچارەی، شارە خنجیلانەکەی « قامیشلۆ »ی « جگەرخوێن »ی، شەیدای نیشتمان و ئاوارە ڕادەگەیەنی.

## ئەی « Med TV »

تۆ پۆستەبەری و لە دەروازەی خڕداخراوی، هەموو ماڵە کوردێ دەدەی، مژدەی ژیاندنەوەی زمانی شیرینی کوردیی، بوژاندنەوەی کەلەپوری پڕ لە فەڕی میلیی نەتەوایەتییمان و گەشەسەندنی بیری « کوردستانیزم »، بە گوێی هەموو تاکێکی کورددا دەدەی.
تۆ « میر شەرەفخان »ی و لە قەڵا قایمە بەردینە بەرزەکەی « بەدلیس »ەوە، بە « شەرەفنامە »یەکەوە، سەر بە هەموو ماڵە کوردێکدا دەکەی، چیرۆکی پڕ لە قێزۆناکی « ناکۆکیی، ناتەبایی، دووبەرەکیی، نۆکەریی، خۆخۆریی، جەنگی کوردکوژیی » و هەموو پەندەکانی مێژووی پڕ لە شەرمەزاریی کوردیان، بۆ دەگێڕیتەوە.
تۆ « خانیی » و لە پێدەشتەکانی « بۆتان »ەوە، بە « مەم و زین »ێکی کوردیی پڕ لە ئەفسووناوییەوە، لە دەرگەی هەموو ماڵە کوردێ دەدەی، نەوجەوانانی کورد، فێری ئەوینی پاک و خۆشەویستیی ڕاستەقینەی خاک دەکەی، داوای لێبووردن و برایەتیی، یەکێتیی و تەبایی کورد، ڕزگاریی و سەرفرازیی، سەربەخۆیی و ئازادیی « کوردستان »یان لێ دەکەی.
تۆ « حاجی قادر »ی و لە شارە خنجیلانە جوانە دوژمنبەزێنەکەی « کۆیە »وە، بە پشکۆی پیتی گەرمی گەشی، نێو ئاگردانی جۆشدراوی هۆنراوەتەوە، سەر بە کۆشی هەموو خێزانێکی خێرنەدیویی کورددا دەکەی و منداڵان، فێری زمانی زکماکیی خۆیان دەکەی، بۆ تێکۆشانی کوردایەتیی و مەردایەتیی جۆشیاندەدەی.

تۆ « نالیی » و لە هەوارگەی دەربەدەریی و ئاوارەییەوە، بە دوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە، بە هەناسەی ساردەوە، بە دڵێکی پڕ لە حەسرەت و ئاخوداخەوە، ڕۆژی سەدان جار، خۆت بە قوربانی، تۆزی ڕێی بادی خۆشمرور دەکەی، چونکە، بادی خۆشمرور، پەیکێکی شارەزای شاری « شارەزوور »ە و سڵاو بۆ هەموو « حەبیبە »کانت دەبا.

تۆ « بێکەس »ی نیشتمانپەروەری ئازا و نەترسی کوردیی، لە شارە گەشاوە کۆڵنەدەرەکەی « عەولەسیس »ی قارەمان و « ئەختەر »ی شێرەژنی کوردەوە، نوکی خەنجەری تیژی پەنجەی ئازایەتیی و مەردایەتییت، لە نێو قووڵایی چاڵی چاوی زەقی هەموو « ئەدمۆنس »ە داگیرکەرەکانی « کوردستان » دەچەقێنی و کوێریاندەکەی.

تۆ « مام هەژار »ی دەربەدەر و دێوانەی، ووشەی پاراو و هۆنراوەی پڕ لە تاموچێژی کوردیی و خاکی پیرۆزی « کوردستان »ی، لە دەشتە پڕ بە پیت و پانوبەرینەکانی « موکریان »ەوە ڕەودەکەی، هەر دەڕۆی، ڕاناوەستی، سەراپای « کوردستان »، بە پێی پەتیی و سەری قووتیی دەگەڕێی، بە « مەم و زین، مەلای جزیریی، شەرەفنامە، هەمبانەبۆرینە و قورئان »ێکی کوردییەوە، هاواری پاراستنی زمان، کەلەپوور و ژیاندنەوەی نەتەوەی کورد، لە ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوە بندەسە هەژارە دەکەی.

تۆ تەتەری ئازا و جەربەزەی پێشمەرگەی، لە لووتکەی هەموو چیا سەرکەشەکانی « کوردستان »ەوە، زۆر بێ باکانە، وەک هەڵۆ، تەلبەندی دڕکاویی هەموو سنوورە دەسکردەکان دەپچڕێنی، بە هەواڵە جەرگبڕەکانت، دڵی هەموو کوردپەروەران دادەخورپێنی، بە سەرکەوتنە مەزنەکانی پێشمەرگە گیان لە سەر دەسەکان، پتر وولاتپارێزان، بۆ کۆڕی خەبات و کوردایەتیی ڕاستەقینە جۆشدەدەی.

تۆ شەمەندەفەری باوەڕی کوردایەتیی و بیری پیرۆزی « کوردستانیزم »ی، لە دوورگەی ڕۆشنبیریی، بیر و فەلسەفەوە دێی، کاتێ، لە ئێسگەی هەر نێوچەیەکی کاولکراوی « کوردستان »ەکەتدا ڕادەوەستی، بە هەزاران کوڕوکاڵانی نەوەی نوێی کوردت، لێ خڕدەبێتەوە.

ئەی « Med TV »

دەبا، « هەواری ڕۆشنبیریی، وێژەیی و هونەریی » تۆ، بە هەزاران ڕۆشنبیری کورد، لە ئامێزبگرێ و لە هەواری ڕۆشنبیریی هەموو گەلانی دیکەش، گەرمتربێ.

دەبا، ئەستێرە وورشەدارەکەی « گەلاوێژ »ی تۆ، بە دەنگ، بە ڕەنگ، بە بیر، هەموو کونوقوژبنێکی « کوردستان »ە تاریکونووتکە کاولکراوە چۆڵوهۆڵە بندەسەکەمان ڕۆشنکاتەوە، پێش هەموو ئەستێرەکانی دیکەی ئاسمانی، پانوبەرینی داگیرکەرانی « کوردستان »یش بکەوێ.
دەبا، دەنگی ڕەوا و ڕەسەنی « بیلال »ی « کوردستانیزم »ی تۆ، دەنگی ئازادیی، ژیاندنەوە و یەکێتیی کوردی تۆ، دەنگی چل میلیۆن مرۆڤی چەوساوە و بێ دەوڵەتی تۆ، دڵ، دەروون، بیر و هۆشی هەموو کوردێ پاراوکا، هەموو ئەو دەنگە نزم و ناسازانەی دیکەی « تورکچێتیی، ئێرانچێتیی، عێراقچێتیی و سووریاچێتیی »ش، لە بیابانی کاکیبەکاکی گەرووی وشکیاندا بتاسێنێ.
ئازیزەکەم! با دەنگبێ، کێ بێ، دەنگی لە دەنگی بە سۆزی تۆ خۆشتربێ.
ئازیزەکەم! با ڕەنگبێ، کێ بێ، ڕەنگی لە ڕەنگی زەرد و سوور و سەوزی ئاڵای تۆ، جوانتربێ.

* * *

---

تێبینی:

1. ئەم پەخشانە، بۆ یادی ساڵڕۆژی دامەزراندنی « 15 .05 .1995 ــــ Medtv » نووسراوە و پێشکەش بە خۆشیان کراوە. بە داخەوە، « Medtv » بۆ ماوەیە داخرا. بەڵام، ڕۆژی « 14 .08. 1996 »، بۆ دووەمین جار، دەسی بە بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی خۆی کردەوە و کوێراییشی بە چاوی دوژمنەکانیدا هێنا. بەو هیوایەی ئەم جارە بۆ تاهەتایە، پرشنگی خۆری ئازادیی خۆی، لە هەموو ماڵە کوردێکدا پەخشکاتەوە و ڕۆژ بە ڕۆژیش، پتر بەرەو پێشکەوتن بڕوا. پاشان، لە گۆڤاری گزینگ، ژمارە 13، سوید، 1996 بڵاوکرایەوە.
2. هەموو ئەو ناوانە: « نەوبەهار، جەوانان، هەواری ڕۆشنبیریی، دەنگوباس، شیرۆڤە، ڕەوشی جیهان، هەقپەیڤین، دیرۆک و گەلاوێژ »، لەو سەردەمەدا، ناونیشانی بەرنامەکانی « Medtv » بوون.
3. بۆ نووسینی ئەم پەخشانە، کەلک لە بەرهەمی هۆنەران: « شێرکۆ بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، پیرەمێرد و نالیی » وەرگیراوە.
4. ئەم پەخشانە، لە سەردەمێکدا نووسراوە، « Medtv » لە هەموو جیهاندا، تاکە تێلێفیزیۆنی کوردیی بوو، تەنیا ترووسکاییەک بوو، ماڵیی هەموو کوردێکی نیشتمانپەروەر و دڵسۆزی ڕووناکدەکردەوە. لەبەرئەوە، هیچ پێوەندییەکی بە هەڵوێستی نووسەرەوە نییە، کە لەگەڵ « P.K.K. » بوویێ، یا نەبوویێ!

# بەهەشتی کـــــــــوردەواریی!

ڕۆژی « 04 .12 .2004 »، هەشتەمین فیستیڤاڵی « گەلاوێژ »، لە شارە گەشاوەکەی « سولەیمانیی » دەسیپێکرد و ڕۆژی « 10 »ی مانگ تەواوبوو. واتە: ماوەی یەک هەفتەی ڕێکی خایاند. منیش، یەکێ لەو دەیان میوانانە بووم، بانگهێشتکرابووم.
ئەز لێرەدا، قسەم لە سەر ئەوە نییە، لە ڕووەکانی بەڕێوەبردن، ئاستی وێژەیی و کاردانەوەی بەشداربووان، لە فیستیڤاڵەکە بدوێم و هەڵیسەنگێنم. بەڵکوو، ئەوەی زۆر لای من گرنگە، ئەوەیە: چەندین « خوێندەوار، ڕووناکبیر، هونەرمەند، نووسەر، هۆنەر، چیرۆکنووس و کۆڵەر »ی نەتەوەکەمان، لە زۆربەی زۆری شار و شارۆچکەکانی « باشووری کوردستان » بە تایبەتیی، « خۆرهەلات و خۆراوای کوردستان » بە گشتیی هاتبوون، لەوانە هەبوون، میوانبوون، هەشبوون، بە « هۆنراوە، چیرۆک و کۆڵینەوە »، بەشدارییان لە فیستیڤاڵەکەدا کردبوو.
بە کورتیی: لەم گوتارەدا دەمەوێ، لە ڕووی « کۆمەلایەتیی و نەتەوەیی »یەوە، باسی فیستیڤاڵەکە بکەم و لە کەڵکەکانی بدوێم. بە ڕاستیی، فیستیڤاڵەکە، وەک کۆبوونەوەیەکی نەتەوەیی کەلتووریی وابوو، خوێندەوار و ڕووناکبیران، پەیتاپەیتا، خۆیان بە یەکدی دەناساند، دەمەتەقێیاندەکرد، بیر و ڕایان دەگۆڕییەوە، ناونیشانیان لە یەکدی وەردەگرت و تێکەلاوییەکی زۆر باش، لە نێوانیاندا دروستبووبوو.

هەر لە یەکەمین ڕۆژدا بوو، کۆمەڵێ کوڕ و کیژی لاوی هێژای « ڕۆژهەڵاتی کوردستان »م ناسی. خۆشبەختانە، لە ڕێی بەرهەمەکانمەوە بە گشتیی و گوتارەکانی « Kurdistanpost »ەوە بە تایبەتیی، لە دوورەوە دەیانناسیم. هەروەها، منیش هێندێکیانم وەک ناو، هەر لە دوورەوە دەناسی، بێ ئەوەی، پێشتر هیچمان یەکدیمان دیبێ.
بەڵێ، ماوەی یەک هەفتە، هەموو ڕۆژێ: بەیانیان، پاش نیوەڕوان و ئێواران، تا دەرەنگ، پێکەوە بووین، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە گرفتێ ڕوویدا. هەموومان بە تەواویی، هۆگری یەکدی بووبووین. گەلێ یادگاری خۆش و شیرینمان، لە لاپەڕەکانی بیر و هۆشماندا تۆمارکرد. کاتێ فیستیڤاڵەکەش تەواوبوو، هەر کەسەی لە کوێوە هاتبوو، بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە. بەڵام، هێندێ لەو خوشک و برایانەی « ڕۆژهەڵات »، زۆر بە گەرمیی، داوایان لێ کردم، کاتێ لە « ئێران »ەوە دەگەڕێمەوە، سەریان لێ بدەم. منیش، دڵم نەشکاندن و بەڵێنم پێ دان، بەسەریانکەمەوە.
ئەوەبوو، ڕۆژی « 2004 .12 .20 »، شڕوشیتاڵم کۆکردەوە و بارگەم پێچایەوە، سواری ترۆمبێل بووم و گەڕامەوە. دەمەو نێوەڕۆیەکی درەنگ، لە شاری « سنە »ی خۆشەویست دابەزیم. هەر زوو، پێوەندییم بە یەکێ لەو دۆستە بەڕێز و ئازیزانەوە کرد. بەڵام، هەر هێندە، زەنگم بۆ لێدا، ئیدی وەک لە ئاسمانەوە بارییبێتم، پاش ماوەیەکی کەم، خۆی و کوڕە گەورەکەی، بە ترومبێلێکەوە پەیدابوون و لە بەردەممدا وەستان. دابەزین، یەکدیمان ماچ کرد، سواربووین و بەرەو ماڵ بەڕێکەوتین. بە ڕاستیی، ئەوەی ئەو خێزانە بەڕێزە، بۆ منیان کردووە، باوەڕ ناکەم، هیچ برایەکی دایک و باوکیی، یا، هیچ هاوڕێیەکی گیانیبەگیانییش، لە ژیانمدا بۆیان کردبم!
دوای ماوەیەکی کەم، نانی نیوەڕۆمان خوارد. ئینجا، بە ترومبێل، نێو شارەکەیان گێڕام، شوێنە گرنگ و خۆشەکانی شاریان پیشاندام. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و شایانی باسکردنبێ، بە چەن خاڵێ باسیدەکەم:
1. کاتێ ساڵی « 1974 »، لە هێزی « خەبات » پێشمەرگە بووم، بۆ یەکەمین جار، شاری « سنە »م دی. بەڵام، هیچ گومانی تێدا نییە، لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا، شارەکە، گۆڕانێکی چەندایەتیی و چۆنایەتیی گرنگی، بە خۆیەوە دیوە. زۆر گەورەبووە، ژمارەی دانیشتووانی زیادیکردووە، گەلێ خانووی گەورە و تەلاری بەرزی جوانی تێدا درووستکراوە، بە تەواویی گەشەیکردووە و وەک بووکی « ڕۆژهەڵاتی کوردستان »، ڕازاوەتەوە. جادەی پان و بەرین، پردی زۆری سەر زەویی و هەڵواسراوی پەڕینەوە، دارودرەختی سەر

گردەکان، بلواری خنجیلانە و ڕێکوپێک، هێندەی دیکە، دیمەنی شارەکەیان جوانترکردووە و سەرنجی ڕێبوار، بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن. بە تایبەتیی، بۆ یەکێکی وەک من، زۆر دلگیر و خۆشبوو، چونکە، لە زۆر ڕووەوە، لە شاری « سولەیمانیی » دەچوو و هەستم بە نامۆیی نەدەکرد، بە تایبەتییتریش، کاتێ بە چیای سەرکەشی « ئابیدەر »دا سەرکەوتین، لە سەر لووتکە بەرزەکەی گیرساینەوە، تەماشای شارمان کرد، یەکسەر، چیای « ئەزمڕ » و ئێوارانی « سولەیمانیی »م بیرکەوتەوە. چونکە، کۆمەڵێ چیای گەورە و گچکە، بەرز و نزم، دەوری هەر دوو شاریان داوە، دەشتێکی پان و بەرینیش، لە ئامێزیان گرتوون، بە ئارامیی، لە باوەشی پڕ لە نازییاندا ڕاکشاون، دەڵێی، خەویان لێ کەوتووە! لە دووریشەوە، گڵۆپەکانی شار دەبریسکانەوە و جریوەیان دەهات، ختووکە و خۆشییەکی تایبەتییان، بە گیانی شەکەتی بینەران دەدا. بەڵام، باشتر وایە، مرۆ دان بە ڕاستییدا بنێ و بڵێ: شاری « سنە »، گەلێ لە شاری « سولەیمانیی » خاوێنتر، ڕێکوپێکتر، شیرینتر و ڕازاوەترە. کەچیی، لە ڕووی جوڵەی هاتوچۆوە، تا بڵێی، بێ یاسایی پێوە دیارە، بە شێوەیە، هیچ جۆرە یاسا و ڕێسایەکی هاتوچۆ پێڕەو ناکرێ!
جاران، چیای « ئابیدەر »، جگە لە چەن درەخت و کانییەک، هیچی دیکەی لێ نەبوو. بەڵام ئێستە، تا سەر لووتکەکەی، جادەی پان و گەورەی قیرتاوکراوی بۆ ڕاکێشراوە، مرۆ زۆر بە ئاسانیی دەتوانێ، سەرکەوێ و هەر چوار دەوری شار ببینێ. زۆربەی زۆری چیاکەش، بە درەختی هەمەچەشنە ڕازاوەتەوە، گەلێ کیۆسک، چایخانە، ڕێستۆرانتی جوان و خاوێنی لێ کراوەتەوە. بە ڕاستیی، کاتێ لەو بەرزاییەوە، تەماشای شارم دەکرد، هێندە جوانبوو، هەر لە « بەهەشتی کوردەواریی » دەچوو، جوانییەکەی بە شێوەیە بوو، هێزی پێم نەبوو، بگەڕێمەوە و بەجێیبێڵم.
ئاخ! خۆزگەم هەموو کوردێ، توانای ئەوەی ببووایە، سەردانێکی ئەو شارە دێرینەی « کوردستان »ی بکردایە و چەن ڕۆژێکی تێدا بمایایەتەوە، تا، لە ئەفسوونی جوانیی شار، لە ڕووخۆشیی و میوانداریتیی دانیشتووانەکەشی، بێ بەش نەبووایە. خۆزگەم، لە ڕووی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییشەوە، ئازادیی تەواویان هەبووایە، ئینجا دەمزانی، پێتەختی خان و بەگەکانی دەوڵەتی « ئەردەلان »، چەن جوانتر و پێشکەوتووتر دەبوو!
2. ئەو ئێوارەیە، دوا ڕۆژی کەژی پاییز بوو. واتە: یەکەمین شەوی وەرزی زستان بوو. بەڵێ، ڕۆژی « 20 »ی مانگی هەموو ساڵێ، هەموو دانیشتووانی دەوڵەتی « ئێران » بە گشتیی، دانیشتووانی شاری « سنە » بە تایبەتیی،

کەژاوەی کەژی پاییزی پرچ زەرد بەڕێدەکەن، خۆیان ئامادەدەکەن، پێشوازیی لە بێشکەی ساردوسڕی، وەرزی زستانی پرچ سپی بکەن. بۆیە، لە سەرانسەری « ئێران »دا، ئەو شەوە، جێژن دەگێرن، بە زمانی فارسیی « شەوی یەلدا » و بە کوردییش، « شەوچلە »ی پێ دەڵێن. گوایە: یەکەمین ڕۆژی زستانە، بە درێژترین شەوی ساڵی « ئێران »یش دادەنرێ.
لەبەرئەوە، دەمەو ڕۆژاوابوون، شەقامەکانی شار جمەیاندێ، ڕێ بەر ڕێبوار ناکەوێ، کۆمەلانی خەلک، بە نێو بازاڕەکاندا دەگەڕێن، کەرەسەی پێوست بکرن و خۆیان بۆ ئەو شەوە ئامادەکەن. دوای ئەوەش، هەر سەر لە ئێوارە، هەموو دووکان و بازاڕەکان دادەخرێن، دەرگەی چایخانە و ڕێستۆرانتەکان دەبەسرێن. واتە: گەر ئەو شەوە، ڕێبوارێ ڕێی لەو شارە بکەوێ، بێ شێو سەردەنێتەوە. چونکە، هەموو خێزان و بنەماڵەکانی شار، لە ماڵی گەورەیەکیان کۆدەبنەوە، پێکەوە نان دەخۆن و جێژن دەکەن. وەک بیستم، فارسەکان زیاتر « پلاو » و کوردەکانیش « یاپراخ » لێدەنێن. دوای ئەوەی نانی ئێوارەش دەخۆن، ئیدی ئەو شەوە، بە قسەی خۆشەوە بەسەردەبەن، سەرگوزشتەی کۆن دەگێڕنەوە. چەرەس، شیرینیی و میوە دەخۆن، تا درەنگانێ پێکەوە دادەنیشن، بە خۆشیی و کامەرانیی ڕادەبوێرن. لێرە و لەوێش، لە ناکاو، گوێت لە دەنگی فیشەکەشێتە و دەمارقاچان دەبێ. ئەم کەلتوور و جێژنە گەورەیەشیان، لە سەردەمی پەیامبەر « زەردەشت » و ئیمپراتۆریای « میدیا »وە بۆ ماوەتەوە، پشتاوپشت پاراستوویانە، شانازیی پێوە دەکەن و زۆر بە پەرۆشیشەوە، ڕێزی لێ دەگرن و یادیدەکەنەوە!
3. هەر بەو بۆنەیەشەوە، خوێندکارانی وانەی کوردیی زانکۆی « ئازاد » لە شاری « سنە »، بە هەزار ناری عەلی، مۆڵەتیان لە لایەنە بەرپرسەکان وەرگرتبوو، تا، ئاهەنگێکی کوردانە سازکەن. ئەو دۆستە ئازیزانە، منیشیان بانگکرد و کۆڵێ گەورەیان کردم. ئاهەنگەکە، لە سەر شانۆی زانکۆ سازکرا و کاژێری « 30 .18 » بە کاتی « ئێران » دەسپێکرد. کاتێ لە دەرگەی هۆڵەکە نزیکبووینەوە، پۆلێ کوڕ و کیژی کورد، بە جلی کوردیی و دەم بە پێکەنینەوە، زۆر بە گەرمیی، بەرەو ڕوومان هاتن، پێشوازیی و خۆشهاتنیان لێ کردین، پێش خۆیان داین، لە ڕیزی پێشەوەی هۆڵەکە، جێیان بۆ ئامادەکردبووین و ئێمەش دانیشتین.
بە ڕاستیی، زۆر سەرم سووڕمابوو، نەمدەزانی، ئەوە خەوە یا ئەندێشەیە! ئاخر، من چی دەبینم؟!! چی دەبیستم؟!! تۆ بلێی، ئەو کۆبوونەوە « هونەریی و وێژەیی »یە گەورەیە، لەو شارە سوورەدا سازکرابێ؟!! تۆ بلێی، چەرخ و

دەوران گۆڕابێ، وا ڕۆڵەکانی کورد، بە ئاشکرا، خۆیان دەنوێنن؟!! ئاخر، چۆن سەرم سووڕ نەمێنێ، ئەو هۆڵە گەورەیە، بڕبڕبووبوو، یەک کورسیی بەتاڵ نەمابوو، تەنانەت خوێندکارەکان، لە سەر پلیکانەی نێوەڕاستی هۆڵەکە دانیشتبوون و لە قەراغ دیوارەکانیش، بە پێوە وەستابوون! جگە لە من و هێندێ میوانی دیکەش، زۆربەی هەرە زۆریان، چ نێر و چ مێ، جلی کوردیی ڕەنگاوڕەنگیان پۆشیبوو، ئەو هەموو کوڕە قنجە قیت و قۆزە، ئەو هەموو شەکرەکیژە کارمامزە نەرمە ناسکە جوان و نەشمیلانە، بە جلی کوردیی ڕەنگین و پشتێنی شۆڕەوە، دەهاتن و دەچوون، دەتگوت، لە هۆڵی پیشانگەی پۆشاکدا دانیشتووین و جوانترین خۆپیشاندەری پۆشاک، بە بەردەماندا دێن و دەچن. هەموویان بالابەرز، نێوقەد باریک، شلومل و چاوبەلەک، بە نیگای ئەفسووناوی چاو و زەردەخەنەی شیرینی سەر لێویان، بەندی دڵیان دەپساند و هەزاران پیری سەرسپی وەک منیشیان، گەنج دەکردەوە!
سەر شانۆکە، بە پرۆژێکتۆری ڕەنگاوڕەنگ و دیکۆری کوردەواریی جوان ڕازابۆوە، چەن جۆرە خواردەمەنیی و شەوچەرەیەکیش دانرابوو. ئاهەنگ دەسیپێکرد، خانمەکوردێکی بەڕێز و نەشمیلانە دانیشتبوو، بەرنامەکانی پێشکەشدەکرد، بەشداربووانی بە گشتیی و منی میوانیشی بە تایبەتیی، بەخێرهێنا. ئینجا، یەک لە دوای یەک، کوڕ و کیژە لاوەکان، بەرنامەی تایبەتیی خۆیان، لە « هۆنراوە، پەخشان و چیرۆک »، پێشکەش بە ئامادەبووان کرد. ناوبەناویش، تیپێکی موزیکی کوردیی، ئاهەنگێکی موزیک و گۆرانیی کوردییان بۆ دەگێڕاین و هێندەی دیکە، کۆڕەکەیان گەرمتردەکرد، تاووتینیان بە لاوەکان دەبەخشی. یا، کۆمەڵێ کوڕی لاو، هەموویان ڕانکوچۆغەیان لەبەردابوو، کڵاشی « هەورامیی »یان لەپێدابوو، لە سەر ئاوازی گۆرانیی فۆلکلۆری کوردیی، هەڵپەڕکێیەکی گەلێ جوان و ڕێکوپێکیان پێشەکەشدەکرد، بە قیژەوقریشکەیان، ئارەزووی ئامادەبووانیان دەجوڵاند. بە ڕاستیی، هێندە جوان هەڵدەپەڕین، هەر لە خۆیان دەهات و کەم هەڵپەڕکێی وا جوانم، لە « باشوور » دیبوو!
دوای هەموو چالاکییەکیش، هارەی چەپڵە و هاواری ئامادەبووان، هەموو کون و قوژبنێکی هۆڵەکەی پڕدەکرد، بە تایبەتیی کاتێ ناوی چەن زاراوەیەکی وەک: « شەهید » یا « کوردستان »، لە هۆنراوە و پەخشانەکاندا دەهات، ئیدی، لە بەر هاوار و قیژە، هۆڵەکە دەلەرییەوە و لە سنووری تێ دەپەڕاند.
هەرچەندە خوێندکارەکان، بە مەرجێ مۆڵەتی ئاهەنگەکەیان وەرگرتبوو، بە هیچ شێوەیە، ناوی « کوردستان، ئازادیی و سەربەخۆیی » نەبەن و

گۆرانییەکانی هونەرمەند « ناسری ڕەزازیی »ش نەڵێنەوە. کەچیی لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بەو شێوەیە، هاواریاندەکرد و دەیانقیژاند، هەر ئەوە نەبوو، بۆ « کوردستان »ە ئازیزەکەی خۆیان، شێت و هار نەبن، خێراخێراش، بە یەک دەنگ هاواریاندەکرد، « ڕەزازیی، ڕەزازیی، ڕەزازیی ». منیش، لەو کات و ساتانەدا، بیرم لەوە دەکردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: خوایە، ئەمە چ سەردەم و ویژدانێکە، ئازادیی لە مرۆ قەدەغەکرێ، تەنانەت نەیەڵن، ئەم لاوە کوردانە، بە ئارەزووی دڵی خۆیان، گۆرانییش بچڕن؟!!

بە ڕاستیی، کاتێ گوێم لە بەرهەمە جوانەکانیان بوو، وەک گوڵ گەشامەوە، تۆوی هیواکانم، لە ئینجانەی بیر و هۆشمدا، چەکەرەیکرد و گوتم: گەلێ ئەم ڕۆڵە ئازا و مەردانەی هەبێ، ئەم ڕۆڵە بە جەرگانەش، ئەو هۆنراوە پڕ لە جۆشوخرۆشانە بخوێننەوە، هەرگیز ناکرێ و نابێ، تا سەر، دەرگەی ئازادیی و سەربەخۆییان لێ داخرێ، هەر بەو شێوەیە بمێننەوە، مافە نەتەوەییەکانی خۆیان بە دەس نەهێنن! ئیدی، زۆر دڵم خۆشبوو، لە خۆشیاندا خەریکبوو، شاگەشکەدەبووم و بێ ئەوەی، ئاگام لە خۆم بێ، منیش وەک ئەوان، گەرم بووبووم، چەپڵەم لێدەدا و لە بەر خۆمەوە، بۆم دەسەندنەوە. بەڵام هەرچەندە، لە لایەکەوە، بستبست باڵامدەکرد. کەچیی، لە لایەکی دیکەشەوە، دڵم پڕبووبوو، بۆ باری نالەباری ئەو نەتەوە هەژارە بندەسە داگیر و دابەشکراوە، وەک مەنجەڵی سەر ئاگر قوڵپیدەدا، بیرم لەوە دەکردەوە و دەمگوت: ئاخر خوایە، تا کەی « **40** » میلیۆن کورد، بەو شێوەیە بژین و بچەوسێندرێنەوە؟!!

سەیر ئەوەبوو، خوێندکارەکان هێندە بەڕێز و خاوەن هەستی بەرزی کوردایەتیی خاوێن بوون، دەستەدەستە دەهاتن و خۆشهاتنیان لێ دەکردم، وێنەیان لەگەڵ دەگرتم و چەندین جار پێیان دەگوتم: ئاهەنگەکەت ڕازاندەوە، مایەی شانازییمانە، کوردێکی « باشوور »، بەشداریی جێژنەکەمان دەکا! بەڵێ، ئەوە یەکەمین جاربوو، بە چاوی خۆم و لە نزیکەوە، ئاهەنگێکی وا جوان و ڕێکوپێک، لە پارچەیەکی دیکەی دڵمدا ببینم، ئەوە یەکەمین جاربوو، لە نزیکەوە، ئەو هەستە نەتەوەییە خاوێنە، ئەو هۆشە گڕگرتووەی کوڕوکاڵانی « ڕۆژهەڵات »، هەست پێ بکەم، گوێم لەو چەن ووشە بەرز و پڕ واتایانە بێ، ئیدی، ناهەقمە، گەر شاگەشکەشبم؟!!

پاشان، چەن شێرەکوڕ و شەکرەکیژێکی خوێندکار، شیرینییان گێڕا، وردەوردەش، ئاهەنگەکە، بەرەو کۆتایی دەڕۆی، تا، کاژێری « **10** »ی شەو، خانمە بەڕێزە ئاهەنگێڕەکەی سەر شانۆ، سوپاسی هەموو لایەکی کرد و کۆتایی ئاهەنگەکەی ڕاگەیاند. پێش ئەوەی، بڵاوەشی لێ بکەین، پۆلپۆل

خوێندکاران هاتن و له نزیکەوە، جارێکی دیکە، خۆشهاتنیان لێ کردم، تێکەڵبووین و بە دەم قسەکردنەوە، هێندێ باری سەرنجمان گۆڕییەوە و چەن وێنەیەکیشمان، بۆ یادگار گرت. پاشان، بڵاوەمان لێ کرد و ئێمە گەڕاینەوە.
ئەو شەوە، لە ماڵی باوکی خانەخوێکەمەوە، خواردن کرابوو، خوان بە چەندین جۆر « سەوزە، سەلاتە، ترشیات، میوە، ماست، یاپراخی سلق و کەلەرم » ڕازابۆوە، خواردنێکی کوردانەی بە تام و چێژیان ئامادەکردبوو. تا درەنگانێکیش دانیشتین، قسە و باسی خۆشمان دەگێڕایەوە.
**4**. ڕۆژی دوایی، بەرچاییمان خوارد و کاژێری « **10** » دەرپەڕین. یەکەمین جار، سەرمان لە ماڵی « ئاسەفی گەورە » دا. ئەم ماڵە، بە یەکێ لە ماڵە گەورەکانی بنەماڵەی خانەکانی « ئەردەلان » دادەنرێ. لە دوو بەشی جیاواز پێکهاتووە: بەشی سەرەوەی، نزیکەی « **250 - 300** » ساڵ و بەشی خوارەوەشی، نزیکەی « **105 - 110** » ساڵ لەمەوبەر دەبێ، دروستکراون. ئێستە، ماڵەکە وەک ئاسەواری کۆن پارێزراوە، خەڵکی شار و توریست، سەردانیدەکەن. منیش، بە هەلم زانی و ئەو دەرفەتەم لە کیس خۆم نەدا، بلیتمان بڕی و خۆمان پێدا کرد. هەر چووینە ژوورەوە، پەیکەرێکی نیوەی هۆنەری گەورەی کورد « مەولەویی تاوگۆزیی »، بەرانبەرمان دانرابوو، بە ڕیش و سمێڵێکی درێژی سپییەوە، بە کڵاو و مێزەرێکی کوردانەوە، پێشوازیی لێ کردین، چاوە بەردینەکانیشی، لە چاومان چەقاندبوو. کاتێ لێی نیزکبوومەوە، بە فارسیی نووسرابوو: « مولوی کرد »، لە تەنیشتیشیەوە، کورتەیەکی ژیان و ناوی بەرهەمەکانی ڕیزکرابوون.
پاشان ڕەتبووین و ڕۆیشتین. هەموو حەوشە و حەوز، دالان و هەیوان، ژووربەژووری ماڵەکمان پشکنی. هەموو دیوار و شوێنەکانیش، بە چەندین « تابلۆی جوان، پەیکەری نایاب، دیمەنی دڵفڕێن، وێنەی پیاوە گەورەکانی کورد، نووسینی مێژوویی، نەخش و نیگار »ی کەم وێنە ڕازابوونەوە. بە ڕاستیی، هەر سەرم لەوە سووڕمابوو، ئەوەی لە مێژووی ئەو شارە، بابەتی کەلتوور و فۆلکلۆری کوردیی دیم، هەر ئەو جۆرە شتانەبوون، کاتی خۆی، لە « سکانسن »ی شارە ڕازاوەکەی « ستۆکهۆڵم » لە « سوید » دیبووم، بە تایبەتیی، « ژووری مەلا، شاگرد، خوێندن، میوان، موبەق، نانکردن، نانخواردن، جلشتن، کۆبوونەوەی خەڵک لەگەڵ دەمڕاستی خاندا، پۆشاکی شارە جیاوازەکانی کوردستان، دارتاشیی، ئاسنگەریی، مسگەریی، ناڵبەندیی، کورتاندروون، وێنەی سەردارانی کورد و گەلێ شتی فۆلکلۆریی جوانی دیکە »، هەموویان بە مانیکانی جوان، جل و بەرگی کوردیی

جۆراوجۆر و ڕازاوەوە دروستکرابوون. جگە لەوەی، ژوورێکی گەورەشیان، بۆ هونەرمەند و کارمەندەکان تەرخانکردبوو، بە شێوەیەکی بەردەوام، کاریان لە ماڵەکەدا دەکرد و بابەتی فۆلکلۆریی نوێیان دروستدەکرد.
سەیر ئەوبوو، یەکێ لە نەوەکانی « ئاسەفی گەورە »، خۆی لەوێ کاریدەکرد، پیاوێکی کورتەباڵای لاواز بوو، قژ و ڕیشێکی سپی جوانی درێژی هێشتبۆوە، چاوەکانی بە قووڵا چووبوون، غەمێکی زۆری تێدا بەدیدەکرا، لە پشت کورسیی و مێزێکی کۆنەوە دانیشتبوو، شتی دەنووسی. کاتێ لێی نزیکبوومەوە و هێندێ پرسیارم لێ کرد، یەکسەر گوتی: خەڵکی کوێی؟
گوتم: « سولەیمانیی ».
ئیدی، وازی لە نووسین هێنا، بە درێژیی، مێژووی ئەو ماڵە و بنەماڵەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە. ئاخر، پتر سەرم لەوە سووڕمابوو، لەو سەردەمەدا، چۆن بەو شێوە جوانە زانستانە و ئەندازیارانەیە، ئەو هەموو کۆشک و سەرایە، حەوز و ئاوە، گەرماو و ئاودەسە خاوێن و ڕێکوپێکانەیان دروستکردووە؟!!
هەڵبەتە، کوردیش وەک نەتەوەیەک، مێژوویەکی پرشنگدار و پڕ لە شارستانیی خۆی هەیە، بۆیە، پاشا و سەردارەکانی کورد، بەو شێوەیە ژیاون! کەواتە: مایەی ئەوەیە، شانازیی بە نەتەوەکەمانەوە بکەین!
دوای گەشتێکی « **40** » خولەکیی، کۆتاییمان بە سەردانەکە هێنا. پاشان، سەردانی مزگەوتێکی کۆنی شارمان کرد، کە خۆیان بە « جامع » ناویدەبەن.
ئەم مزگەوتە، ساڵی « **1227** » کۆچیی دروستکراوە، واتە: نزیکەی « **200** » ساڵ دەبێ، هەیە و ئێستەش، پایە و دیوارەکانی هەر بە پێوە وەستاون و بەرگرییدەکەن، ئێستەش، نوێژی ڕۆژی هەینیی لێ دەکرێ. بەڵام، بە داخەوە، سەردانی ماڵی « مەستوورە خانمی کوردستانیی »، مۆزێی شار و قەڵا بەرزەکەمان نەکرد. چونکە، هێندێکیان داخرابوون، هێندێکی دیکەشیان، سوپای تێدابوو، قەدەغەبوو، لێی نزیککەوینەوە! جگە لەوەی، درەنگیشبووبوو، دەبووایە، هێندێ دیارییم بکڕیایەوە و بەرەو ماڵ بگەڕاینایەتەوە، تا خۆم ئامادەکەم و کاژێری « **22.00** »، بەرەو « تاران » بەڕێکەوم.
خودا یاربێ، لە دەمێکی دیکەدا، سەردانێکی دیکەی ئەو شارە شیرینە دەکەم، هەموو شوێنە مێژوویی و یادگارە دێرینەکانی « ئەردەلان » بەسەردەکەمەوە، تا ئاسەواریی مێژوویی دێرینی ئەو شارە، لە نزیکەوە ببینم، وەک کوردێکی نیشتمانپەروەر، زاخاوی چاوەکانمی پێ بدەمەوە، دڵ و دەروونە کەیلەکەشمی پێ بگەشێنمەوە!*

ستۆکهۆڵم
**2004. 12. 30**

تێبینی:

رۆژی « 2005. 01. 12 »، جارێکی دیکە، بۆ ھەڵبژاردن، سەردانی « کوردستان »م کردەوە. بە داخەوە نەمتوانی، لە « سنە » لادەم، بەڵکوو، یەکسەر لە « مەریوان » دابەزیم.
بەڵام، کاتێ رۆژی « 02.08 » گەڕامەوە، پاش نیوەڕۆی ھەمان رۆژ، کاژێری « 14. 00 » گەیشتمە شاری « سنە » و چاوم بە بینینی دۆستە ئازیزەکانم رۆشنبۆوە. پێشتر، چەن جارێ تێلێفۆنم بۆ کردبوون. لەبەرئەوە، ھەر چاوەڕێیاندەکردم. دوای ئەوەی، نانی نیوەڕۆمان خوارد، سەردانێکی پەرتووکخانەی گشتیی شارمان کرد. لە نهۆمی چوارەم، کۆبوونەوەی « ئەنجوومەنی ئەدیبانی کوردستان » ھەبوو. منیشیان بانگردبوو. دەمی ئێوارە و کاژێری « 18.00 » بوو، ماوەیە، گوێم لە ھێندێ نووسەر و ھۆنەر گرت، بەرھەمەکانی خۆیان خوێندەوە. پاشان، لەناکاو، داوایان لێ کردم، دەربارەی بەرھەمەکانی خۆم و پرۆسەی ھەڵبژاردن لە « کوردستان »، بەشداریی لە کۆڕێکی پرسیار و وەڵامدا بکەم. منیش، بە خۆشییەوە پەسەندمکرد. کۆڕەکە، ماوەی دوو کاژێری تەواوی خایاند، دەمەتەقێیەکی تێروتەسەلمان، لە سەر رەوشی کورد کرد.
پاشان، شیرینیی بەخشرایەوە و لە نزیکەوە، لەگەڵ ئەو خۆشک و برایانەدا، یەکدیمان ناسی.
ئێوارە، لە ماڵی خانەخوێکەم، کۆمەڵێ نووسەر و رۆژنامەنووس بانگرابوون، لەوانە: ھەر دوو سەرنووسەری رۆژنامەی « ئاسۆ » و « سیروان »، کاک « ئەحمەدی محەمەدیی » وەرگێڕ ئامادەبوون. کاک « محەمەد »، باوکی خانەخوێکەمە. تا ئێستە، دە پەرتووکی لە کوردییەوە، بۆ سەر زمانی فارسیی وەرگێڕاوە. لەوانە: « چیم دی »، مێژووی ژیانی « شێخ مەحموود، قازی محەمەد و مەلا مستەفای بارزانیی ». بە رێککەوت کاک « حەمە ئەمین پێنجوینیی »ش لە « سنە » بوو. ئەویش زانیبووی، من لەو ماڵەم، ھاتبوو. خواردنێکی زۆر ئامادەکرابوو. دوای نانخواردنیش، دەمەتەقێ گەرمبوو. بەڵام بە داخەوە، ئەو شەوە نەمتوانی، زۆر بمێنمەوە، چونکە دەبووایە، کاژێری « 22. 00 »، سواری ترۆمبێل بم و بەرەو « تاران » بەڕێکەوم.
ئەوە دووەمین جاربوو، لە نزیکەوە، لەگەڵ ھێندێ لە کوردپەروەرانی پارچەیەکی دیکەی نیشتمانەکەمدا دانیشم، دید و بۆچوون ئاڵوگۆڕکەین. ئاخر، خەڵکی ئەو شارە تێکۆشەرە، ئاگردەکەنەوە و زۆر بۆ کێشە رەواکەی خۆیان بە پەرۆشن.
بڕیار وایە، زانکۆی « کوردستان » بە فەرمیی، بانگهێشتتم بۆ بنێرن، چەن رۆژێ لایان میوان بم، چەن کۆڕێکی وێژەیی و زمانەوانیی، بۆ خوێندکارانی کورد بگرم.
# لە راستییدا نەمویست، ناوی ھیچ دۆست و برایەکی کوردی ئەو شارە بێنم، بەڵکوو، ھەر ویستم،، بە شێوەیەکی گشتیی، دەربارەی ئەو شارە شیرینە قارەمانەی « کوردستان »، شتێ بنووسم. تا ئەو کوردانەی، لە نزیکەوە نەیاندیوە، ھەم لە دوورەوە، شتێکیان گوێ لێ بێ، ھەم ھانیانبدەم، سەردانێکی ئەو بەشەی « کوردستان »یش بکەن.

* * *

# گەنجینەی زێڕ

هەموو مرۆڤێ، گەنجینەیەکی پڕ لە خشڵی جوانی گەوهەر و مرواریی، زێڕ و زیو، لە نێو شانەکانی بیر و هۆشیدا شاردراوەتەوە. بەڵام، گرنگ ئەوەیە، مرۆڤی ژیر و بلیمەت، لە خودی خۆی وردبێتەوە، خۆی باشتر بناسێ و لە کاتی پێویستدا، ئەو گەنجینە پڕ بایەخە بدۆزێتەوە!
هەڵبەتە، جوانیی و ڕێکوپێکیی ئەندامەکانی جەستەی مرۆ، تاهەتایە، بۆ کەس نامێنێ. ئاخر، جوانترین لەشولار و ڕوخسار، وەک گوڵێکی گەشی جوانی تەڕی بۆنخۆشی بەهار وایە، هەر دەبێ، ڕۆژێ لە ڕۆژان، یەک لە دوای یەک، پەڕەکانی هەڵوەرێ و ڕووتوقووتبێتەوە. بەڵام، ئەوەی دەمێنێتەوە، تەنیا هەر ئەو تۆوەیە، کە لە هەناوی خۆیدا حەشاریداوە و لە دوارۆژدا، ژیانێکی دیکەی نوێی پێ دەبەخشێتەوە و سەرلەنوێ زیندوودەبێتەوە. بۆیە، ئەو گەنجینە شاراوەیەی، کەم یا زۆر، هەموو مرۆڤێ هەیەتی، گەلێ لە جوانیی ڕووەکانی دیوی دەرەوەی مرۆ جوانتر و گرنگترە، لە ڕاستییشدا، هەر ئەوەشی بۆ دەمێنێتەوە!
بەڵام وەنەبێ، هەموو کەسێ بتوانێ، پەی بەو گەنجینە پڕ لە زێڕ و زیوە بەرێ، بەڵکوو، هێندێ کەس هەن، دوای ماوەیەکی زۆر، بۆیان دەردەکەوێ و دەیدۆزنەوە. کەچیی، هێندێکی دیکەش هەن، خۆیان هەستی پێ ناکەن و دەبێ، کەسێکی دیکە هەبێ، یارمەتییانبدا و سەرنجیان، بۆ لای ئەو گەنجینە پڕ بایەخە ڕاکێشێ! چونکە، ئەو سامانە بێ هاوتایەی، خوای گەورە بە مرۆی بەخشیوە، لە شێوەی بەهرەی جیاجیادا دەردەکەوێ.

بۆ نموونە: هێندێ مرۆ هەن، بەهرەی هونەریی بەرزیان تێدا بەدیدەکرێ و بە ڕاستیی، هونەرمەندێکی بلیمەتن، جا گەر دەنگخۆشبن و گۆرانیی بچڕن، یا، موزیکژەنبن و ئاوازدانێن، یا، توانای نواندنیان هەبێ و کاری نواندن بکەن، یا، دەسوپەنجەیەکی زێڕینیان هەبێ و وێنەکێشبن، یا، پەیکەرتاشبن و پەیکەری جوان درووستکەن ... هەموویان وەک یەک، خاوەن بەهرەن و هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ.

هێندێ مرۆی دیکە هەن، مێشکیان گەورەتر و فراوانترە، وەک زانایەک بیر دەکەنەوە و ڕەفتاردەکەن. ئەمانەش، لە نموونەی هەرە بەرزیاندا، هەموو ئەو زانا ناودارانە دەگرێتەوە، کە بە داهێنانی بەرز و دەگمەنیان، ڕاژەیەکی گەلێ گەورەی کۆمەڵگەی مرۆیان کردووە و مێژووش، هەرگیز ناتوانێ، لە یادیانکا و لە ئاستیاندا، چاوبنووقێنێ. ئاخر کێ بێ، ناوی چەن زانایەکی گەورەی وەک: « گالیلۆ، ئەدیسۆن، نیوتن، ئەرخەمیدس، فیساغۆرس، ئەنیشتاین ... »ی نەبیستبێ؟!!

جگە لەوەی، هێندێ نووسەر، هۆنەر و ئەکادیمیکیش هەن، هەر یەکەیان، لە بوارێکی جیاجیا و دیارییکراودا کاردەکەن و دەسڕەنگینیی خۆیان دەنوێنن. ئاخر، زانا و نووسەرێکی گەورەی عەرەبی وەک: دوکتۆر « تەها حوسێن »، نابیناشبوو، کەچیی، کەم نووسەر هەبوو، شان لە شانی بدا. هەروەها، نووسەرێکی نابینای وەک: دوکتۆر « کامیل حەسەن بەسیر »یش، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە، ئەو زیرەکیی و توانا گەورەیەی تێدا بەدیکراوە و بلیمەتێکی کورد بوو، لە یەکێکی وەک « تەها حوسێن »یش کەمتر نەبوو!

یا، هێندێ لەو کەمئەندامانەی لە وڵاتە دیمۆکراسییخوازەکانی جیهاندا دەژین، ئەوانەی مێشکیان کاردەکا، گەلێ مرۆڤی ژیر، زیرەک، لێهاتوو و وریایان تێدا هەڵکەوتووە!

بەڵام، گرنگ ئەوەیە، مرۆ هەوڵبدا، خۆی چاک بناسێ، تا بزانێ، ئەو گەنجینە شاراوەیەی یەزدان پێی بەخشیوە، لە چ ئاست و بوارێک دایە؟ کەی پێویستە، سەری هەڵداتەوە و کەڵکی لێ وەرگرێ؟ چۆن ڕێز لە خۆی و گەنجینە زێڕینەکەی بگرێ؟ لەو ڕێیەشەوە، ڕاژەی کۆمەڵگەکەی خۆی بە تایبەتیی و کۆمەڵگەی مرۆ بە گشتیی بکا!

جا گەر، هەر خاوەن بەهرەیەکی باش، ئەو گەنجینە خۆڕسکیی و پڕ بایەخەی دۆزییەوە، بە شێوەیەکی باش بەکاریهێنا، ئەوا، نەک هەر خۆی پێ گەورە دەبێ و ناودەردەکا، بەڵکوو، جگە لەوەی کۆمەڵەکەی کەڵکی لێ دەبینێ، پێی بەرزدەبێتەوە، پتریش پێشدەکەوێ و دەناسرێ.

تۆ بڵێی، ڕۆڵەکانی نەتەوەی عەرەب، ڕۆژێ لە ڕۆژان بتوانن، « حەوت هەڵواسراوە » بە ناوبانگەکانی سەر دیوارەکانی « کەعبە » بە تایبەتیی و هەموو هۆنەرانی دیکەی سەردەمی نەزانینیان بە گشتیی لە بیرچێ؟!!
ئاخر، ڕۆڵەکانی نەتەوەی « فارس »، تا، تاکە یەک مرۆڤیان لە ژیاندا مابێ، هەر دەبێ، سوپاسی چەن نووسەرێکی بلیمەتی وەک: « سەعدیی شیرازیی، حافزی شیرازیی، خەیام و فیردۆسیی » بکەن. چونکە، گیانێکی نوێیان، بە بەر زمان و وێژەی فارسییدا کرد و بە گەلانی جیهانیشیان ناساند.
ڕۆڵەکانی نەتەوەی « ئینگلیز » دەبێ، شانازیی بە نووسەرێکی گەورەی بلیمەتی وەک: « شێکسپیر »ەوە بکەن.
هەروەها، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کوردیش تاماون، هەر دەبێ، شانازیی بە مێژوونووسێکی گەورەی ناوداری وەک: « شەرەفخانی بەدلیسیی » و هۆنەرێکی نەتەوەیی مەزنی وەک: « ئەحمەدی خانیی »یەوە بکەن!
لە کۆتاییشدا، هەر هێندە دەڵێم: خۆزگەم، خاوەن بەهرەکانی کورد بە گشتیی و هۆنەرەکانی بە تایبەتیی، ڕێزی خۆیان و ئەو گەنجینەیەی نێو هەناوی خۆیان بگرتایە، گەوهەری هونەر و ووشەیان، بە نرخی تەماتە نەفرۆشتایە!

ستۆکهۆلم
2005. 03. 03

* * *

# هونەر و هونەرمەند

«1»

ئەز پێم وایە، هەر کەسێ، ڕێز لە زمانە زکماکەکەی خۆی نەگرێ، ڕێز لە خۆشی ناگرێ! هەر شارێ، واز لە زمانە خۆرسکەکەی خۆی بێنێ، واز لە گیانی خۆشی دێنێ! هەر گەل و نەتەوەیەکیش، زمانەکەی خۆی لەبیرکا، وەک ئەوە وایە، پێناسەی ئیتنیکیی و جوگرافیایی خۆی بسڕێتەوە!

تا ئێستە، چەندین جار، چەندین شار و وولات گەڕاوم، لە هیچ شار و وولاتێکدا نەمدیوە، جگە لە گۆرانیی بە زمانەکەی خۆیان، بە هیچ زمانێکی دیکە، گۆرانیی لێبدەن و بلاوکەنەوە. لە گازینۆ و چایخانەکان، هەر بە زمانە زکماکەکەی خۆیان، گۆرانیی لێدەدەن. هەموو ڕادیۆ و تێلێفیزیۆنەکانیشیان، هەر بە زمانە نەتەوەییەکەی خۆیان دەدوێن، گۆرانیی دەڵێن و بەرنامەکانیان پیشاندەدەن. مەگەر لە هەفتەیەک، یا مانگی جارێکدا، بەرنامەی گۆرانیی بیانییان هەبێ!

کەچیی، گەر باسی « کوردستان »ی مەزن نەکەم، تەنیا هەر، باسی بەشەکەی « باشوور » بکەم، چونکە، ئەوڕۆ ئازادە و کورد دەتوانێ، بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوتبکا، هەر شارێکی « باشوور » بگرین، لە هەموو شوێنێ، بە هەموو زمانێکی بیانیی، پتر گوێت لە گۆرانیی دەبێ، وەک لەوەی، بە زمانی کوردیی، گوێت لە گۆرانییەک بێ! کەم چایخانە، دوکان، تۆمارگە، یانە و ڕێستۆرانت هەیە، گۆرانیی بیانیی لێ نەدەن!

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە، سەر لە ئێوارەی ڕۆژی « 29 .06 .2004 »، بەرنامەی « ئاوێنە »، بۆ دەنگی ژنان تەرخانکرابوو، یەکێ لەو کیژە کوردە نەشمیلە نازدارانە، ناوی « ئەڤین » بوو، هەرچەندە، بە کوردیی گۆرانیی چڕی و دەنگێکی خۆشی هەبوو، کەچیی، زۆر بە ڕاشکاویی گوتی: گۆرانیی کوردیی خۆشە، بەڵام، وەک گۆرانیی « توورکیی » نییە. من لە منداڵییەوە، حەزم لە گۆرانیی « توورکیی »یە! هەی داد و بێ داد، ئەم بیانییپەرستیی و لاوازیی هۆشی نەتەوەیییەی ڕۆڵەکانی کورد، چییە؟!! لە چییەوە هاتووە؟!! تا کەی بەردەوامدەبێ؟!! کەی کۆتاییدێ؟!!

سەیر ئەوەیە، هێندێ هونەرمەندی گۆرانیبێژی کورد هەن، بە چەن زمانێکی جیاواز، گۆرانیی دەچڕن. بۆ نموونە: گۆرانیبێژێکی وەک « کاروان کامیل »، بەرهەمێکی نوێی بڵاوکردۆتەوە، بە هەر سێ زمانی « کوردیی، عەرەبیی و توورکیی »، گۆرانیی چڕیوە و زۆر شانازییشی پێوە دەکا! ئاخر، بەو شێوەیە بێ، ئەو بەرهەمە، بە بەرهەمێکی کوردیی دانانرێ. چونکە، نە هەمووی بە زمانی کوردیی، نە هەمووی بە زمانی عەرەبیی و نە هەموویشی بە زمانی توورکیی گوتراوە، بەڵکوو، وەک « زەلاتەی هونەریی » وایە. بۆیە، بە بەرهەمێکی تێکەڵاو دەژمێررێ!

هەروەها « دیلان »، بە زمانی کوردیی و بیانیی گۆرانیی دەچڕێ، ئەو جۆرە بەرهەمانەش، لە سەر گۆرانیی کوردیی حسێب ناکرێن!

زۆربەی هونەرمەندە گۆرانیبێژە لاوەکانیشمان، لە ئاوازی کوردیی ڕەسەن دوورکەوتوونەتەوە، لاساییەکی بێ تامی، هونەرمەندە گۆرانیبێژەکانی گەلانی « خۆرهەڵاتی نێوەڕاست » دەکەنەوە، ئاوازی « فارسیی، توورکیی، عەرەبیی، ئازەریی، هیندیی ... » وەردەگرن، هۆنراوەیەکی کوردیی گونجاوی بۆ دەدۆزنەوە، بە ئامێری موزیکی جۆراوجۆر، دەیڕازێننەوە و بە دەنگی خۆیان دەیڵێن، گوایە: گۆرانیی کوردیی دەچڕن! بەڵێ، هەموو گەلانی جیهان بۆیان هەیە، کەڵک لە موزیک و ئاوازی یەکدی وەرگرن و کەڵکیشیان لە یەکدی وەگرتووە، بەڵام، نەک وەک کورد، کوتومت بیاندزن!

ئاخر، هەر کەسێ، چەن ئاوازێکی دانا، یا، چەن گۆرانییەکی چڕی، یا، ئامێرێکی موزیکی ژەن، مەرج نییە، هونەرمەندێکی ڕاستەقینەبێ! بۆیە دەبێ، لە خۆمان بپرسین: بۆچی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، چەن هونەرمەندێکی وەک: « دەروێش عەبدوڵڵا، مەلا کەریم، ڕەشۆل، عەلی مەردان، تایەر تۆفیق، ساڵح دیلان، رەفیق چالاک، سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانیی، حەسەن زیرەک، محەمەدی ماملێ، مەزهەری خالقیی... » پتر و باشتر دەناسن؟!! بە هیچ شێوەیەکیش ناتوانن، لە یادیانکەن، بەڵکوو، کەڵک لە شێوازی هونەریی و بەرهەمەکانیشیان وەردەگرن!

جگە لەوەی، کاتێ ڕژێمی « بەعس »ی فاشیست ڕوخا و دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، لەبەریەک هەڵوەشایەوە، خاتوو « شاناز برایم ئەحمەد »، بە زمانی عەرەبیی، هۆنراوەیەکی بۆ ئەو دەوڵەتە داگیرکەرە هۆنییەوە، ئاوازێکی گەلێ دڵگیر و خۆشیشی بۆ دانا، ماوەیەکی زۆر، ڕۆژانە چەندین جار، لە تێلیڤیزیۆنی « **Kurdsat** »ەوە، بەو پەڕی شانازییەوە لێیاندەدا، وەک ئەوەی، ڕۆڵەکانی گەلی کورد، هیچ گرفتێکی دیکەیان نەبێ، تەنیا هەر، خەمی

خاک و دەوڵەتی « عێراق »ی داگیرکەریان هەبێ! ئەو « عێراق »ەی، ئەوەتەی درووستبووە، کورد وەک هاونیشتمانیی پلە هیچ تەماشادەکا! *

«2»

هەموو گەلێکی سەربەخۆ و سەربەست، پێگەیشتوو و تێگەیشتوو، ئەکتەرەکانی، بە زمانە خواکردەکەی خۆیان، فیلم و شانۆگەریی پێشکەش دەکەن. کەچیی، ئەوەتەی ڕژێمی « بەعس » ڕوخاوە، ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە « باشوور »، پلەی گەرمای تەرمۆمەتری بیانییپەرستیی و خۆبەسووکزانینیان بەرزبۆتەوە، لەبری هەستی « کوردایەتیی » ڕاستەقینە و خۆبەکوردزانین، هەستی « عێراقچێتیی » گاڵتەقینەیان، برەوی پەیداکردووە. لەبەرئەوە دەبینین: هێندێ ئەکتەری کورد هەن، لەبری ئەوەی، لە تیپێکی کوردییدا کار بکەن، بە زمانی کوردیی بدوێن، لەگەڵ هێندێ لە هونەرمەندانی عەرەبی « عێراق »دا، لە شانۆدا کاردەکەن و بە زمانی عەرەبیی دەدوێن!

هەرچەندە، هونەرمەندانی تیپی شانۆی « کەشکۆڵ »، لە کارە هونەرییەکانیاندا بە گشتیی و لە « بەرنامەی بەرنامە »دا بە تایبەتیی، گەلێ بابەتی جوان و ناوەڕۆک دەوڵەمەندیان، پێشکەش بە بینەرانی کورد کردووە، ڕەخنەی بەجێ و ڕێکوپێکیان، لە لێپرسراوانی پارت و میریی گرتووە، هەڵە و کەموکوڕییەکانیان، بە شێوەیەکی زۆر گاڵتەجاڕانە و پێکەنیناویی دەسنیشانکردووە، بەرنامەکانی خۆیان، زۆر بە باشیی و جوانیی ڕازاندۆتەوە، بیرەکەی خۆیان، زۆر بە ئاسانیی و ڕاشکاویی، بە جەماوەری کورد گەیاندووە، کۆمەڵانی خەڵکیش، زۆریان پێ خۆشە و هەمیشە، چاوەڕێی بەرنامەکانیان دەکەن. بەڵام، ئەوانە هەموویان لە لایەک بوەستن و ئەوەی منی زۆر نیگەران کردووە، ئەوەیە: داخم ناچێ، بۆ ئەو زمانە تێکەڵاوە « کوردیی ــ عەرەبیی »یەی پێی دەدوێن! چونکە، بە کوردیی پەتیی نادوێن. بەڵکوو، بە کوردییەکی تێکەڵ بە ووشەی نامۆی عەرەبیی ئاخافتندەکەن و بەو زمانە تێکەڵاوە دەدوێن، کە « 70 » ساڵ لەمەوبەر، « ئەمین زەکی بەگ »، مێژووی « کورد و کوردستان »ەکەی پێ نووسیوەتەوە! لە کاتێکدا، لە مێژە، زمانی وێژەی کوردیی، لە خڵتە و ووشەی بیانیی بژارکراوە و خاوێنکراوەتەوە!

ئاخر، لەبری ئەوەی، منداڵانی کورد، فێری زمانی کوردیی، ووشەی پەتیی و پوختی کوردییان بکەن، پتر فێری زمانی عەرەبیی و ووشەی بیانییان دەکەن! ئاخر، خۆ شانۆ تەنیا هەر، نێوەڕۆک و پێکەنین نییە، بەڵکوو، لە هەموو ڕوویەکەوە، قوتابخانەی گەلە و دەبێ، گەورە و گچکەی گەلێکی داریییکراویش، فێری زمانی شیرینی دایک بکا! تۆ بڵێی، نووسینەکانی

« شێکسپیر، مۆلێر، ..... »، هیچ جۆرە ڕۆڵێکی گرنگیان، لە گەشەکردنی زمانی نەتەوەیی خۆیاندا نەبووبێ؟!! جگەرگۆشەکانیان، فێری زمانێکی پوخت و ڕەسەنی نەتەوەیی نەکردبێ؟!!
جا، ئەو هونەرمەندە کوردانە ئازادن، بە چ زمانێ دەدوێن، لە چ جێیە کاردەکەن و لەگەڵ هونەرمەندانی سەر بە کام گەل هاوکارییدەکەن. بەڵام، خۆ پارتی « بەعس »ی فاشست و « سەددام حوسێن »ی دیکتاتۆریش، هەر ئەوەیان دەویست، نەک هەر هونەرمەندانی کورد، بەڵکوو، هەموو ڕۆڵەکانی کورد، هەر بە عەرەبیی بدوێن، بە عەرەبیی بیربکەنەوە، بە عەرەبیی گۆرانیی بچڕن، بە عەرەبیی شانۆگەریی پێشکەشکەن، لەبری ئەوەی، بایەخ بە زمانەکەی خۆیان بدەن، خۆیان بە کورد و خەڵکی « کوردستان » بزانن!
بیرم دێ، لە « یەکێتی سۆڤێت »ی کۆن، گەر زۆر پێویست نەبووایە، ڕۆڵەی گەلە جیاوازەکان، تەنانەت، بە زمانی نەتەوەی باڵادەس « ڕووسیی » نەدەدوان. ئەو زمانەیان، بە زمانی داگیرکەر دادەنا! لەگەڵ ئەوەشدا، گەر بەراوردێ، لە نێوان ئەو گەلانە و گەلی کورددا بکەین، ئەوان، گەلێ مافی نەتەوەیی خۆیان وەرگرتبوو! ئێستەش، نەک هەر گەلانی پێشووی ئەو دەوڵەتە زلهێزە، بەڵکوو، گەلانی « پۆڵەند، بولگاریا، هەنگاریا، ڕۆمانیا، یۆگۆسلافیا، چیک و سلۆڤاک » نایانەوێ، بەو زمانە بپەیڤن، جا نەخوازەڵڵا، گۆرانیی پێ بچڕن، فیلم و شانۆگەریی پێ دەرکەن! چونکە دەڵێن: ماوەیەکی زۆر، نیشتمانی ئێمەیان داگیرکردبوو، ئازادییمان لێ زەوتکرابوو، لە هەموو ڕوویەکەوە، لە کاروانی پێشکەوتنی شارستانیی جیهان دواکەوتبووین! ئەدی کوردی چەندین جار بندەس، چەوساوە و بێ ماف بڵێ چی؟!! لە دەس داگیرکەرانی « کوردستان »، قوڕی کوێ بە سەر خۆیدا بکا؟!!

«3»

ڕاستە، کەناڵەکانی تێلێفیزیۆنی نێوخۆیی و ئاسمانیی « کوردستان »، بە هەر زمانێ، دەنگوباس بڵاوکەنەوە، کۆڕ و سیمینار، لە سەر گرفتی کورد بگرن، فیلم و دەکومێنتی مێژوویی و جوگرافیایی، دەربارەی کێشەی کورد و خاکی « کوردستان » پیشاندەن، دڕندەیی و بێ بەزەیی داگیرکەران، بۆ گەلانی جیهان ڕوونکەنەوە، تا بڵێی، کارێکی باش دەکەن. بەڵام، نەتەوەی عەرەب، جگە لە کەناڵە نێوخۆییەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان، نزیکەی پەنجا کەناڵی ئاسمانییان هەیە، هەر کەناڵێکیش، چەندین لقی دیکەی لێ دەبێتەوە، ئایا، بە چ ئایینێ ڕەوایە، وا تێلێفیزیۆنە کوردییە نێوخۆیی و کەناڵە ئاسمانییەکان، گۆرانیی، سروود، نواندن و فیلمی عەرەبیی

لێدەدەن؟!! بە ڕاستیی، ئەوە کارێکی زۆر درێوە و لە تێلێفیزیۆنی گەلێکی بندەس ناوەشێتەوە! تۆ بڵێی، گەلێکی ژێردەس هەبێ، هێندەی کورد، هەستی نەتەوەیی لاوازبێ؟!!

ئاخر، با سەرکردەکانی کورد باش بزانن، نەتەوەی عەرەب، ئەو هەموو کەناڵە نێوخۆیی و ئاسمانییانەیان هەیە، بە هیچ شێوەیە، پێویستیان بە گۆرانیی عەرەبیی، نواندی شانۆ و فیلمی عەرەبیی نییە، تا، کەناڵە نێوخۆیی و ئاسمانییە کوردییەکان بۆیان لێدەن! ئەوە جگە لەوەی، چەندین کەناڵی ئاسمانییان هەیە، گۆرانیی لێ نادەن، شانۆگەریی و فیلم پێشکەش ناکەن، بەڵکوو، تەنیا هەر، دەنگوباس بڵاودەکەنەوە، بەرنامەی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، زانستیی و کەلتووریی » پەخشدەکەن! بۆ نموونە: کەناڵەکانی « ئەلعەرەبیە، ئەلجەزیرە، ANN، ئەلمەنار، ئەلحەیات، ئەلعەلەم ... » جگە لەوەی، بەرنامەی زۆر باش پێشکەشدەکەن، هەمیشەش، وەک چاوی زیت و وریای، چوارەمین دەسەڵات وان، چاودێریی کردار و ڕەفتارەکانی، لێپرسراوانی دەوڵەتە عەرەبییەکان دەکەن، ڕەخنەی توندیان لێ دەگرن و شەرمەزاریاندەکەن!

تەنانەت، هێندێ لە دەوڵەتە عەرەبییەکان، ئەوانەی لە ڕووی هونەرییەوە پێشەکەوتوون، هیچ جۆرە هونەرێکی عەرەبیی دەوڵەتەکانی دیکەی عەرەب پێشکەش ناکەن. هەر بۆ نموونە: دەوڵەتێکی عەرەبیی وەک « سووریا »، گۆرانیی، نواندن، شانۆگەریی و فیلمی سینەمای خۆیان نەبێ، هی دەوڵەتە عەرەبییەکانی دیکە لێ نادەن. هەروەها، کەناڵە نێوخۆیی و ئاسمانییەکانی تێلێفیزیۆنی « لوبنان »، بە دەگمەن نەبێ، ئەو کارە ناکەن!

دوور نییە، گەر کار وا بڕوا، ماوەیەکی دیکە، هێندێ کورد، هەستی بیانییپەرستیی و خۆبەکەمزانینیان، هێندە بەرزبێتەوە، لەبری بیجامە و جلی کوردیی، دزداشە لەبەرکەن، لەبری جامەدانە، عەگال ببەستن، بڵێن: جلی کوردیی و جامەدانە گەرمە، دزداشە و عەگال فێنکە، وەک ئێستە بە ئاشکرا، لە « باشووری کوردستان » دەبینین، ڕێژەی جلی کوردیی، زۆر کەمبۆتەوە و بەرگدرووەکان، وەک جاران، کاریان نارِوا و دەسکەوتی باشیان نییە!

ئایا، ڕادیۆ و تێلێفیزیۆنەکانی « توورکیا »، یا ڕادیۆی « توورکمان »ەکان لە « باشووری کوردستان »، بە باشە باسی کورد دەکەن؟ بەرنامەی تایبەتییان لە سەر تاوانەکانی « توورک، فارس و عەرەب » دژی کورد و بە زمانی توورکمانیی، یا کوردیی هەیە؟!! ئایا توورکمانەکان، کەمیان ڕاپۆرتی سیخووڕیی، لە سەر دەوڵەتی « عێراق »، ڕەوشی « باشووری کوردستان » و

باری نەتەوەیی و ڕامیاریی خۆیان، بۆ دەزگە سیخووڕییەکانی « تووركیا » نووسیوە؟!! بۆ سەرانی « تووركیا » نازانن. چیان كردووە؟!! بۆ هەر دەوڵەتی « تووركیا » خۆی، جینۆسایید، ڕاگواستن و بەرنامەی تووركاندنی كوردی پیادە نەكردووە؟!! وا تێلێفیزیۆنی « Kurdsat » دەیەوێ، دەردی دڵی خۆی، بۆ برا تووركمانەكانی هەڵڕێژێ؟!! ئایا، ڕۆڵەكانی نەتەوەی توورك و سەرانی دەوڵەتی « تووركیا »، یەكەمین نەتەوە و دەوڵەت نەبوون، كوردیان ڕاگواست، سەر و ماڵیان ئەنفالكرد، بە هەزاران گوندی « باكووری كوردستان »یان، لەگەڵ زەوییدا تەختكرد، دەسیان بۆ ئابڕووی كیژ و ژنانی كورد برد و داگیریانكردن؟!! ئایا ئێستەش، ئەو كردەوە چەپەڵانە، لە « تووركیا »ی دیمۆكراسییدا، هەر بەردەوام نییە؟!!#

ئاخر، كاتێ « Medtv » كرایەوە، لە هەموو بوارەكانی « خوێندن، نووسین، قەلاچۆكردنی نەخوێندەواریی، كەلتوور، هونەر، وێژە، زانست، بیر، فەلسەفە و ڕامیاریی » كوردییدا، شۆڕشێكی گەورەی نەتەوەیی بەرپاكرد، بە هەزاران كوردی باكوور و خۆراوای « كوردستان »ی، فێری زمانی كوردیی كرد، زۆر بە باشیی، بە « مێژوو، جوگرافیا، زانست، هونەر، وێژە، كەلتوور »ی كورد و جیهانی ناساندن. ئەو كوردانەی، پتر لە هەشتا ساڵ دەبوو، هەر دوو دەوڵەتی داگیركەری « تووركیا » و « سووریا »، نەک هەر لە زمانی زكماكیی خۆیان، بەڵكوو، لە هەموو مافێكی « مرۆیی، نەتەوەیی، یاسایی و دیمۆكراسیی »، بێ بەشیكردبوون. كەچیی، هەر دوو كەناڵی « Kurdsat » و « Kurdistantv » هەوڵدەدەن، ڕۆڵەكانی نەتەوەی كورد، فێری زمان و كەلتووری « تووركیی، فارسیی و عەرەبیی » بكەن!

سەرانی پارتەكانی « كوردستان »، تەنانەت، كەناڵە ئاسمانییەكانی تێلێفیزیۆنیشیان، لە دژی یەكدی كردۆتەوە. چونكە سەرەتا، تەنیا هەر تێلێفیزیۆنی « Med » هەبوو، « P.K.K. » دایمەزراند و هەر ئەویش، ئەو دەسپێشكەریی و ڕاژە گەورەیەی پێ برا. بەڵام لەبەرئەوەی، لە هەموو ڕوویەكەوە، مەترسییەكی زۆر گەورەی، بۆ سەر « پارتیی » هەبوو، هەر زوو، فریای خۆی كەوت و « Kurdistantv »ی دامەزراند. جا، هەر لە ڕاستییشدا وابوو، چونكە، هێندەی « Medtv »، زیانی بە « پارتیی » دەگەیاند، هێندە زیانی بە « یەكێتیی » نەدەگەیاند!

كاتێ « یەكێتیی »ش زانی، « Kurdistantv »، چەن زیانی پێ دەگەیەنێ، ئەویش هەوڵێكی زۆری دا و « Kurdsat »ی دامەزراند! چونكە، ناكۆكیی و ڕكەبەرایەتیی ڕاستەوخۆی نێوان « پارتیی » و « یەكێتیی »، لە ناكۆكیی و

ڕکەبەرایەتیی نێوان « P.K.K. » و « یەکێتیی »، گەلێ گەورەتر و زۆرتربوو.
ڕاستە، هەر دوو کەناڵی ئاسمانیی « Kurdistantv » و « Kurdsat »، ڕاژەیەکی زۆر گەورەی زمان و کەلتووری کوردیی دەکەن. بەڵام، لە بنەڕەتدا، « پارتیی » و « یەکێتیی »، بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە دایان نەمەزراندووە. بەڵکوو، لە ترسی یەکدی و « Medtv » دایاناون، تا پڕوپاگەندەی باش بۆ خۆیان و خراپ بۆ ئەوانی دیکە بکەن. لەبەرئەوە، هەر سێ تێلێفیزیۆنەکە، سێ دەنگی ڕەسەنی نەتەوەی کورد نین، بەڵکوو، سێ تێلێفیزیۆنی ئەو سێ پارتەن، ڕاڤە لە بەرنامە، ڕامیاریی، ئامانج، دید و بۆچوونە تایبەتییەکانی خۆیان دەکەن و پتر، لە خەمی گرفتەکانی خۆیان دان!

«4»

خۆزگە، پەیامنێری کەناڵی تێلێفیزیۆنە کوردییەکان، کەمێ شارەزاییان، لە زمانی کوردییدا هەبووایە. کاتێ، ڕاپۆرتێ یا ڕیپۆرتاژێ، پێشکەش بە بینەرانی کورد دەکەن، بە زمانێکی بازاڕیی، قسەیان نەکردایە!
خۆزگە، دەزگەکانی ڕاگەیاندن، بایەخێکی زۆریان، بە زمانی کوردیی بدایە، پسپۆڕی زمانەوانیی تایبەتییان هەبووایە، سەرپەرشتیی زمانەکەیان بکردایە!
خۆزگە، بەڕێوەبەری دەزگەکانی ڕاگەیاندنی « کوردستان »، کەمێ بە خۆیاندا بچوونایەتەوە، وازیان لە ناسیاویی و پارتایەتیی تەسک بێنایە، کاری ڕاگەیاندنیان، بە کادێری ناشارەزا و نەزان نەسپاردایە!
خۆزگە، تەنیا ئەو کادێرە لێهاتوو و بەهەرەمەندانەیان وەرگرتایە و کاریان پێ بسپاردنایە، کە توانایەکی باش و خۆڕسکییان هەیە.
خۆزگە، کەڵک لەو هەموو پەیمانگە و زانکۆیانەی « کوردستان » و « عێراق » وەرگیرایە، کادێری پسپۆڕ و ڕاستەقینەی بە توانای زمانەوانیی و ڕاگەیاندنیان پێگەیاندایە، لە بەشەکانی ڕاگەیاندنی پەیمانگە و زانکۆکانی چ « کوردستان » و چ « عێراق »دا، پێیان بخوێندنایە و هێندێکیشیان، بۆ دەرەوەی وڵات بناردنایە، تا، لە کاری ڕاگەیاندنی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان ئاگاداربوونایە، شتێ فێربوونایە و کەڵکیان لێ وەرگرتایە!
تەنانەت، ئەو دەزگە جیاجیایانە دەتوانن، لەگەڵیان ڕێککەون، لە سەر ئەرکی ئەوان بخوێنن، پاشان، کاتێ خوێندنیان تەواوکرد، بگەڕێنەوە، هەر لای خۆشیان دایانمەزرێنن و کاربکەن!
خۆزگە، هاوکاریی لە نێوان کوردی نێوە و دەرەوەی وڵاتدا بکرایە، دەزگەکانی ڕاگەیاندن، کەڵکیان لە پسپۆڕەکانی دەرەوە وەرگرتایە. بە

تایبـەتیی، هێندێ ڕۆڵەی دەسـرەنگینـی کـورد، لە دەرەوەی وولات دەژیـن، یا خـوێندوویانە، یا، ئەزمـوونێکی ڕاگـەیاندنی باشیـان هەیە، دەتـوانن، پەرە بە کـاری ڕاگـەیاندن بدەن. چونکە، خـۆیان فـێـری زمـان و شـێـوازی کـاری ڕاگەیاندن کردووە.
لە کۆتاییشـدا دەڵێم: کاتێ، کیژێ یا ژنێکی کورد دەبینم، گۆرانیی دەچڕێ، یا، ئامـێرێکی موزیک دەژەنێ، یا، لە بەشـی هونەری شـانۆدا کـاردەکـا، یا، خـۆی بە نووسـینەوە خـەریکدەکـا، یا، لە ڕێکخـراوێکی ژناندا چـالاکـە و داکـۆکـیی لە مـافـەکـانیـان دەکـا، یا، لـە هەر بوارێکـی دیکەی « نەتـەوەیی، رامـیاریی، هونـەریی، وێژەیی، کـەلتووریـی و ئەکادیمیـی »دا، دەسـرەنگینیی خـۆی دەنوێنێ، لە خـۆشـیاندا، بسـتـبـست باڵادەکـەم، گەشـەدەکـەم، هەر ئەوە نییە، باڵ ناگرم و خـۆمی ناگەیەنمێ، تا، لە ناخی دڵەوە، پیرۆزبایی لێ بکەم و سەرپەنجە زێڕینەکانی ماچکەم.
بەڵام، خـۆزگە، دەزگـەکـانی ڕاگـەیاندن بە گـشـتـیی و کـەناڵی تێلێفـیـزیۆنە کوردییەکان بە تایبەتیی، هـەر لەبەرئەوەی بیسەلمێنن، بایەخ بە ڕەگـەزی ژن دەدەن و کاریان لەگەڵدا دەکەن، لە بێ کادێرییدا، هەر کیژ و ژنێ ویستی، لەو دەزگەیانەدا کاربکا، هەروا بە خـۆڕایی، دایان نەمەزرێنن و کاری پەیامنێریی، یا، بەرنامـەی تایبـەتییان پـێ نەسپێرن. بەڵکوو، بە دوای پسپـۆڕ و خـاوەن بەهرەکاندا بگـەڕێن و کـاریان پێ بسپـێرن. چونکە، بە ڕاسـتیی، هێندێ لەو خوشکانە، بە زمـانـێ دەدوێن، فرێ بە سـەر زمانی وێژەییـیەوە نییە! بە جۆرێ هـەڵسوکەوتدەکـەن، لە کەلتووری ڕاگەیاندندا جێی نابێتـەوە و پتریش، لاسایی کارمەندی تێلێفیزیۆنە عەرەبییەکان دەکەنەوە!
بە کـورتیی و کـوردیی: خـۆزگـە، لە هـەمـوو بوارەکـانـی ژیانی کـۆمـەڵی کوردەوارییدا، نان بۆ نانەوا و گۆشتیش، هەر بۆ قەساب دەبوو!

**ستۆکهۆلم**
**2005. 03.10**

* * *

---

**تێبینی:**

* کاتی خۆی، لە پەراوێزی گوتاری « دۆستایەتیی ڕاستەقینە، یا، برایەتیی گاڵتەقینە »دا، ئەم چەن دێڕەم، لە سـەر ئەو سرووده نامۆیە نووسی. وا بزانم، جێی خۆی گرت و لەو ڕۆژەوە، لـە « Kurdsat »ەوە بلاو نەکراوەتەوە. بۆیە، بە پێویستی دەزانم، جارێکی دیکەش، لە

پەراوێزی ئەم گوتارەشدا بڵاویکەمەوە: (هێشتا، کۆمەڵانی خەڵکی ڕەشووڕووتی زۆرلێکراوی کیمیابارانکراوی ئەنفالدیدەی خەڵکی « باشووری کوردستان »، پڕ بە سییەکانیان، هەوای ئازادییان هەڵ نەمژیوە، تاوانەکانی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »یان بیر نەچۆتەوە، ئەو دەوڵەتەی، پتر لە هەشتا ساڵ دەبێ، بە ئاگر و ئاسن، دەنگی ئازادیی، لە گەرووی ڕۆڵەکانی کورددا کپکردووە! کەچیی، « شانازی برایم ئەحمەد »، هۆنراوە و ئاوازی، بۆ سروودی « یا عێراق » داناوە، ئەو سروودەی، ووشەکانی، لە ئاستی خوێنی هەموو شەهیدانی یادی هەشتا ساڵەی داگیرکردنی « کوردستان »دا، نەک ئارەق، بەڵکوو تکتک، خوێنی بێزاریی و شەرمەزاریی لێ دەتکێ!
سەیر ئەوەیە، کۆمەڵێ منداڵی نەشمیلەی کوردیان، بە جلی کوردیی ڕازاوەوە ڕیزکردووە، بە ئاوازێکی یەکجار خۆش و کاریگەر، گۆرانیی، بۆ گەلی سەردەسەی عەرەب و خاکی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق » دەچڕن، هەموو ڕۆژێکیش، دوای دەنگوباسی زمانی « عەرەبیی »، زۆر بە شانازییەوە، لە کەناڵی « **Kurdsat** »دوە، چەن بارەیاندەکردەوە! ئەوە لە کاتێکدا، باوکی شادڕەوانی، هۆنراوەی « کوردستانیی » هۆنیوەتەوە و هەر خاتوو « شاناز » خۆشی، ئاوازی بۆ داناوە!
بەڵام، جیاوازیی نێوان، شێوە و ناوەڕۆکی، ئەو دوو هۆنراوە « کوردیی » و « عەرەبیی »یە، جیاوازیی نێوان، ئەو دوو بیرە ڕەسەنە « کوردستانیی » و ناڕەسەنە « عێراقچێتیی »یە، هەر لە باسکردن نایە! ئەمە خۆی لە خۆیدا، نەک هەر تاوان و « عێرقچێتیی »یەکی خەستە، بەڵکوو، تا سەر گۆشت و ئێسکیش، سووکایەتیی بە خوێنی شەهیدان، هەست و هۆشی ڕۆڵەکانی گەلی کورد، کوردبوونی هەزاران خەڵکی بە ئەمەک و بە ڕوومەتی « کوردستان » دەکا!
وەنەبێ، هەر لێرەشدا، باسی ئەو سرووده بێ بایەخە بکەم، بەڵکوو گەلێ جار لە « کوردستان » و هەندەران، باسمکردووە و بە گوێی هێندێ لە لێپرسراوانی « یەکێتیی »شمدا داوە! هەر بۆ نموونە دەڵێم: لە مانگی حەوتی « **2003** »دا، لە بیرۆی کارکردنەکەی خۆی، چاوم بە دوکتۆر « بەرهەم » کەوت، زۆر بە ڕاشکاویی پێم گوت: ئەم « عێراقچێتیی »یەی ئێوە دەیکەن، زیانی لێ دەبینن. کەچیی، پێی ناخۆشبوو، گوتی: ئێمە ئاڵامان هەڵکردووە، ئەوە بێ ویژدانییە، ئێوە لەگەڵ ئێمەدا دەیکەن!
# « وشیار زێباریی »، ئەندامی پەلیتبیرۆی « پارتیی » و شالیاری دەرەوەی دەوڵەتی داگیرکەری « عێراق »، ڕۆژی « **2004. 06. 15** »، لە شاری « ئەستەمبوڵ »، دەربارەی دیمۆکراسیی، زۆر بە ڕاشکاویی، مۆدێلی دیمۆکراسیی « توورکیا »ی لە نێوچەکەدا، بە درەوشاوە دانا! باشە، وا « زێباریی »، ستاییشی سیستێمی دیمۆکراسیی « توورکیا » دەکا، ئایا، بەو شێوە فرمانڕەوایی و ڕژێمە قایلدەبێ، گەر عەرەبەکانی « عێراق »، بە سەر گەلانی « عێراق » بە گشتیی و گەلی کورددا بە تایبەتیی بیسەپێنن؟!! ئاخر، ئەو وەک شالیاری دەرەوەی دەوڵەتێکی عەرەبیی « عێراق »، بۆی هەیە، هەموو ڕۆژێ، لە شەقەی باڵ بدا، سواری فڕۆکە بێ و وەک کۆتری ئاشتیی بفڕێ، دڵی نەیارەکانی « عێراق » چاککاتەوە. بەڵام، هەرگیز بۆی نییە، لەو دەوڵەتە داگیرکەرانەی پارچەکانی دیکەی « کوردستان »یان پێوە لکێنراوە، باسی دیمۆکراسیی بکا! ئاخر، یەکێ بە گەورەیی فێری پلاوخواردن بێ، دەس بۆ لووتی دەبا!

# نووسەر و نووسین

گرفتەکە لە ئەوە دایە، تا ئێستە، بە تەواویی نازانین، لە نێو کورددا، بە کێ دەڵێن نووسەر؟!! خەسڵەتەکانی نووسەر و نووسینی کوردیی چین؟!! چونکە، چەن پرینسیپێکی تایبەتیی و سەرەکییمان نەبووە و نییە، تا بزانین، نووسەر کێیە و نووسین چییە؟!! هەرچەندە، بەپێی مەرجەکانی « یەکێتی نووسەرانی کورد » بێ، هەر کوردێ، پەرتووکێ بنووسێ و دوو ئەندامی نووسەران پشتگیرییبکا، ئەوا، لە « یەکێتی نووسەرانی کورد »دا، بە ئەندام وەردەگیرێ و نازناوی نووسەری پێ دەبەخشرێ! لەبەرئەوە، هێندێ کەس هەن، خۆیان بڕوایان کردووە، یا، بە زۆر بڕوایان بە خۆیان هێناوە، کە نووسەرن! بۆیە، بە شێوەیەکی بەردەوام دەنووسن، کاغەز ڕەشدەکەنەوە، ئەو هەموو مرواریی و گەوهەرانە هەڵدەڕێژن!

ئاخر نابێ، هەر کەسێ، شتێ بنووسێ، خۆی بە نووسەر بزانێ! چونکە، هەر وەک چۆن گوتوویانە: بە گوڵێ بەهار نایە! هەر وەک چۆن، هەر یەکێ، چەن گۆرانییەکی چڕی، یا، ئامێرێکی موزیکی ژەن، یا، چەن تابلۆیەکی کێشا، مەرج نییە، هونەرمەندبێ! هەر بەو شێوەیەش، هەر کەسێ، چەن دێڕە هۆنراوەیەکی هۆنییەوە، مەرج نییە، هۆنەربێ! هەر کەسێ، چیرۆکێ یا چەن چیرۆکێکیشی نووسی، مەرج نییە، چیرۆکنووسبێ! هەر کەسێ، ڕەخنەی زۆری گرت، مەرج نییە، ڕەخنەگربێ! هەروەها، هەر کەسێ، چەن گوتارێکی نووسی، یا، یاداشتەکانی خۆی تۆمارکرد، یا، پەرتووکێکی بە چاپگەیاند، مەرج نییە، نووسەربێ! دیسانەوە، هەر کەسێ، چەن پەرتووکێکیشی بڵاوکردەوە، هەر مەرج نییە، هەموو مەرجەکانی نووسەری ڕاستەقینەی تێدابێ.

هەرچەندە، تا ئەندازەیەک، ئەو بۆچوونەی « یەکێتی نووسەرانی کورد »، هێندێ ڕاستیی تێدا هەیە. بەڵام، هەر وەک چۆن، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، « باش و خراپ، سەرکەوتوو و سەرنەکەوتوو، بەهێز و لاواز، گەورە و گچکە، ڕاستەقینە و گاڵتەقینە » هەیە، هەروەها، لە بواری نووسینیشدا، نووسەری « خراپ، سەرنەکەوتوو، لاواز، گچکە و لابەلایی »ش هەیە.
بەڵام، ئەز لەو باوەڕەدام، « هونەرمەند، هۆنەر، نووسەر و ڕەخنەگر »ی ڕاستەقینە ئەو کەسانەن، جگە لەو بەهرە خۆڕسکییەی، خوای گەورە پێی بەخشیون، دەبێ، چەن خەسڵەتێکی دیارییکراو و تایبەتییشیان تێدا هەبێ.
ئەز لێرەدا، ئەو مافە بە خۆم نادەم، لە هۆنەر و هونەرمەندی ڕاستەقینە بدوێم، بەڵکوو ئەو کارە، بۆ شارەزایانی ئەو بوارە گرنگە پڕ بایەخە بەجێدێڵم و دەسی بۆ نابەم. بەڵام هەوڵدەدەم، هێندێ تیشک، ئاراستەی نووسەر بکەم، تا بزانین، کێ شایانی ئەوەیە، نازناوی نووسەری پێ ببەخشرێ؟!!
1. لە زمانی زکماکیی خۆیدا، زۆر شارەزابێ. گرامەر و ڕێنووسی کوردیی، باش بزانێ.
2. شارەزایی، لە نیشانەکانی « خاڵبەندیی »دا هەبێ.
3. شەقڵێکی تایبەتیی هەبێ، لاسایی کەس نەکاتەوە. شێوازی نووسین و دارشتنی وێژەیی بەهێزبێ.
4. بەڵەنسێ لە نێوان شێوە و ناوەڕۆکدا ڕاگرێ.
5. ڕووناکبیربێ. بەڵام، مەرج نییە، هەموو ڕووناکبیرێ، نووسەربێ!
6. خوێنەرێکی باشبێ و زۆر بخوێنێتەوە.
7. ئازا و نەترسبێ، هەڵوێستی بەرانبەر هەموو ڕووداوە « نەتەوەیی، ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی »یەکان، ڕوون و ئاشکرابێ.
8. زمانی خاوێن و دەسی پاکبێ، درۆ بۆ کەس هەڵ نەبەستێ، نووسینەکانی خۆی، بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو، بەڵگەی زانستانە، دەکومێنتی مێژوویی بڕازاێنێتەوە و بەهێزیانکا!
9. لووتبەرز نەبێ، ساکار و بێ فیزبێ، هەستی خۆ بە زلزانینی تێدا نەبێ، لە خۆی بایی نەبێ، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە، لە جەماوەر بڕوانێ و بیاندوێنێ!
10. جگە لە زمانی دایک، زمانێ یا چەن زمانێکی دیکە بزانێ، تا، لە سەرچاوەی ڕوون و خاوێنی ئەو زمانانەشەوە، زانیاریی بە کەڵک هەڵهێنجێ و ئاستی ڕۆشنبیریی خۆی، پێ بەرزکاتەوە، بیر و هۆشیشی، دەوڵەمەند و پاراوترکا! «1»

11. دەبێ، لەگەڵ خۆی، پێنووسەکەی و خوێنەردا ڕاستگۆبێ، هەرگیز، ڕاستگۆیی خۆی لە دەس نەدا. چونکە ڕاستگۆیی، بەرزترین و گرنگترین خەسڵەتێکە، پێویستە، لە هەموو نووسەرێکی ڕاستەقینە و سەرکەوتوودا هەبێ. لەبەرئەوە نابێ، لە پێناوی پارووپە نانی نەرم و گەرم، لە پێناوی پلەوپایەدا، خۆی و پێنووسەکەی بفرۆشێ، لە ڕاژەی کۆمەڵێ، یا پارتێکی دیارییکراودا بەکاریبێنێ و هەڵیسوڕێنێ!

12. نابێ، لە سەر هەموو شتێکی ئاسایی بنووسێ و لە هەموو دیزەیەکدا ئەسکوێ بێ! بەڵکوو دەبێ، بە دوای گرفتە گەورە و گرێگرتووەکاندا بگەڕێ، بە کلیلی ئەفسووناوی پێنووسەکەی، بە تیشکی بیری تیژی خۆی، دەرگەی نهێنیی و گرێکوێرەی گرفتەکان، بۆ کۆمەلانی خەڵک بکاتەوە. لە دەرگەی دەرکەوتە سەرسوورهێنەر و ڕووداوە گرنگەکان بدا، خوێنەر بە دوای خۆیدا پەلکێشکا، نەک دوای خوێنەر بکەوێ و قسەکانی ڕۆژانەی ئەوان بجوێتەوە!

لەبەرئەوە، نووسەری ڕاستەقینە دەبێ، بە کامێرای وردبینی چاوی، وێنەیەکی ڕاستەقینەی، زۆربەی زۆری ڕووداوە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، کەلتووریی ... »یەکان بگرێ، وەک خۆیان چۆن هەن، بیانشواتەوە و بە وردیی، سەرنجیانبدا. پاشان، لایەنە خراپ و چاکەکانیان، لە یەکدی جیاکاتەوە، لێکیانبداتەوە، شییانکاتەوە، دەمەتەقێیان لە سەر بکا، لە بەر ڕۆشنایی کۆڵینەوە و ئەنجامەکانیدا، لایەنە خراپەکانی ڕەتکاتەوە، بە بەڵگە بیسەلمێنێ و بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیش، پێشنیازی گونجاو بکا!

هەروەها، بۆ ئەوەی، وێنەیەکی ڕاستەقینە و سروشتیی جوان، پێش چاوی خوێنەران بخا، دەبێ، زۆر بێلایەنانە، لە ڕووداوەکان بڕوانێ، فاکتەرەکانی پارتایەتیی و ئایدۆلۆژیا، کار لە تێڕوانین و بۆچوونەکانی نەکەن. چونکە گەر وا نەبێ، خوێنەر باوەڕی پێ ناکا، لە ڕاستگۆیی خۆی کەمدەکاتەوە، هەر نووسەرێکیش، ڕاستگۆیی خۆی، لای جەماوەری خوێنەر ونکرد، ئەوا باشتر وایە، نووکی پێنووسەکەی خۆی بشکێنێ و بێ دەنگبێ، وەک لەوەی، لە سەر نووسین بەردەوامبێ، کەس گوێی لێ نەگرێ، یا، جەماوەر بێ دەنگیکا!

نووسەر دەبێ، ڕێزی ووشەی پیرۆزی کوردیی و پێنووسەکەی خۆی بگرێ، بە تەنگ هەست و هۆشی خوێنەرەوە بێ، بزانێ، چی دەنووسێ، چی دەڵێ و چی دەکا! بە هیچ شێوەیە نابێ، بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی، بەهرە، توانا، هونەر و نووسینەکانی خۆی بەکاربێنێ. چونکە، گەر هەر نووسەرێ، خاوەنی کەسێتیی تایبەتیی خۆی نەبێ، زۆر بە گران، ووشەکانی بە دیواری مێشکەوە دەنووسێن و جێی خۆیان، لە دڵ و دەروونی خوێنەردا دەکەنەوە.

بەڵێ ڕاستە، هێندێ نووسەر هەن، بە تایبەتیی، لە وولاتە پێشکەوتووەکانی « ئەورووپا، ئوستراليا و ئەمێریکا »، لە سەر داهاتی بەرهەمەکانیان دەژین.
بەڵام، گەر نووسەرێ واشبێ، لە هەمان کاتدا دەبێ، هەڵوێستی دیارییکراوی تایبەتیی خۆی، بەرانبەر بە ڕووداو و کێشە گرنگە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی »یەکان هەبێ، بۆچوونی ڕوون و ئاشکرابێ، چاوپۆشیی لە هەڵە و تاوانەکانی دەسەلاتداران نەکا، لەگەڵ هەموو کزە بایەکدا، وەک چڵی نەرمی درەخت نەچەمێتەوە، سڵ لە هیچ شتێ نەکا و زۆر بە ڕاشکاویی، هەڵوێستی خۆی دەربڕێ! «2»
نووسەر دەبێ، کاتێ قسەدەکا، یا کۆڕدەگرێ، قسەزانبێ، زمانپاراوبێ، چەن بە ناوەڕۆکی قسەکانی، سەرنجی گوێگر بە لای خۆیدا ڕادەکێشێ، هێندەش، بە شێوازی قسەکردنی، سەرنجیان بە لای خۆیدا ڕاکێشێ!
بە داخەوە، زۆربەی ئەوانەی، لە تێلێفیزیۆنەکانەوە قسەدەکەن، جگە لەوەی، بە زمانێکی پوخت و وێژەیی نادوێن، زۆربەی قسەکانیشیان دووبارەکردنەوە و جوونەوە نەبێ، هیچی دیکە نین. لەبەرئەوە، ئەو جۆرە نووسەرانەی، توانای قسەکردنیان نییە، باشتر وایە، تەنیا هەر بنووسن و خۆیان تووشی کۆڕگرتن نەکەن. یا، کاتێ کۆڕدەگرن، نابێ، شتی لاوەکیی، زۆر تێکەڵ بە باسە سەرەکییەکەی خۆیان بکەن، بە خۆڕاییی، بابەتەکە درێژکەنەوە، بە شێوەیە، گوێگر توانای گوێگرتنی نەمێنێ و بێ وزەبێ!
ئەز دڵنیام، لە کۆندا، تا هۆنەر و نووسەرانی کورد لە ژیاندا بوون، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، زۆر ڕێزیان لێ نەگرتوون. بەڵام، دوای ئەوەی مردوون، ڕێزێکی زۆریان، لە خۆیان، بنەماڵە و بەرهەمەکانیان گرتووە، یادیان کردوونەتەوە، هەر وەک بە هۆنراوە و نووسینەکانیاندا دەردەکەوێ و ئەوڕۆش، بە چاوی خۆمان دەیبینین! چونکە، هەمووومان ئەو ڕاستییە باش دەزانین، هەر نەتەوەیەک، « هۆنەر، نووسەر، ڕووناکبیر، هونەرمەند، زانا و ڕامیار »ی نەبێ، لە نێو نەتەوەکانی جیهاندا، بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادرێ! چونکە هەموو نەتەوەیەک، سەرمایە گیانییەکەی و بایەخە شارستانێتییەکەی، پتر بە کەلتوور، بەرهەمە وێژەیی و هونەرییەکانی دەپێورێ! لەبەرئەوە، گەر چەن کەڵەنووسەرێکی وەک: « شەرەفخانی بەدلیسیی، محەمەد ئەمین زەکیی، عەلادین سەجادیی، مەسعوود محەمەد ... »مان نەبووایە، یا، چەن هۆنەرێکی گەورەی ناوداری وەک: « باباتایەری هەمەدانیی، مەلای جزیریی، ئەحمەدی خانیی، بێسارانیی، نالیی، مەولەویی، حاجی قادری کۆیی، مەحویی، پیرەمێرد، حەمدیی ... »مان نەبووایە، ئەوڕۆ، چیمان بکردایە؟!! چۆن

شانازییمان، به ڕابردووی خۆمانەوە بکردایە؟!! کێ دەیناسین؟!! بۆیە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد، تاهەتایە، قەرزاری ئەو کەڵەنووسەر و هۆنەرە گەورانەن، کە چەندین شەوی تاریکونووتەکیان، لە بەر « قووتیلەی نەوت » و « چرای گەرچەک »دا ڕۆژکردۆتەوە، تا، بە « گەوهەر و مرواریی » ووشەی کوردیی، مێژووەکەمان بۆ بڕازێننەوە، « یاقوت و زمرووت »ی هۆنراوەمان بۆ بهۆننەوە!

ئەوڕۆ، کارەساتی گەورەی نووسەرانی کورد و نووسینی کوردیی لە ئەوەدا دەبینم، هێندە گۆڤار و ڕۆژنامە زۆربوون، هەر بە جارێ بێ تامبووە. چونکە، هەر دوو کەس کۆدەبنەوە، گۆڤارێ یا ڕۆژنامەیەکی نوێ دەردەکەن. لەبەرئەوە، نە کەس توانای کڕینی هەموویانی هەیە، نە کەس فریای خوێندنەوەی هەموویان دەکەوێ، نە هێندێ لە بابەتەکانیش، سەلکەتوورێکی گەنیو دێنن!

سەیرەکە پتر لەوەدایە، هێندێ لاوی تازە پێگەیشتوو، ئەزموونێکی تەواو و باشیان، لە کاری ڕۆژنامەنووسییدا نییە، شارەزای نووسین نین و زمانێکی باش نازانن، کەچیی، هێندێکیان خۆیان بە سەرنووسەر، هێندێکی دیکەیان بە خاوەن بڵاوکراوە و هێندێکی دیکەشیان، بە بەرپرسی نووسین دادەنێن! بە ڕاستیی، ئەم دیاردەیە، کارێکی زۆر خراپ، لە جوڵانەوەی کەلتووریی کوردیی، پرۆسەی خوێندنەوە و پەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتوومان دەکا!

هەروەها، گرفتی سەرەکیی زۆربەی نووسەرانیش ئەوەیە، بە تایبەتیی، ئەو نووسەرانەی بەرهەمیان زۆرە و زۆر دەنووسن، کاتی خوێندنەوەیان زۆر کەمە و فریای خوێندنەوەی هەموو شتێ ناکەون. واتە: لە سەر حسێبی خوێندنەوە، پتر بایەخ بە نووسین دەدەن!

هەڵبەتە، هەموو شتێ لەم گەردوونەدا، زیان و قازانجی دیارییکراوی خۆی هەیە. بۆ نموونە: لاپەڕەکانی ئەلکترۆنیی « **Internet** »، سەرەڕای هەموو ئەو قازانجانەی هەیەتی، چەن زیانێکی خراپیشی هەیە:

1. زۆر کەس هەن، بێ ئەوەی، سەریان لە سەرەتاکانی دەستووری نووسین دەرچێ، شارەزاییەکی تەواویان، لەو بوارە گرنگەدا هەبێ، یا، زمانی نووسین بزانن، یا، فریان بە سەر ڕێزمانی کوردییەوە هەبێ، گوتار دەنووسن. بەڵام، خۆشیان نازانن، چی دەنووسن؟!! چییان دەوێ؟!! بەڵکوو، تەنیا هەر حەزدەکەن، ناو و وێنەکانیان، لە لاپەڕەکانی « **Internet** »دا بڵاوبێتەوە!

2. هێندێ کەس هەن، لاپەڕەکانی « **Internet** »، بۆ سووکایەتییکردن بە یەکدی، ڕیسواکردنی خەڵکیی و مەبەستی تایبەتیی خۆیان بەکاردێنن.

تەنانەت، لە ژێر ناوی ئازادیی و دیموکراسییدا، گەلێ قسەی سارد و سووک بە یەکدی دەڵێن، لاپەڕەکانی « Internet »یش، زۆر بە ئاسانیی، بۆیان بڵاودەکەنەوە، گوایە: باوەڕیان بە ئازادیی بیر و ڕا، دید و بۆچوونی جیاواز هەیە!

خۆزگە، کورد ئەو کوتەک بەدەسانەی نەبووایە! خۆزگە، ئەو جۆرە نووسەرانە، نەک هەر نەیاننووسیایە، بەڵکوو، لە سەردەمی « هاوڕێیانی ئەشکەوت »یشدا لەدایکبوونایە، تا، ڕووناکیی ئەم سەردەمەی پێشکەوتنی کورد و جیهانیان، بە چاوی خۆیان نەدیایە! چونکە، نووسەر هەیە، جیاوازیی لە نێوان نووسین، دەردی دڵ و دەروونی ڕەشی خۆیدا ناکا، بابەت و ڕقی تاکە کەسیی خۆی، جیا ناکاتەوە، دۆ و دۆشاو تێکەڵدەکا، زۆربەی نووسینەکانی، بۆ دژایەتییکردنی خەڵک تەرخاندەکا، ئەوە لە کاتێکدا دەبێ، پێنووسەکەی بۆ ڕاژەکردنی گەلەکەی خۆی بەکاربێنێ! «3»

ستۆکهۆڵم
2005. 03. 15

* * *

---

1. لە کۆندا، کەم نووسەری کورد هەبووە، جگە لە زمانی کوردیی، دوو یا سێ زمانی دیکەی بیانیی وەک زمانەکانی « فارسیی، عەرەبیی، توورکیی، ئینگلیزیی، فەرەنسیی ... » نەزانیبێ. بۆیە، بەو زمانانەی زانیویانە، خوێندویانەتەوە و پێشیان نووسیوە.

2. بۆ نموونە: « Wilhelm Moberg »، نووسەری « سویدیی » بەناوبانگ، لە نێوان ساڵەکانی « 1898 - 1973 »دا ژیاوە. پیاوێکی زۆر هەژاربووە، خێزانێکی گەورەی هەبووە: « ژنێک و 3 کچ و 5 کوڕ » مووچەکەی بەشی نەکردووە و پارەشی نەبووە. لەبەرئەوە، بڕیاری داوە، گوتار بۆ ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بنووسێ، تا، هێندێ پارەی دەسکەوێ. کەچیی دوایی، ئەو نووسەرە ناودارەشی لێ دەرچوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هەرگیز خۆی و پێنووسەکەی نەفرۆشتووە، بەڵکوو، بە هەموو توانایەوە، دژی نازیزم و فاشیزم وەستاوە و نووسیوێتی!

3. هاوڕێیانی ئەشکەوت: ئەصحاب ئەلکەهف.

# کڕین
# و
# فرۆشتن!

بەربڵاوترین یاسای ئابووریی، لە دوو چەمکی بازاڕیی « کڕین و فرۆشتن » پێکهاتووە. کڕیارەکان، خاوەنی پارەیەکی زۆرن، دەسیان بە سەر بازاڕەکاندا گرتووە و بەپێی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان، نرخی کاڵاکان دیارییدەکەن. فرۆشیارەکانیش، ئەوەی هەیانە، لە بازاڕەکاندا پیشانیدەدەن. هەموو سەرمایەکانیان، لە کاڵا و شتومەکەکانیاندا کۆکردۆتەوە، ئەوە ئەمان نین، نرخی بازاڕ دیارییدەکەن. چونکە، ئەو شتوومەکانەی هەیانە، بەپێی زۆر و کەمیی، وەرزی بەکارهێنان، ڕکەبەریی نرخ لە نێوان فرۆشیارەکاندا و مەرجی کڕیارەکان بۆ کڕین، کاڵاکانیان ساغدەبێتەوە!

ئەمە، وەک یاسایەکی گشتیی کڕین و فرۆشتن، لە بواری بازرگانیی و بازاڕدا پێڕەودەکرێ، بە تایبەتیی، لە دەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا، بە بنچینەی سەرەکیی بزووتنەوەی بازاڕ دادەنرێ! بەڵام، ئەم یاسایە، لە زۆر بواری دیکەشدا، کەڵکی لێ وەردەگیرێ و جێبەجێدەکرێ. بۆ نموونە:

هێندێ « نووسەر، چیرۆکنووس، هۆنەر، ڕۆژنامەنووس، هونەرمەند، ڕووناکبیر، زانا، ڕامیار ... » دەتوانن، « بەرهەم، چیرۆک، هۆنراوە، گوتار، ڕیپۆرتاژ، چاوپێکەوتن، هونەر، زانست، توانا و لێهاتوویی » خۆیان بفرۆشن! هەروەها، ژنێکی سۆزانییش دەتوانێ، لەشی خۆی بفرۆشێ ... !

لە بەرانبەر ئەم جۆرە کڕین و فرۆشتنانەشدا، « دەزگەی کەلتووریی، ڕێکخراوی کۆمەڵایەتیی، پیشەیی، سەندیکایی و دیمۆکراسیی، پارتی ڕامیاریی و سەرانی دەوڵەت »ەکان دەتوانن، وەک کڕیارێ، هەڵسوکەوت، لەگەڵ هەموو ئەو خاوەن بەهرەدار و لێهاتووانەدا بکەن، بەرهەمەکانیان، بە نرخێکی هەرزان یا گران، لێ بکڕن. بەڵام، هەر یەکێ لەو خاوەن بەهرەدار و

بیریارانه، نرخی تایبەتیی خۆیان هەیە. ئەوەی بە پۆستێکی باش، خۆی و پێنووسەکەی نافرۆشێ، ئەوا ئامادەیە، بە پارەیەکی زۆر و دەسەڵاتێکی باشتر، خۆی بدۆڕێنێ!
بەڵی، لە نێو ئەو خاوەن بەهرانەدا، هێندێ کەسایەتیی هەن، زۆر سووک و ڕیسوان، هەر بە یەکەمین داواکاریی و دان بۆ ڕۆکردن، بە نرخێکی هەرزان، خۆیان دەفرۆشن! هێندێکی دیکە هەن، مام ناوەندیین و خۆیان قوورس ڕادەگرن، تا نرخێکی باشتریان دەسکەوێ. ئیدی، کاتێ زانیان، ئەوەی پێشنیازکراوە، بە خەوی شەویش دەسیان ناکەوێ، یەکسەر، وەک سەگەکەی « ئیڤان پاڤلۆڤ **1849 - 1936** »، لیک بە دەم و لەوسیاندا جۆگەلە دەبەستێ، هەر خێرا، لە ئاستی پارە و پۆستی دەسەڵاتدا، دەسی خۆبەدەسەوەدان بەرز دەکەنەوە! هێندێکی دیکەش هەن، وەک هەمووو ئەوانی دیکە، هەروا بە ئاسانیی، گۆشتیان ناخورێ، بەڵکوو، زۆر گیرن و بە درەنگ، خۆیان بەدەسەوەدەدەن. بەڵام لە ئەنجامدا، هەر لە نێو ئەو زەلکاوی کڕین و فرۆشتنەدا، خۆیان دەبیننەوە.
ئاخر وەنەبێ، کڕیارەکانیش هێندە گەمژە، گێل و گێژ بن، بە هیچ جۆرێ، جیاوازیی لە نێوان ئەو سێ گرووپە فرۆشیارە خاوەن بەهرە، لێهاتوو و بەتوانایانەدا نەکەن! چۆن نایکەن؟!! جگە لەوەی، ئەوە کاری تایبەتیی خۆیانە، نرخی بازاڕیش، هەر بە دەس ئەوانەوەیە و ئیشێکی زۆریشیان پێیان هەیە. لەبەرئەوە، هەر لە زووەوە، هەر بەهرەدارێ، نرخی تایبەتیی خۆیان بۆ داناوە و دەزانن، کێ چی پێویستە، چ جۆرە کەموکووڕیی و نەخۆشییەکی دەروونیی هەیە!
خاوەن بەهرەکانیش دوو جۆرن: هێندێکیان بە ئاشکرا، خۆیان و بەرهەمەکانیان دەفرۆشن، سڵ لە هیچ کەس و هیچ شتێ ناکەنەوە. هێندێکی دیکەشیان، بە نهێنیی ئەو کارە دەکەن. ئەم گرووپەشیان، لە سێ دەستەی جیاواز پێکهاتووە: هێندێ هەن، بە ناوی ئایدۆلۆژیا و پارتپارتێنەوە، لە سەنگەری پارتێکی دیاریکراودا، دووکانێکی پچکۆلانە دەکەنەوە، خۆیان و بەرهەمەکانیان، بە نرخێکی هەرزان یا گران دەفرۆشن. هێندێکی دیکە هەن، لە ژێر پەردەی ئاییندا زۆر بە ئاسانیی و بە خۆڕایی، خۆیان و بەرهەمەکانیان پێشکەش بە لایەنێ دەکەن و کەڵکیان لێ وەردەگرن، تا، بۆیان بڵاوکەنەوە! چونکە، لە دەمی جەماوەر و نووکی پێنووسی، نووسەرانی خاوەن هەڵوێست دەترسن. هێندێکی دیکەش هەن، لە ڕقی لایەنێ، خۆیان هەرزانفرۆش و بەرهەمەکانیشیان، تاڵانفرۆشدەکەن!

هەڵبەتە، ئەم پرۆسێسی کڕین و فرۆشتنەش، لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دیکە، جیاوازیی هەیە. چونکە، بەپێی دەسەڵاتی ڕامیاریی، سیستێمی فرمانڕەوایی و ئابووریی دەگۆڕێ. بۆ نموونە:
لە کۆمەڵگەیەکی دێموکراسیی تێروپڕدا، کێرڤی ئاستی کڕین و فرۆشتنەکە، زۆر بەرز نابێتەوە. چونکە، ئازادیی ڕادەربڕین هەیە، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکە بەهرەدارە لێهاتووەکان، بە تێروتەسەلیی دەژین. زۆر پێویستیان، بە یارمەتیی و دەسگیرۆییکردنی خەڵک نییە. لەبەرئەوە پرۆسەی پێنووسفرۆشتن و مێشک هەراجکردن، کەمتردەبێتەوە.
ئەوە جگە لەوەی، لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا، ووشە لە گوللە، پێنووسیش لە چەک بەکارتر و بەهێزترن. چونکە، نەک هەر ڕووناکبیر و نووسەران، بەڵکوو، لێپرسراوان و دەسەلاتدارانیش، لە نووکی پێنووسی نووسەرانی خاوەن هەڵوێست و ڕەخنەگر دەترسن!
بەڵام، لە کۆمەڵگە دواکەوتووە هەژارەکاندا، بە تایبەتیی، لەو کۆمەڵگەیانەی دێموکراسیی و ئازادیی تێدا نییە، تاک و کۆمەڵ وەک یەک، بە دەس دەردی دیکتاتۆریی و تۆتالیتێرییەوە دەناڵێن، ڕژێمێکی پۆلیسیی فاشیی فرمانڕەواییدەکا، کۆمەلانی خەڵک ناتوانن، بە ئازادیی، ڕاڤە لە دید و بۆچوونەکانی خۆیان بکەن، یاسا، ڕۆڵی سەرەکیی نابینێ، سەربەستیی نووسین و بڵاوکردنەوە نییە، قەیچی سانسۆر، دەس بۆ هەموو نووسێن و کارێکی ڕۆژنامەنووسی درێژدەکا، چاوی زیت و وریای دەسەڵاتی چوارەم نووستووە، نەک هەر ووشە لە گوللە، پێنووسیش لە چەک بەکارتر و بەهێزتر نین، بەڵکوو، هیچ نین، یا، شانبەشانی یەکدی دەڕۆن! لەبەرئەوە، چ ڕووناکبیر و نووسەران، چ لێپرسراو و دەسەڵاتداران، هێندە لە نووکی پێنووسی نووسەرانی خاوەن هەڵوێست و ڕەخنەگر ناترسن! بۆیە، ڕێژەی خۆفرۆشتن زیادەکا و کێرڤی مێشک داگیرکردن ڕوو لە هەوراز دەکا!
چونکە، جگە لەوەی، بەهرەدارەکان ناتوانن، ئەوەی بیری لێ دەکەنەوە و دەیزانن، بە ئازادیی دەریبڕن، هەمیشەش، هەڕەشەیان لێ دەکرێ، دەسیشیان کوورتە و پێویستیان بە سەرچاوەیەکی مەتیریاڵیی هەیە، تا، بژێوی خۆیان و خێزانەکانیانی پێ دابینکەن.
بەڵام، هێندێ لەو بەهرەمەندانە، ئەو سنوورە تەسکەش دەبەزێنن، زیادەڕۆییەکی بێ تام دەکەن، بە کاڵە و پێتاوی خۆیانەوە، ڕاژەی کڕیارەکان دەکەن، لە ناو و ناوبانگی خۆیان کەمدەکەنەوە، بایەخی بەرهەمەکانیان ناهێڵن، ڕێز بۆ خۆیان و پێنووسەکانیان دانانێن!

هەڵبەتە، هەر لە کۆنەوە، لە هەموو کۆمەڵگەکاندا، چەندین هۆنەر و نووسەر هەبوون، لە پێناوی پۆستی ڕامیاریی و پارەدا، یا لە ترساندا، بە شان و بازووی دەسەلاتداراندا هەڵیانداوە، خۆیان و بەرهەمەکانیان، بە نرخێکی هەرزان فرۆشتووە.
با لێرەدا، چەن نموونەیەکی ڕاست و زیندوو، لە سەر هێندێ هۆنەر و نووسەری خاوەن بەهرەی ناسراوی عەرەب بێنمەوە. گەر زۆر دوور نەڕۆین و تەنیا هەر، باسی ئەم سەردەمەی ئێستەمان بکەین، ئەوا، زۆر بە ئاشکرا دەبینین: چەندین نووسەر و ڕووناکبیری وەک: « هاشم ئەلعقابی، عەباس جەیحان، فالح حەسوون ... »، بە شان و بازووی دیکتاتۆرێکی وەک « سەددام حوسێن »دا هەڵیانداوە، هۆنراوەیان بۆ خۆی و جەنگە چەپەڵەکەی « قادسیە » هۆنیوەتەوە! هەروەها، بە دەیان نووسەری دیکەی وەک: « عەلاء ئەلبەشیر، عەبدولڕەزاق عەبدولواحید، ئەدیب ناسر، سامان عەبدولەجید ... » هەن، نەک هەر لە کاتی دەسەلاتی دیکتاتۆرێکی خوێنڕێژی وەک « سەددام »دا، خۆیان بە نۆکەر و چڵکاوخۆری زانیوە، بە شان و بازوویدا هەڵیانداوە، بەڵکوو، دوای ئەوەی، « سەددام »یش گیرا و دەسەلاتی نەما، هەر پێیاندا هەڵداوە و بە پیاوێکی هەڵکەوتووی سەردەمەکەی خۆیان داناوە. بە مەرجێ، لە هیچیان کەم نەبووە و کەمیشیان نییە. چونکە « عەلاء ئەلبەشیر »، مرۆڤێکی ئاسایی و نەخوێندەوار نییە، بەڵکوو، پزیشک و وێنەکێش و نووسەریشە. « عەبدولڕەزاق عەبدولواحید » و « ئەدیب ناسر »، هەردووکیان هۆنەرن. « سامان عەبدولەجید »یش وەرگێڕی بووە!
تەنانەت، هۆنەرێکی هەست ناسکی گەورەی وەک « نیزار قەبانیی »ش، هۆنراوەی بۆ خوێنڕێژێکی وەک « سەددام » هۆنیوەتەوە، کاتێ، لە فێستیڤاڵە وێژەیییەکانی « عێراق »دا، لە باشترین ئوتێل دایانبەزاندووە، خاوێنترین و گرانترین وێسکییان بۆ داناوە، جوانترین کیژ و ژنی عەرەبیان، بۆ لە پەردەکردووە و گیرفانیشیان، بە دۆلار ئاخنیوە!
هەروەها، هۆنەرێکی شۆڕشگێڕی گەورەی وەک: « مەحموود دەروێش »یش، جگە لەوەی، هۆنەرێکی ناسراوە، خۆشی خاوەنی کێشەیەکی نەتەوەیی و ڕامیاریی ڕەوا و پیرۆزە. کەچیی، لەو چەن دێڕە هۆنراوەیەی بۆ کوردی گوتبوو، دوای ئەوەی، ڕژێمی « عێراق »، دەسیان گەیشتێ، دەمیان چەورکرد و چەن خەلاتێکیان پێشکەشکرد، پەشیمانبۆوە و لە دیوانەکەیدا چاپی نەکردن. بەڵکوو، لە پێشەکییەکەیدا، زۆر بە ڕاشکاویی نووسیوێتی: ئەو هۆنراوانەی، لەم دیوانەدا چاپ نەکراون، هی من نین!

بە ڕاستیی، لەم ڕۆژ و سەردەمە ئاڵۆزەی، ئێمەی کوردیشی تێکەوتووین، لەم قۆناغە ناسکەی، گەلی کوردی « باشووری کوردستان »یشی پێدا تێپەڕدەبێ، مرۆڤە بەهرەدارە لێهاتووە خاوەن هەڵوێستەکان، لە نێو ڕیزەکانی گەلی کورددا، زۆر کەمن و بە پەنجەی هەر دوو دەس دەژمێررێن. چونکە ئەوانەی، بیر و مێشکی خۆیان نافرۆشن، بەرهەمەکانیان تالانفرۆش ناکەن، خاوەنی بیر، فەلسەفە، ڕێباز و هەڵوێستی تایبەتیی خۆیانن، تەنیا هەر، بۆ ڕۆڵەی گەلەکەی خۆیان دەنووسن، بێ ئەوەی، چاویان لە هیچ جۆرە پاداشت و پۆستێ بڕیبێ، بێ ئەوەی، گوێ لە خوورتە، سرتە و بۆڵەی کڕیارەکان بگرن، بێ ئەوەی، دەسکورتیی و نەبوونیی، تەنگیان پێ هەڵچنێ، بێ ئەوەی، چاوسوورکردنەوە و هەڕەشەلێکردنی دەسەڵاتداران، نووچیان پێ دادا، وەک دراوێکی قوورس و دەگمەن وان!

هەر وەک چەن جارێکیش گوتوومە و نووسیویشمە، کەم « ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و هونەرمەند »ی سەر بە گەلانی جیهان هەبوون و هەن، هێندەی « ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و هونەرمەند »ەکانی کورد، ڕاڕا و هەلپەرستبن، لە ئاستی ڕووداوە گرنگە « نەتەوەیی، ڕامیاریی، کۆمەڵایەتیی، ئایینیی، کەلتووریی ... »یەکاندا، بێ هەڵوێست بن!

جا خۆزگە، هەموو کەسێ لە نزیکەوە، کەسێتیی هێندێ لەو بەهرەدارانەی کوردی بناسیایە، ئینجا، بە تەواویی بۆی دەردەکەوت، چەن بە هەڵەدا چوون! چونکە، بێ ئەوەی، باشیان بناسن، هەر لە دوورەوە خۆشیانویستوون، بە خۆیان و پێنووسەکانیانەوە سەرسامبوون! جا، گەر بیر و کردەوە، نووسین و هەڵوێست، یەکیان نەگرت، ئەوا ئەو بەهرەدارانەی، کۆمەڵانی خەڵک، لە دوورەوە ناسیویانن، لە مەسینەیەک دەچن، پێش ئەوەی، مرۆ دەسیباتێ، وا دەزانێ، پڕە و قوورسە. بەڵام، کاتێ دەسیدەداتێ و بەرزیدەکاتەوە، دەبینێ، سووکە، چونکە هیچی تێدا نییە! «1»

ئاخۆ، ڕۆژێ دابێ، لە کۆمەڵگەی کوردەوارییشدا، بەڵەنسێ، لە نێوان کڕیار و فرۆشیارەکاندا درووستببێ؟!!

ئاخۆ، کەی بەهرەدار و لێهاتووەکانی کوردیش، واز لە خۆفرۆشیی بێنن و خاوەنی هەڵوێستی ڕاستەقینەی تایبەتیی خۆیان بن؟!!

ئاخۆ، کەی بێ، لە نێو کۆمەڵگەی کوردیشدا، ووشە لە گوللە و پێنووسیش لە چەک، کاریگەرتر و بەهێزتربن، دەسەڵاتی بەهێزی دیکتاتۆرەکان بلەرزێنن؟!!

تۆ بڵێی، ڕۆژێ دابێ، خاوەن توانا و بلیمەتەکانی کوردیش، وەک « گالیلۆ »، لە سەر ڕاستیی، لە گەرمای ئاگر نەترسن و بسووتێنرێن؟!!

تۆ بلێی، ڕۆژێ دابێ، بەسەردار و لێهاتووەکانی کوردیش، وەک « مەنسووری هەلاج »، لە سەر ڕاستیی و بیروباوەڕی خۆیان، بە شمشێر پارچەپارچەکرێن و بە دەم گیاندانەوە، هەر بڵێن: من هەقم! «2»
تۆ بلێی، ڕۆژێ دابێ، ڕووناکبیر، نووسەر و هۆنەرەکانی کوریش، وەک « ئیبن موقەفا »، لە سەر ڕاستییپەرستیی، بە شمشێر شەقوپەقکرێن! «3»
دەیا، تا ئەو ڕۆژانە دێ، هەر چاوەڕوانبین و وەک « نالیی » بلیمەت بڵێن:
خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خودا کەی بێ!

ستۆکهۆلم
2005. 03. 21

* * *

---

1. لێرەدا نامەوێ، ناوی کەس بێنم و کەس بریندارکەم. چونکە، هەر کەسێ ئازادە، چۆن دەژی. ئەگینا، « ڕووناکبیر، نووسەر، هۆنەر و هونەرمەند »ی کورد زۆرن، ئەم باسانە، لەگەڵ جۆری بیرکردنەوە، شێوازی ژیان و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیدا بگونجێ!
2. انا الحق.
3. جێنشینی دەوڵەتی « عەبباسیی ـ هاروونە ڕەشید » کوشتی.

# « چاوپێکەوتن »

## هونەر + وێژە - پارتایەتیی = ڕاژەکردنی گەل

پ1. خۆتان چۆن بە خوێنەوارانی « ئاڤەشین » دەناسێنن؟

و1. ئەز، ناوم « حوسێن محەمەد عەزیز »ە. کاتی خۆی باوکم، لە نەخۆشخانە برینپێچ بووە. سالی « 1949 »، لە شارۆچکەی « پێنجوین » کاریکردووە. منیش، سالی « 1950 » لەوێ لەدایکبووم. بەلام، زۆری لێ نەماوینەتەوە و هەر لە هەمان سالدا گەڕاوینەتەوە. لەبەرئەوە، هەموو ژیانی خۆم، هەر لە شاری « سولەیمانیی » بەسەربردووە، لە کۆشی بنەمالەیەکی موسولمان و مامناوەندیی ناسراوی شارەکەدا، پەروەدەکراوم و گەورەبووم.

هەموو قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی، نێوەندیی و ئامادەیی کشتوکالم، لە « سولەیمانیی » تەواوکردووە. سالی « 1971 »، لە زانکۆی « سولەیمانیی »، لە کۆلێژی کشتوکال وەرگیرام. لەبەرئەوەی، سالی « 1974 - 1975 »، لە شۆڕشی « 11/سێپتێمبەر/1961 »دا پێشمەرگەبووم، کۆلێژی کشتوکالم، بە پێنج سال تەواوکرد، بەلام، یەکێ لە خوێندکارە باشەکان بووم، لەبەرئەوە، لە هەمان کۆلێژ دامەزرام و بۆ ماوەی پێنج سال، مامۆستا بووم.

سالی « 1981 »، لە بەر جەنگی نێوخۆ و بارودۆخی خراپی ئەو سەردەمەی « باشووری کوردستان »، ناچاربووم، ڕوو لە دەرەوەی وولات بکەم. لە کۆتایی هەمان سالدا، بە هۆی چەن برادەرێکی دلسۆز و لە ڕێی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »ەوە، لە « یەکێتی سۆڤێت » وەرگیرام و وەک خوێندکارێکی خوێندنی بالا، دەسم بە خوێندن کرد. ماوەی نۆ سال لەوێ مامەوە. پاشان، دوکتۆرام لە زانستی کشتوکالدا وەرگرت. لە سەرەتای سالی « 1990 »یشەوە، بە تەواویی، لە وولاتی « سوید » نیشتەجێبووم.

پ2. لە کەیەوە دەستان بە خوێندنەوە و نووسین کردووە؟
و2. ساڵی « 1958 »، جارێکی دیکە، باوکم گەڕایەوە بۆ « پێنجوین » و نزیکەی سێ ساڵ لەوێ مایەنەوە. ئەو کاتەی لەوێ بووین، باوکم، ئەندامی لیژنەی نێوچەی « پارتی دێموکراتی کوردستانی ـ عێراق » بوو. هەرچەندە نەشیدەخوێندەوە، بەڵام، لەبەرئەوەی « پارتیی » بوو، گەلێ جار، نامیلکە، پەرتووک، گۆڤار و ڕۆژنامەی دەکڕی و دەیهێنایەوە. یەکێ لەو گۆڤارانە، ناوی « ڕۆژی نوێ » بوو. زۆرم حەز لە خوێندنەوەی دەکرد. چونکە، باسی مێژووی کوردی تێدا دەنووسرا، گەلێ هۆنراوە و فۆلکلۆری کوردییشی بڵاودەکردەوە، لەبەرئەوەی، زۆربەی ئەو هۆنراوە و فۆلکلۆرانەم، بە گۆرانیی بیستبوو، زۆرم حەز لێ دەکردن، هەموو جارێ، بە پەرۆشەوە، چاوەڕوانی ژمارەی نوێم دەکرد و زۆر بە تامەزرۆییەوە دەمخوێندنەوە.
کاتێ شۆڕشی ساڵی « 1961 » دەسپێکرد، بە هۆی چالاکیی ڕامیارییەوە، باوکم لە « پێنجوین »ەوە بۆ « سولەیمانیی » گوازرایەوە. ئیدی، ئەوێمان بەجێهێشت و بە ماڵەوە گەڕاینەوە بۆ « سولەیمانیی ». دوای ئەوەی، خوێندنی سەرەتاییم تەواوکرد، لە خوێندنگەی نێوەندیی « شۆڕش » وەرگیرام. بێ گومان، خوێندنمان بە زمانی عەرەبیی بوو. لەبەرئەوە، گۆڕانێکی گەلێ گەورە، لە ژیانی منداڵییمدا ڕوویدا. چونکە، زمانی عەرەبییم باش نەدەزانی. مامۆستایەکی زمانی عەرەبییمان هەبوو، ناوی « مستەفا شەریف » بوو، گەلێ زیرەکبوو. زۆر جار، لە وانەی پەخشان و چیرۆکدا، بەو دەنگە هێمن و بە سۆزەی خۆی، چیرۆکی « ئەلبوئەسا »ی « ڤیکتۆر هیگۆ »ی بە عەرەبیی بۆ دەخوێنینەوە و بە کوردیش بۆی لێکدەداینەوە. لەبەرئەوە، ئەو مامۆستایە، هێندە کاری تێ کردم، تا وام لێهات، هێندێ کاتی خۆم، بۆ خوێندنەوەی چەن چیرۆکێکی ئاسان، بە زمانی عەرەبیی تەرخانکەم. ئیدی بەو شێوەیە، هەر لەو تەمەنەوە، هۆگری خوێندنەوە بووم.
جگە لەوەی، خۆشم لە ڕیزی « یەکێتی قوتابیانی کوردستان ـ عێراق » و دواتریش، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا کارمدەکرد، هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیانم بە شێوەیەکی بەردەوام دەخوێندەوە. بەڵام، دوای ڕێککەوتننامەی « 11/مارسی/1970 »، بە تایبەتیی، ئەو ساڵە خوێندنی ئامادەیی کشتوکاڵم تەواوکردبوو، بێ کاربووم، لە « یەکێتی جوتیارانی کوردستان » و « لیژنەی نێوچەی پارتیی ـ سولەیمانیی »، کاری چاپم دەکرد، زۆربەی کاتی خۆم، بە خوێندنەوەوە بەسەردەبرد. بەو شێوەیە، دەسم بە خوێندنەوە کرد و تا ئەوڕۆش، هەر بەردەوامم.

ـ ئەدی نووسین؟
× دەربارەی نووسین، ساڵی « 1972 » هەوڵمدا، بنووسم. سەرەتا، چەن گوتارێکم نووسی و لە ڕۆژنامەی « برایەتی » و گۆڤاری « ئەستێرە »ی منداڵاندا بڵاوکرانەوە. ئەوەی پتر هانیدام، لە سەر خوێندنەوە و نووسین سووربم، ئەوە بوو، لە کۆتایی ساڵی « 1970 »دا، لە نزیکەوە، ئاشنایەتیم لەگەڵ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی نەتەوەییدا پەیداکرد. ئەو ڕێکخراوەش، ناوی « کاژیک » بوو. ئەوان، زۆر هانیاندەدام، بخوێنمەوە، خۆم پێبگەیەنم و ئاستی ڕووناکبیریی خۆم بەرزکەمەوە. بە داخەوە، مەگەر جاروبار، گوتارێکم بۆ ئەو ڕێکخراوە نووسیبێ، ئەگینا، هەر زوو وازم لە نووسین هێنا. بەلام، لەگەڵ خوێندنەوەدا، هەمیشە دۆستایەتییمان خۆشبوو. بە تایبەتیی، دوای کارەساتە نەتەوەییەکەی هەرەسی ساڵی « 1975 »، بەرنامەیەکی تایبەتییم، بۆ خوێندنەوە دانا، پتر بەرهەمەکانی « مارکسیزم »م دەخوێندەوە.
کاتێ گەیشتمە « سۆڤێت »یش، زمانی « ڕووسیی »، بە باشی فێربووم، ئیدی، هەرچیم دەسکەوتایە، « کوردیی، عەرەبیی و ڕووسیی »، درێغیم لە خوێندنەوەیان نەدەکرد. هەر لەوێش، لە نزیکەوە، شارەزاییەکی تەواوم، لە بیروباوەڕی « کۆمۆنیزم »دا پەیداکرد. چونکە، جگە لەوەی ئەو بابەتانەمان، لە قۆناغی خوێندنی باڵای ماجستێر و دوکتۆرادا دەخوێند، خۆشم هەمیشە، عەوداڵ و تینووی زانیاریی پتر بووم. ساڵی « 1990 »یش، کاتێ لە « سوید » دامەزرام، ئیدی، بە تەواویی، دەسم بەتاڵبوو. زۆربەی کاتی خۆم، بۆ خوێندنەوە و نووسین تەرخانکرد.
ــ زیاتر چ بابەتێ دەخوێننەوە؟
× هەرچی بە چاکی بزانم و بەکەڵک بێ، دەیخوێنمەوە. وەک: « وێژە، مێژوو، جوگرافیا، پۆلیتیک ... تاد ».
ـ ئایا فریای خوێندنەوەی، ئەو هەموو بابەتانە دەکەون؟
× لەبەرئەوەی کار ناکەم، فریای هەموو شتێ دەکەوم.
پ3. کاتی خۆتان، چۆن دابەشدەکەن؟
و3. هەموو ڕۆژێ، کاژێری حەوت یا زووتر، لە خەو هەڵدەستم. گەر کاری لابەلا یەخەم نەگرێ و لە ماڵ دەر نەچم، ئەوا، سەر لە بەیانیانم بۆ نووسین و خوێندنەوە تەرخانکردووە. دوای بەرچایی دەخوێنمەوە و هێندێ جاریش، لە سەر نووسین بەردەوامدەبم. پاش نیوەڕوانیش، خەریکی کۆمپیوتەرەکەم دەبم و دەس بە نووسین دەکەم. بە لانی کەمەوە، ڕۆژی « 8 - 10 » کاژێر کاردەکەم. بەلام، زۆربەی کاتی ئێواران و شەوان، گوێ لە دەنگوباسی ڕادیۆ دەگرم و

تەماشای بەرنامەی تێلێفیزیۆنەکان دەکەم. لەبەرئەوەی، خەوم زۆر کەمە، زۆربەی بابەتەکانم، بە شەو دەنووسم. شەوی وا هەبووە، تا بەرەبەیان دانیشتووم و هەر خەریکی خوێندنەوە و نووسین بووم.

پ4. یەکەم بەرهەمتان چی بوو؟

و4. یەکەم جار، بە گوتار دەسمپێکرد. یەکەم گوتاریشم، ناوی « بەرەو ئازادیی » بوو، لە ژمارە دووی گۆڤاری « ڕابوون »ی ساڵی « 1991 »دا بڵاوکرایەوە. پاشان، بە تەواویی خۆم کۆکردەوە، لە ماوەی سێ ساڵدا، دوو پەرتووکم نووسی. یەکەمیان: ناوی « ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا » بوو، لە هاوینی « 1993 »دا، لە شاری « سولەیمانیی »، لە سەر گیرفانی خۆم چاپمکرد و وەک دیارییەک، بە سەر دۆست و نووسەرەکانی شاردا دابەشم کرد. دووەمیشیان: « کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی » بوو. بەداخەوە، لە بەر بێ پارەیی نەمتوانی، لە هەمان ساڵدا چاپیکەم، بەڵکوو دواکەوت و یەکەمین چاپی، لە سەرەتای ساڵی « 1996 » و لە « سوید » بڵاو کرایەوە.

پ5. تا ئێستە، چەن بەرهەمتان چاپکردووە؟

و5. جگە لەو گوتارانەی لە « کوردستان » و دەرەوەی وولات بڵاومکردونەتەوە، دوازدە نامیلکە و پەرتووکم چاپکردووە. «1»

ـ دەتوانن ناونیشانەکانیانمان بۆ بژمێرن؟

ـ بەڵێ. بەپێی مێژووی چاپکردنیان، ئەمانەن: « ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا، دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، دوا پرۆژە، پێنج ووتاری غەمگین، دیمۆکراسیی و ئایدۆلۆژیی و جەنگی نێوخۆ، نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، فیدراڵیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، بەڵێ ڕەخنە و لێکۆڵینەوە نەک شێواندنی ڕاستیی، خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا و ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا ».

پ6. کام بەرهەمەتان لە هەموویان زیاتر خۆشدەوێ؟

و6. جگە لەوەی، هەر یەکەیان باسی بابەتێکی جیاواز دەکا، شەونخونییەکی زۆریشم، لەگەڵ هەموویاندا کێشاوە. لەبەرئەوە، هەموویانم خۆشدەوێ. دەتوانم، بڵێم: بەرهەمەکانم، وەک پەنجەکانی دەس وان. تەنانەت، پەنجەکانی دەسیش، هەموویان وەک یەک نین. هێندێکیان کورت و هێندێکی دیکەیان درێژن، هێندێکیان باریک و هێندێکی دیکەیان ئەستوورن، هەر یەکەشیان توانا و هێزێکی تایبەتییان هەیە و کارێکی دیارییکراویان پێ ئەنجامدەدرێ. بەڵام، بە هەموویان پێکەوە، یەک دەس پێکدێنن، کە هێز و توانایەکی تایبەتیی

به مرۆڤ دەبەخشێ و کارەکانیشی باشتر ڕادەپەڕێندرێ. خۆ گەر بڵێم: وەک کۆرپەیەکی نۆبەرە، « ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا »، بە تایبەتیی، دووەمین چاپی، لە هەموو ئەوانی دیکەم خۆشتردەوێ، سەیرت لێ نەیە!
ــ هیچ بەرهەمی نوێتان بە دەسەوەیە؟
× بەڵێ. جگە لەوەی، لە ماوەی ئەم دوو مانگەی دواییدا، دە گوتاری جۆربەجۆری نوێم نووسیوە، پرۆژەیەکی گەورەم ئامادەکردووە. لەو باوەڕەدام، تا کۆتایی ئەم سەدەیە، تەواویبکەم.
ــ دەتوانین، شتێ دەربارەی ئەو پرۆژەیە بزانین؟
× بەڵێ. پرۆژەکە، لە چەن کۆڵینەوەیەکی جیاواز پێکهاتووە. وەک کۆڵینەوەی « زمانەوانیی، وێژەیی، جیۆپۆلێتیکی کوردستان، بیری ناسیۆنالیزم، ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کورددا ». جگە لە یاداشت و باسێ لە سەر تێکۆشانی « کاژیک » و « پاسۆک » و هێندێ بابەتی دیکەش هەن. بەڵام نازانم، گەر لە پڕ، هێندێ بابەتی دیکەم لا دروستبێ، ئەوا لەوانەیە، پرۆژەکە گەورەتربێ. کەسێ نەمرێ، هەموویان دەبینێ. منیش هەوڵدەدەم، وردەوردە، لەبەرەوە چاپیانکەم و بڵاویانکەمەوە.
پ7. باسی زمانەوانییتان کرد، بیر و ڕاتان، دەربارەی زمانی کوردیی و گرفتەکانی چییە؟
و7. دیارە لێرەدا، کاتی ئەوەمان نییە، بە تێروتەسەلیی، وەڵامی ئەو پرسیارەتان بدەمەوە، چونکە وەک دەڵێن: ئەو هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ!
هەروەها، وەک گوتم: پەرتووکێکم لە سەر ئەو باسە بە دەسەوەیە، نزیکەی سێ ساڵ دەبێ، خەریکیم، نیازم وایە، ساڵی داهاتوو بڵاویکەمەوە. لێرەدا دەتوانم، هەر هێندە بڵێم: هەرچەندە، زمانی کوردیی، گەلێ گرفتی گەورەی هەیە، بەڵام، وەک هەموو شتێکی دیکەی زیندوو لەم جیهانەدا، ڕۆژبەڕۆژ، بەرەو پێشکەوتن دەڕوا و لە دەس هێندێ لە گرفتەکانی ڕزگاریدەبێ. گرنگترین گرفتێ کە زمانی کوردیی بە تایبەتیی و نەتەوەی کورد بە گشتیی، دووچاریبووبێ، ئەوەیە: کورد خاوەنی دەوڵەتێکی ناسیۆنالی تایبەتیی خۆی نییە، تا بە تەواویی، هەموو گرفتەکانی « زمان، فەرهەنگ، مێژوو، جوگرافیا، زانست و ژیانی کۆمەلایەتیی کۆمەلانی خەڵک » چارەسەرکا و پێشیخا. بە باوەڕی من، کەی ئەو دەوڵەتە لە « کوردستان » دامەزرا، زۆربەی زۆری گرفتەکان، وەک بەفرەکەی پار، وردەوردە دەتوێنەوە.
پ8. ڕاتان بەرانبەر بزووتنەوەی ڕووناکبیریی کوردیی، لە دەرەوەی وڵات چییە؟

و8. ئەز پێموایە، جموجۆڵ و چالاکییەکی باش هەیە. هەر بە چەن مانگ جارێ، چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردیی دەردەچێ. هەروەها ساڵانەش، گەلێ نامیلکە و پەرتووکی کوردیی نایاب، لە وولاتە جیاجیاکانی هەندەران چاپدەکرێن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دیسانەوە گرفتەکان زۆرن. لە هەموویان زەقتر و گرنگتر، خۆی لە ئیرەیی، ناکۆکیی، دووبەرەکیی، پەرشوبڵاویی و نەگونجاندنی ڕووناکبیران و نووسەرانی کورددا دەبینێ. چونکە، ڕۆشنبیران یەکگرتوو نین، پێوەندیی کۆمەڵایەتییان گەلێ لاوازە، کەم ڕووناکبیر پێکەوە هەڵدەکەن، جگە لەوەی ناتوانن، لە دەوری یەکێتییەکی نووسەران کۆبنەوە، ڕێکخراوە ڕامیارییەکانیش، هێندەی دیکە، ڕیزەکانی ڕووناکبیرانی کوردیان لەتوپەتکردووە و لە یەکدیان دابڕیوون. «2»
سەرەڕای ئەوەی، بەرهەمێکی زۆریش هەیە، بەڵام، بازاڕی چاپەمەنی کوردیی گەلێ کزولاوازە، چونکە، ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد کەم دەخوێننەوە و پارە بە چاپەمەنیی کوردیی نادەن. لەبەرئەوە دەبینین: زۆربەی ئەو گۆڤارانەی دەردەچن، لە بەر بێ دەرامەتیی، دوای ماوەیە دەوەستن.
بە داخەوە، بەرهەمەکانیش زۆر بە کەمیی و هەزار بە شەرەشەق، دەگەنەوە « کوردستان ». چونکە، ڕێی هاتوچۆ باش نییە و خەڵکیی، لە ترسی کۆنترۆڵی دەوڵەتە داگیرکەرەکان، زۆر ناوێرن، بیانبەنەوە.
پ9. لەگەڵ جیهانی هۆنراوەدا چۆنی دەگوزەرێنن؟ ئایا، کام هۆنەری کوردتان، لە هەموویان پێ باشترە؟
پ9. جاروبار، هۆنراوەش دەخوێنمەوە، بە تایبەتیی، هۆنراوە کلاسیکییەکان، چێژێکی بێ ئەندازەیان لێ وەردەگرم. سوپاس بۆ خوا، هێندەی کورد لە هۆنراوەدا دەوڵەمەندە، هێندە لە بوارەکانی دیکەی هونەر و وێژەدا دەوڵەمەند نییە. بۆیە « شێخ ڕەزای تاڵەبانیی » فەرموویەتی:

چونکە، شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا
بۆتە حەشری نێرەکەر، لەم حوجرەدا

ئەز پێموایە، گەر لە دەشتە پانوبەرینە ڕازاوەکەی باخچەی کوردییدا، بە دەیان خونچەگوڵ، هەڵاڵە و بەیبوونی بۆنخۆشی هۆنەرە لاوەکان، سەریان دەرهێنابێ، ئەوا، لە هەموو سەردەمێکدا، هەمیشە، چەندین لوتکە چیای بەرز، لە نێوەڕاستی ئەو دەشتە پانوبەرینەدا، وەک کەڵەهۆنەری کورد هەڵکەوتوون و دەرکەوتوون، لاقیان بە توندیی، لە سەر زەویی قایمکردووە و سەریشیان، لە حەوت تەبەقەی ئاسمانی هونەر و وێژەی کوردیی توندکردووە. هەر بۆ نموونە: لەو سەردەمانەی، چەندین هۆنەری پایەبەرزی کوردی تێدا

ژیاون، وەک: « خانیی، جزیریی، نالیی، مەحویی، حاجی قادری کۆیی » و تا بە « گۆران »ی بلیمەت دەگا، بە دەیان هۆنەری دیکەش هەبوون، بەلام، ناو و بەرهەمەکانیان، لەچاو ئەو هۆنەرە هەلکەوتووانەدا، تەنیا لە پەراوێزی مێژووی وێژەی کوردییدا، جێی خۆیان کردۆتەوە. هەر زۆر دوور نەڕۆین، لە شاکارە پڕ بایەخەکەی مامۆستا « عەلادین سەجادیی ــ مێژووی ئەدەبی کوردی »دا، مامۆستا، بە دووروردرێژیی، لە مێژووی ژیان و بەرهەمی هێندێ لە هۆنەرە بەنێوبانگەکانی کوردی کۆلیوەتەوە و لە سەری نووسیون، کەچیی، هەر لەو سەردەمانەی ئەوانیشدا، بە دەیان هۆنەری دیکە هەبوون، بەلام، ناو و نیشانیان، تەنیا لە پاشکۆی پەرتووکەکەدا، بە ڕیز تۆمارکراوون.

ــ ئەو لوتکە گەورەیە، » لای ئێوە کێیە؟

× ئەو لوتکە گەورەیە، لە زیندووەکاندا، لە « شێرکۆ بێکەس »دا دەبینم. وەک لە مێژە بە خۆشیم گوتووە، گەر هێندێ هۆنراوەی ڕامیاریی لێ دەرکەین، سەرجەمی هۆنراوەکانی دیکەی، وەک قەدیفەی پارچە چیمەنێکی سەوزی تەڕی بەهاری گوێی چەمەکانی « کوردستان » وان، ڕۆشنایی و فێنکایی، بە چاو، دڵ، دەروون و گیانی خوێنەر دەدەن.

کاک « شێرکۆ »، هێندە بە توانایە، یاری بە ووشە دەکا، هێندە لە هونەری هۆنراوەدا، هونەرمەندێکی کارامە، شارەزا و سەرکەوتووە، هۆنراوەکان، لە ئاستی داهێنانەکانیدا، بە چۆکدا دێن. «3»

ــ ئەدی لە مردووەکاندا؟

× « هێمن »، لە هەموو بوارەکانی هۆنراوە و پەخشاندا لووتکە بوو.

پ10. ئەدی لەگەڵ « **Medtv** »دا نێوانتان چۆنە؟

و10. بڕواتان هەبێ، من و « **Medtv** »، وەک دوو ئەویندار واین، هێندە نێوانمان خۆشە، بێ یەکدی ناژین. گەر هەموو ڕۆژێ، چەن کاژێرێ، چاوم بە ڕەنگە زەرد، سوور، سەوز و سپییەکەی ڕۆشن نەبێتەوە، وا دەزانم، شتێکی زۆر گرنگم لێ گومبووە. هەر بۆیە، سالی پاریش، پەخشانێکی تەڕ و بڕم بۆ نووسی.

ــ با واز لە خوێندنەوە و نووسین بێنین. دەلێی چی، گەر ئەم جارەیان، پێکەوە سەرێ لە باخچەی هونەر بدەین؟

× فەرموو.

پ11. پێوەندییتان لەگەڵ هونەری شانۆدا چۆنە؟

و11. بە داخەوە، پێوەندییم زۆر باش نییە. چونکە، لە هەموو ژیانمدا، ئەوەی زۆر حەزم لێ نەکردبێ، ئەو بەشە گرنگەی هونەر بووە. بەلام، تا لە شـــاری

« سولەیمانیی » بووم، بە هۆی تێلێفیزیۆنی کوردیی « کەرکووک »ەوە، گەلێ شانۆگەریی جوان و ناوەڕۆک دەوڵەمەندم دەبینی، وەک: « لانەوازان، خولە چەخماخە، جەنابی موفەتیش ... » پاریش لە « سولەیمانیی »، برایانی تیپی شانۆی « پێشڕەوی کوردیی » داوەتیانکردم، بە تایبەتیی، شانۆگەریی « ئەحەی کڕنوو »یان بە ڤیدیۆ پیشاندام. بە لامەوە زۆر باشبوو.
ـ کام ئەکتەرتان، لە هەموو ئەکتەرە کوردەکانی دیکە پێ باشترە؟
× سەرەڕای ئەو هەموو دواکەوتوویی، ژێردەستیی، چەوساندنەوە و نەبوونی ئازادییە، هەمیشە بەشی خۆمان، ئەکتەری باشمان هەبووە و هەیە. لای من خوالێخۆشبوو « کەمال سابیر »، یەکێ لە ئەکتەرە هەرە باشەکانی کورد بوو، چونکە، کاتێ لە هەر شانۆگەرییەکدا دەردەکەوت، مرۆڤ هەستی پێ نەدەکرد، بەرانبەرت دانیشتووە و قسەت بۆ دەکا، یا، لەسەر شانۆ ڕۆڵ دەبینێ؟ بە شێوەیە ئەو ڕۆڵەی دەبینی، قسەکانی لە دەرەوەی شانۆ و لە سەر شانۆ، زۆر لە یەکدی جیا نەدەکرانەوە، ئاوێتەی یەکدی بووبوون، نەک هەر وەک خۆی و سێبەرەکەی وابوون، بەڵکوو، هەردووکیان هەر یەک شت بوون. بە ڕاستیی ڕۆڵێکی جوانی دەبینی،
ـ ئەدی ئەوڕۆ کێتان پێ باشە؟
× ئەوڕۆ، ئومێدێکی زۆر گەورەم، بە « ئازادی حەمە پچکۆڵ » هەیە، گەر دوای مەرگی هەر دوو هونەرمەند « عوسمان چێوار » و « کەمال سابیر »، تاقەتی هیچی مابێ! ئەگینا لای من، لە هەموو ئەکتەرەکانی دیکە پتر، بە توانا و بە هەڵوێستترە. مامۆستا « ئەحمەد سالار »یش، هونەرمەندێکی گەورەیە و گاڵتەی پێ ناکرێ. بەڵام ئاخ، خۆزگەم، هەموو کاتی خۆی، تەنیا بۆ هونەرەکەی تەرخاندەکرد!
پ12. ئەدی دەربارەی مۆزیک و گۆرانیی کوردیی دەڵێین چی؟
و12. هەر لە منداڵییەوە، زەوقێکی زۆرم، لەگەڵ مۆزیک و گۆرانیی کوردییدا هەبووە. جگە لەوەی، حەزیشم لێ کردوون، زۆربەی گۆرانییەکانیشم، لەبەربوون. کاتێ لەگەڵ برادەرە خۆشەویستەکانمدا کۆ دەبووینەوە، بەو دەنگە گڕەی خۆم، مێشکم دەبردن.
بێ گومان گۆرانیی، لە چەن بەشێکی گرنگ پێکدێ: هۆنراوە، ئاواز، مۆزیک و دەنگ. پێموایە، گەر ئەو چوار بابەتە بە تەواویی، یەک نەگرن و پێکەوە نەگونجێن، ئەوا گۆرانییەکە هاوئاهەنگ و سەرکەوتوو نابێ، جێی خۆشی لە دڵی جەماوەری گوێگراندا ناکاتەوە. جگە لەوەی، ئەز حسێبێکی زۆریش، بۆ ڕەوشت و هەڵوێستی هونەرمەندەکە دەکەم، تا هونەرمەندەکە، پلەوپایە و

ناووناوبانگی، لە نێو کۆمەڵدا باشبێ، هونەرەکەیم لا شیرینتر و سەنگینتر دەبێ. ئەو هونەرمەندەم خۆشدەوێ، ڕێزی خۆی و هونەرەکەی بگرێ، ساکار و بێ فیزبێ، هەڵوێستی هەبێ، هونەرەکەی لە پێناوی ڕاژەکردنی نەتەوەکەیدا دانێ، نەک هونەرەکەی، بۆ مەبەستی تایبەتیی خۆی بەکاربێنێ.
ـ کەواتە، دەنگی کێتان زۆر پێ خۆشە؟
× حەز ناکەم، خۆم بۆ کەس بخەڵەتێنم و درۆ لەگەڵ خۆمدا بکەم. بڕوام بە چی هەبێ و چی بە ڕاست بزانم، تەنیا بەو شێوەیە دەدوێم. لە هەموو ژیانمدا حەزم لە دەستیاو نەکردووە. کاتێ لێرەدا، ناوی هێندێ هۆنەر، نووسەر و هونەرمەند دێنم و ناوی هێندێکی دیکەیان ناهێنم، مەبەستم ئەوە نییە، لە هەوڵوتەقەلا، ماندوبوون و پلەوپایەیان کەمکەمەوە، هەموو هونەرمەندانی کورد، بە گوێرەی توانای خۆیان، ڕاژەی هونەری نەتەوەکەیان کردووە و بە شێوەیەکی بەردەوامیش دەیکەن. بەڵام، خۆ ناشکرێ، لێرەدا، ناوی هەرچی هۆنەر و نووسەر و هونەرمەندانی کورد هەیە، ڕیزیانکەم. هەموو یەکێ، تەنیا باسی ئەو نووسەر و هونەرمەندانە دەکا، کە زۆر کاریتێکردووە. ئەگینا هەموو هونەرمەندێ، گەر هەموو بەرهەمەکانیشیم بە دڵ نەبێ، ئەوا چەن بەرهەمێکی وای هەیە، جێی شیاوی خۆیان، لە ڕیزی پێشەوەی کاراونی هونەر و وێژەی کوردییدا کردبێتەوە، بەڵام لە ڕاستییدا، هێندەی لە ژیانمدا، هۆگری دەنگە بەسۆزەکەی مامۆستایان « حەسەن زیرەک » و « حەمەی ماملێ » بووم، هێندە هۆگری دەنگی هیچ کەسێکی دیکە نەبووم.
– حەزتان لە چ جۆرە گۆرانییەکە؟
× حەز لە هەموو جۆرە گۆرانییەکی ڕەسەنی کوردیی دەکەم. سەیرم لێدێ، هێندێ گۆرانیبێژ بە « توورکیی و فارسیی » گۆرانیی دەڵێن!
وابزانم، « حەسەن زیرەک »ی بلیمەت، لە هەموو ژیانیدا، گۆرانییەکی بە فارسیی نەگوتووە. بەڵام، گۆرانییە غەمگینەکان، پتر کار لە دەماری هەست و هۆشم دەکەن، بە تایبەتیی، دەنگی هەر دوو مامۆستای گەورەی شادڕەوان: « ڕەفیق چالاک » و « ساڵح دیلان »، بە تەواویی مەستمدەکەن.
ـ لە نێو هونەرمەندە لاوەکاندا، دەنگی کامیان پتر کاری تێکردوون؟
× هەموو گۆرانییبێژە لاوەکان، چەن گۆرانییەکی باشیان هەیە، زۆرم پێ خۆشن. بۆ نموونە: « میدیا، بەهجەت یەحیا، عەدنان کەریم، بورهان مەجید، زەکەریا، لەیلا فەریقیی، چۆپیی، حەسەن دەرزی، خەلیلی مەولانایی ... »، چەن گۆرانییەکیان هەیە، جیامکردوونەتەوە و لە سەر کاسێتێکی تایبەتیی تۆمارمکردوون، بە هەر لایەکدا کۆچبکەم، لەگەڵ خۆمدا دەمیانبەم و گوێیان لێ

دەگرم. تەنانەت، ئەو کاسێتانە، هێندە خۆشن، ئەو ماڵانەی میوانیشیان بووم، لایان خۆشبووە و لەبەریان گرتۆتەوە.
پ13. بە ڕای بەڕێزتان، گۆرانیبێژەکانی کورد بە گشتیی، تا چەن توانیویانە، لە ڕێی هونەرەکەیانەوە، لەگەڵ ئازاری نەتەوەکەیاندا بژین؟
و13. باری ژێردەسیی و چەوساندنەوەی نەتەوەیی لە « کوردستان »دا، وای لە هونەرمەندانی کورد کردووە، هونەر و ژان تێکەڵ بە یەکدی بکەن. کەم هونەرمەندی کورد هەیە، باری نالەباری « کوردستان »ی کیمیاویی، گازی ژاراویی و ئەنفالەکان، وەک زەردەواڵە، زیڕەی لێ هەڵ نەستاندبێ و چزووی ژانێکی گەورەی، لە قووڵایی دڵ و دەروونی نەچەقاندبێ، سوێی بە دڵدا نەکردبێ، خەمێکی گەورەی لا دروست نەکردبێ، شەوانە بە دەم فرمێسکی گەرم و هەناسەی ساردەوە، تا بەرەبەیان، لە نێو دارەمەیتی پێخەفەکەیدا، دەیان تلی پێ نەدابێ. بۆیە، کەم هونەرمەند هەیە، لە ناخەوە، کارێکی هونەریی پێشکەش بە کورد نەکردبێ.
پ14. دوا پرسیارمان ئەوەیە، بەرهەمی هونەرمەندانی کورد، لەگەڵ بەرهەمی نووسەراندا چۆن بەراوردەکەن؟
و14. بۆ ئەوەی، وەڵامی ئەم پرسیارەتان بدەمەوە و کەمێ ئاسانتربێ، چەن نموونەیەکتان بۆ دێنمەوە.
ئەز پێموایە: کاتێ « شڤان »، بە دەنگە بەرزە بە سۆزەکەی خۆی، شین بۆ « هەڵەبجە »ی شەهید دەکا و دەلاوێنێتەوە، هێندەی ئەو لاواندنەوەیە، کاری لە گیانم کردووم، هۆنراوەی هیچ هۆنەرێ، هێندە کاری لە تەلی هەست و سۆزم نەکردووە!
هێندەی « بەهجەت یەحیا »، بە قورگە زێڕینەکەی خۆی، هاواری بۆ چل منداڵی شەهیدی شارەکەم کردووە و دڵۆپە فرمێسکی گەرمی پێ هەڵڕشتووم، چیرۆکی هیچ چیرۆکنووسێ، هێندە نەیهەژاندووم!
هێندەی « عەدنان کەریم »، بە دەنگە هێمن و کاریگەرەکەی خۆی، بۆ منداڵانی « هەڵەبجە » گریاوە و دژی جەنگی نێوخۆ نارەزایی خۆی دەربڕیوە، گوتاری ڕامیاریی هیچ گوتارنووسێ، هێندە ئارامیان، بە جەستەی شەکەت، گیانی وەڕس و ویژدانی بێ ئارامم نەداوە!
هێندەی « مەزهەری خالقیی »، بە دەنگە فێنکە ئەفسوناوییەکەی خۆی، بۆ وڵاتەکەی خۆمم دەگێڕێتەوە، هێندە گفتولفتی هیچ سەرکردەیەکی کورد، گەشبینییان پێ نەبەخشیووم، ئومێدی سەرکەوتن و « کوردستان »ێکی ئاوەدانیان، لا دروست نەکردووم!

بۆیە، لە کۆتاییدا دەڵێم: هێندەی ئەو دەنگە بە سۆزانە، سەرنجیان بە لای خۆیاندا ڕاکێشاوم، بێشکەی دڵیان ڕاژەندووم، لایەلایەیان بۆ گیانی شەکەتم کردووە، ئاوپرژێنی دڵ و دەروونە بریندارەکەیان کردووم، هێندە هیچ پێنووسێ، کاری لە ناخی دڵ و دەروون، قووڵایی هەست و هۆش، هەموو ویژدانی زیندووم نەکردووە، هێندە هیچ نووسەرێ نەیهەژاندووم، بەرەو وڵاتی بەفر و خوێن نەیبردوومەتەوە.
ـ لە کۆتاییدا سوپاستاندەکەین، بۆ ئەو ئامادەبوون و هاوکارییەتان.
× شایانی نییە.

* * *

---

**تێبینی:**

1. تا ئێستە، بەم بەرهەمەوە، « 30 » نامیلکە و پەرتووکم چاپکردووە. لە لیستی نامیلکە و پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر و لە کۆتایی ئەم بەرهەمەدا هەیە.
2. زۆر هەوڵمدا، هێندێ نووسەر و هونەر، لە دەوری بازنەیەکی کەلتووریی کۆکەمەوە، یا، یەکێتی نووسەران لە دەرەوەی وڵات دامەزرێنین. بەڵام، هیچ کەڵکی نەبوو. یەکێ لەو هەوڵانە لە « سوید » ، لەگەڵ چەن برایەکی نووسەری وەک: « فەرهاد شاکەلیی، کەریمی حیسامیی، حەکیم کاکەوەیس، ئالان ڕووبار ... »دا بوو. دوا هەوڵیشم، لەو بانگەوازەدا دەردەکەوێ، کە دوای ئەم چاوپێکەوتنە بڵاویدەکەمەوە.
3. ئەم بۆچوونە، بۆ حەوت ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە. چونکە، « شێرکۆ بێکەس » ، لە دوای بەرهەمی « دەربەندی پەپوولە »وە، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، کێرڤی داهێنانی بەرەو خوار ڕۆیشتووە.
4. ئەم چاوپێکەوتنە، ڕۆژی « 1997. 11. 07 » ، لە « ئینستیتووتی کوردیی » ، لە شاری « ستۆکهۆڵم » ، لە لایەن هاوڕێم « میرحەم »ەوە، بۆ گۆڤاری « ئاڤەشین » ئەنجامدراوە. بەڵام، بە ڕاستیی نازانم، لە چ ژمارەیەکدا بڵاویانکردۆتەوە. چونکە، گۆڤارەکە بە لاتینیی دەردەچوو، لە نێوان « سوید » و « ئەڵمانیا »دا، چاپ و بڵاودەکرایەوە، تا ئێستەش، بە دەسم نەگەیشتووە!

# بانگـــــەواز

ئاشکرایە، دەستـەی ڕووناکبیـر و نووسـەرانی هـەموو نەتەوەیەک، لە بواری گەشـەکردنی هەستی نەتەوەیی، هوشیـاری ڕامیاریی، بوژاندنـەوەی کەلەپوور، پێشکەوتنی ئاستـی کـەلتـووریی و کـۆمـەلایەتیـیـدا، ڕۆلێکی گـەلێ مـەزن و لەبەرچاو دەبیـنن. زۆربەی زۆری ئەو ڕووناکـبیـر و نووسـەرانە، لە هـەمـوو گۆڕانکارییـە گرنگەکانی وولاتەکـەیاندا بەشداردەبن، لە ڕۆژەڕەش و پڕ لە چەلەمـەکانی نەتـەوەکـەیاندا، وەک چرایەکی گـەش، ڕێ تاریکونوتەکـەکانی بەردەمی ڕۆلەکانیـان ڕۆشندەکـەنەوە. بە یەک دل و بە یەک گیـان، لە پێناوی سەربەخۆیی نیشتمانەکەیاندا تێدەکۆشن، هەمیشە، یەک ڕەنگ و یەک دەنگ، لە بوارە جیاجیاکانی تێکۆشانی میللییدا، خۆیان دەنوێنن و دەرگەی دەزگە نێو دەولەتییەکان دەکوتن.

بەلام بە داخـەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەوڕۆ نەتەوەی کورد، لەم مالاوایی سـەدەی بیستەمەدا، نیشتمانەکەی، لە لایەن داگیرکەرانەوە، داگیر و دابەشکراوە، لە هەموو ڕوویەکەوە، بە خراپترین شێوە دەچەوسێندرێتەوە، کەچیی هێشتا، ڕیزەکانی نەتەوەی کـورد یەکگرتوو نییە، هێشتا ڕێکخراوە ڕامیارییـەکانی «کوردسـتـان» لە نێوخۆدا تەبانین. لە هەمـان کـاتیـشـدا، ڕووناکـبیـر و نووسەرانی کوردیش، هەر یەکەیان لە ئاوازێ دەخوێنن، هەر دووان و سیانیان بە زوڕنایەکدا دەتوڕێنن! بۆیە وا بەو ڕۆژەڕەشە گەیشتووین، تا ئێستە ژێر دەسین، یەکنەگرتووین، دواکەوتووین، بە دڕندانەترین شێوە دەمانچەوسێننەوە و ناتوانین، داکۆکیی لە خۆمان بکەین. گەر کاریش بەو شێوە بڕوا، هەرگیزا و هەرگیز، هیچمان بە هیچ نابێ، هەر کردەی کورد و بردەی داگیرکەران دەبێ، یەک هەنگاو بۆ پێشەوە نانێین و ڕۆژبەڕۆژیش، بەرەوە دواوە دەگەڕێینەوە.

بە باوەڕی ئێمـە، ئەم کـەرتکەرتبـوون و لێکداپچـڕاندنەی ڕووناکـبیـر و نووسەرانی کورد، بۆ سێ هۆی سەرەکیی دەگەڕێتەوە.

1. دەوڵەتە داگیرکەرەکانی « کوردستان »، بە شێوەیەکی بەردەوام هەوڵیان داوە و هەوڵیشدەدەن، ڕیزەکانی نووسەرانی کورد تێکبدەن. تا ڕادەیەکی زۆریش، لەم بوارەدا سەرکەوتووبوون، گەلێ ناکۆکییان دروسیکردووە و گەلێ نووسەری خۆفرۆشیشیان کڕیوە.
2. پارتە ڕامیارییەکانی « کوردستان »، هەمیشە، لە هەڵپەی ئەوەدا بوون، ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، بە لای خۆیاندا ڕاکێشن، یا لە نێوان خۆیاندا دابەشیانکەن، تا لەو ڕێیانەوە، هێز و توانایان لێ ببڕن، دەنگیان لە گەروویاندا بتاسێنن، بۆ ئەوەی، سەربەخۆیی خۆیان لەدەسدەن.
ئەو ڕێکخراوانە، بە شێوەیە، کاریان لە یەکێتی ڕیزەکانی ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد کردووە، لە نێوخۆدا، زۆر ناکۆک، پچڕپچڕ و لاوازیان کردوون، کارێکیان بەسەرهێناون، وەک ئاو و ڕۆن، پێکەوە تێکەڵاونابن. بۆیە ئەوڕۆ دەبینین، لە سەرتاسەری « کوردستان »ی مەزن و دەرەوەی وولاتدا، یەکێتییەکی هونەریی، وێژەیی و ئەکادیمیی یەککگرتووی کوردیی بەدی ناکرێ، بەڵکوو، هەر ڕێکخراوێ بە جیا هەوڵدەدا، کۆمەڵەیەکی تایبەتیی، سەر بە ڕێکخراوەکەی خۆی دامەزرێنێ، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا، جگە لەوەی، ڕیزەکانی ڕووناکبیر و نووسەرانی کوردی لەتوپەتکردووە، لە بوارەکانی گوڕان و گەشەکردنی « نەتەوەیی، ڕامیاریی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی، کەلتووریی و فەرهەنگیی »شدا، قورساییەکی ئەوتۆیان نەماوە.
3. بەشێکی دیکەی ئەم بەرپرسیارییە مێژووییە، لە ئەستۆی ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد خۆیاندایە. ئەمانیش، بە شێوەیە لە شێوەکان، لەم پەرتپەرتیی، لێکدابڕان و هەڕاوئاژاوە بێسەروبەرەدا بەرپرسیارن. بۆیە، بە ڕاشکاویی دەڵێین: گەر نووسەرانی کورد، خۆیان یەککگرتووبوونایە، سەنگەری دوژمنایەتییان، لە یەکدی نەگرتایە، چەکی ووشەیان، ئاراستەی سنگی دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەرانی « کوردستان » بکردایە، ئەو کاتە شوێن پەنجەیان، بە ئاشکرا، لەم ماڵوێرانییەی ئەوڕۆی جیهانی وێژەی کوردییدا دیاردەبوو. بەڵام، سەد مەخابن، نووسەرانی کورد خۆیان، وەک ئاردی نێو دڕکیان لێهاتووە، ئەوڕۆ لە هەموو ڕۆژێ پتر، بە خۆڕایی شیر و تیر لە یەکدی دەسوون!
بەڵێ، ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، بە چەشنێ لە یەکدی دابڕاون و دوورکەوتوونەتەوە، کەمیان پێکەوە دەلکێن، تەنانەت وەک دەڵێن: لە « شەهادە و ئیمان »یشدا یەک نین! لەبەرئەوە لە لایەکەوە: پەیامە مێژووییە پیرۆزەکەی خۆیان لە بیرکردووە. لە لایەکی دیکەشەوە: هەموو ئەو خەسڵەتە خراپانەی،

بە یەکێ لە نیشانەکانی کۆمەڵگەی دواکەوتووی نیمچەدەرەبەگیی ـ دەرەبەگیی و خێڵەکیی دادەنرێ، خۆی لە « خۆخۆریی، گۆشەگیریی، کاری تەنیایی، پێکەوەنەگونجان، ئیرەیی، لەخۆباییبوون، دووڕوویی، دووزمانیی، هەلپەرستیی، کاسەلێسیی، ناکۆکیی، ناتەبایی، هەراوئاژاوە، گێرەشێوێنیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی »دا دەنوێنێ، پشتاوپشت وەک خەڵات بۆمان ماوەتەوە، لە بواری بزووتنەوەی ڕووناکبیریی، هونەریی، وێژەیی و کاری ئەکادیمییشدا، زۆر بە زەقی ڕەنگیانداوەتەوە. بە شێوەیە، کۆنەقین، ڕقوکینە، دڵڕەشیی، تووڕەیی، جنێودان و زمانپیسیی، بە ئاشکرا، جێی دڵپاکیی، نەرمونیانیی، خۆشەویستیی و زمانی دیالۆگی برایانەی گرتۆتەوە.

لەبەرئەوە، زۆر جار گەلێ شتی تاکەکەسیی، تێکەڵ بە کێشە گشتییەکان دەکەن. لە ژێر پەردەی ململانێی ئایدۆلۆژیا، خەباتی ڕامیاریی و پارتایەتییدا، دژایەتییەکی بێ تامی یەکدی دەکەن. هێندێ جار، لەوەشی تێدەپەڕێنن،

سووکایەتیی بە یەکدی دەکەن، کە ئەو هەڵسوکەوت و ڕەفتارانە، جێی داخ و کەسەرێکی زۆرە، وا لە کۆمەلانی خەڵک دەکا، قێزیان لە ووشەی کوردیی بێتەوە، ڕێز بۆ ڕووناکبیر و نووسەرانیش دانەنێن. لە کاتێکدا دەبووایە، ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، لەو خەسڵەتە خراپانە بەدووربوونایە و ئەو کارانەیان لێ نەوەشایەتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی، زۆربەی زۆری ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، بە تەواویی لە یەکدی دابڕاون، چەندین بەرەی تێکۆشانی هونەریی و وێژەییان دامەزراندووە، چەندین سەنگەری دوژمنایەتییان، لە یەکدی گرتووە، هێندێ لە نووسەران، بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن، ئەو دوو پارتە زلهێزەی « باشووری کوردستان »، وەک مێردەزمە سواری کۆڵنجەی شانیان بوون، بۆ مەبەستە ڕامیارییە تایبەتییەکانی خۆیان، وەک داشی دامە بەکاریاندێنن، ئەوانیش، بێ ئەوەی، ئاوڕێ لە بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی نەتەوەکەیان بدەنەوە، زۆر بێ ئاگایانە، بە سەر ئەو لا شەڕکەرانەدا دابەشبوون. لە هەمووی سەیرتریش ئەوەیە، تەنانەت، ئەو ڕووناکبیر و نووسەرانەی لە دەرەوەی وولاتیش دەژین، بە هیچ شێوەیە، کەڵکیان لە تاقیکردنەوەی دیمۆکراسیی، لایەنە ڕۆشن و پێشکەوتووەکانی ئەو وولاتانە وەرنەگرتووە، هەر لە سەر بای بەڕەکۆنی خۆیان دەڕۆن!

بۆیە دەتوانین، بێ سڵەمینەوە بڵێین: ئەوڕۆ زۆربەی زۆری ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، تووشی پەتای گۆشەگیریی، لێکدابڕان و پێکەوە هەڵنەکردن بوون، گیرۆدەی دەسی نەخۆشییەکی کوشندەی سایکۆلۆژیی بوون. هەر لەبەرئەوەشە، کەم ڕووناکبیر و نووسەر، تا سەر پێکەوە دەگونجێن. کەم

نووسـەر هەیە، دان بە توانا، بەهرە، دەسـتڕەنگینیی و لێـهـاتوویی برا نووسـەرەکـەی خـۆیدا بنێ. ڕێز لە شەونخـونیی، مـاندوویی، دەسوپەنجـە و پێنووسەکەی بگرێ. هـەر نووسەرێ، تەنیا هـەر خۆی، بە یەکەم ڕووناکبیر و نووسەر دادەنێ. ئەم لووتبەرزیی و لەخۆباییبوونەش، هەر لە کۆنەوە تا ئەورۆ، بە مـاکی هەمـوو دەرد و بەڵایەکـمـان دادەنرێ. هـەر لەبەر ئەو هۆیانەشـە، یەکێتی ڕیزەکانی ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، چ لە « کوردستان » و چ لە هەندەران، ئەورۆ لە هەموو ڕۆژێ پتر، لاواز، ناتەبا، داهێزراو، بێهێز، ناکۆک و یەکنەگرتووە، بە چەشنێ، لە نێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا، کۆمەڵێکی هاو ئاهەنگ و سفتوسۆڵ بەدی ناکرێ. لەوە دەچێ، جەستەی یەکێتی ڕیزەکانی نەتەوەی کورد بە گـشتیی، ڕیزەکانی ڕووناکبیر و نووسەران بە تایبەتیی، کرمەڕێز بووبێ، وەک دارێکی کرمۆڵ و گەندەڵ بە پێوە چەقابێ!

هەمـووشـمـان باش دەزانین، لەم خـەسـڵـەتە خـراپانە، لەم دید و بۆچوونە مـاڵوێرانکەرانانە، جگە لە زیان و سـەرگەردانیی، چیدی کـەی لێ شین نابێ، ڕاژەی زمـان، هونەر و وێژەی کـوردیی ناکـا، کەچیی، هەر لە سـەر هەڵەکانی خۆمان دەڕۆین و ساتێ بە خۆشمـاندا ناچینەوە. جا ئیدی دەبێ، ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، چ جۆرە جیاوازییەکیان، لەگەڵ ڕەشەخەڵکەکەی دیکەدا هەبێ؟

وەک لە سـەرەتاد گـوتمـان، ڕووناکـبـیـر و نووسـەرانی هەمـوو نەتەوەیەک، ئەرکێکی نەتەوەیی گرنگیـان لە سـەر شانە. گـەر ڕووناکبیـر و نووسەرانی کوردیش، هەست بەو ئەرکە مێژووییە گرنگەی سەر شانیان نەکەن، خۆیان لەو چەن بەرەکـیی، دابڕان و شـەڕەزڕتانێی ڕێکخـراوەکـان قـووتارنەکـەن، ڕیزەکانی خۆیان ڕێک نەخەن، هونەر و وێژەی کوردیی، لە نێو گێژاوی لیتاو و قووڕاوی پێوەندییە خراپ و لاوازەکانـی خۆیاندا دەر نەهێنن، کۆمـەڵەیەکی هاوئاهەنگ، ڕێکوپێک، سەربەخۆ، دێمۆکرات و پێشکەوتنخواز دانەمەزرێنن، کۆتایی بەو هـەموو ناکۆکیی، ناتەبایی و چەن بەرەکییە نەهێنن، هەروا بە لەتوپەتکراویی و لێکداپچـڕاویی بمێننەوە، لە ئاستـی هەڵە، تاوان و ناپاکـیی ڕێکخـراوەکاندا چاوبنوقێنن، ئەوا جگە لەوەی، تاوان و ناپاکییـەکی گـەورە، بەرانبەر نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان دەکەن، مێژووش لێیان خۆش نابێ. لە هەمـان کاتیشـدا، دڵی داگیرکـەران بە خـۆیان خۆشدەکەن و بێ ئەوەی پێ بزانن، نەخشە و پیلانە گڵاوەکانیان جێبەجێدەکەن.

بۆ ئەوەی، کۆتایی بـەم تراژیدیا گـاڵتـەجـارییـەی ئەورۆی، باری نـالەباری وێژەی کـوردیی بێنین، ڕیزەکانی ڕووناکـبـیـر و نووسـەرانی کـورد، پتـەو و

یەکگرتووبێ، کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو لە نێوان ڕووناکبیر و نووسەرە پەنابەرەکانی کورد لە هەندەران دامەزرێنین، بە پێویستمان زانی، وەک دوا هەوڵدان و پەلەقاژەی سەرەمەرگی یەکێتی ڕیزەکانی ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد، ئەم پرۆژە کەلتوورییە، پێش چاوی خوێندەوارانی هێژای نەتەوەکەمان بخەین، تا، هەر یەکێ لە لای خۆیەوە و لە هەر شوێنێ بێ، بیرێ لە باری بندەسیی و دواکەوتوویی نەتەوەکەمان بکاتەوە، ئەو مەترسییە گەورەیەی لێکدابڕان و ناکۆکیی نێوان ڕیزەکانی نەتەوەکە و ڕووناکبیران، بە گیانێکی پاک، بە شێوەیەکی لەخۆبوردووانە و دڵسۆزانە، تاوتوێبکا و هەست بەو ئەرکە مێژووییەی سەر شانی بکا. بۆیە سەرەتا، بۆ لێکتێگەیشتن و نزیکبوونەوە لە یەکدی، چەن پرینسیپێکی سەرەتایی، پێش چاوی هەمووان دەخەین:

1. کۆمیتەیەکی کاتیی دابمەزرێ، ئەرکی پێوەندیی و کۆکردنەوەی ڕووناکبیر و نووسەران، لە ئەستۆی خۆی بگرێ.

2. دوای ئەوەی، هێندێ لە ڕووناکبیر و نووسەران، لە دەوری کۆمیتەکە کۆدەبنەوە، بە ڕاوێژکردن لەگەڵ یەکدیدا، شوێن و کاتێکی گونجاو، بۆ کۆنفرانسێکی گشتیی، لە یەکێ لە وڵاتەکانی « ئەورووپا » دیارییبکرێ.

3. هەر کەسێ، بەشداریی لە کۆنفرانسەکەدا دەکا، دەبێ خەرجی هاتوچۆ، لە سەر خۆی بێ. بەڵام، ئەو وڵاتەی میواندارییەکە، لە ئەستۆی خۆی دەگرێ، پێویستە، جێی نووستن و خواردن، بۆ بەشدارانی کۆنفرانسەکە دابینکا.

4. بۆ ئەوەی، زۆربەی نووسەران لە کۆنفرانسەکەدا بەشدارییبکەن، نابێ، بە هیچ شێوەیە، ڤیتۆ لە سەر هیچ نووسەرێ دانرێ. جگە لەوانەی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ناپاکییان لە نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان کردووە، لە ڕیزی کۆمەڵەکەدا جێیان نابێتەوە.

5. مەرج نییە، سەرەتا هەموو نووسەرانی کورد، لە دەوری ئەم کۆمەڵەیە کۆبنەوە، بەڵکوو، لە کۆمەڵێکی کەمەوە دەسپێدەکرێ، دەرگەی کۆمەڵەکەش داناخرێ، بۆ هەموو ڕووناکبیر و نووسەرێکی کورد هەیە، داوای مافی ئەندامێتیی بکا.

6. لە سەرەتای کۆنفرانسەکەدا، دەستەیەکی بەڕێوەبەر هەڵدەبژێردرێ، تا کارەکانی کۆنفرانس بەڕێوەبەرێ.

7. هەموو نووسەر و گرووپێکی وێژەیی، هەر بەرنامەیەکیان هەبێ، لە کۆنفرانسەکەدا، پێش چاوی دەخەن، دوای ئەوەی دەمەتەقێی لە سەر دەکرێ، بە زۆربەی دەنگ، بڕیاری لە سەر دەدرێ، پاشان، بەرنامەیەکی تێروتەسەلی یەکگرتووی کارکردن دادەنرێ.

8. له کۆنفرانسەکەدا: ناوی کۆمەڵە دیاریدەکرێ. بڕیار له سەر پێڕەوی نێوخۆ و پڕۆگرام دەدرێ. دەستەی بەڕێوەبەر، به شێوەیەکی دیمۆکراسیی هەڵدەبژێردرێ.
9. ئەو کۆمەڵەیەی دادەمەزرێ، تا له ئایندەدا سەرچاوەیەکی ئابووریی بۆ دابیندەکرێ، سەرەتا دەبێ، تەنیا پشت به ئەندامەکانی خۆی ببەستێ. بۆیە پێشنیازدەکەین، هەموو ئەندامێ، بڕی سەد « 100 » دۆلار دانێ، تا کاری کۆمەڵەکەی پێ بەڕێوەبچێ. به هیچ شێوەیە نابێ، له ڕووی ئابوورییەوە، وابەستەی پارتەکانی « کوردستان » بێ.
10. هەموو کەسێ، له بیروباوەڕی ڕامیاریی و پێوەندیی پارتایەتیی خۆیدا ئازادە. بەڵام نابێ، به هیچ شێوەیە، ئەو پێوەندییەی ئەندامان، له نێو سنووری چوارچێوەی کۆمەڵەکەدا ڕەنگداتەوە و کۆمەڵەکە، بۆ مەبەستی ڕامیاریی تایبەتیی خۆی و پارتەکەی بەکاربێنێ، گرفتەکانی پارتەکەی، بۆ نێو دەزگە کەلتوورییەکە نەگوێزێتەوە. واتە دەبێ، کۆمەڵەیەکی سەربەخۆبێ.
11. بۆ چارەسەرکردنی هەموو گرفتەکانی نێوان نووسەران، بڕوایەکی تەواومان، به دیمۆکراسیی و ئازادیی بیروڕادەربڕین هەیە. به هیچ شێوەیە، بڕوامان به هێرشکردنه سەر یەکدی و بریندارکردنی هەستی یەکدی نییە.
12. کۆمەڵەکە، پتر بایەخ به توێژینەوە و کۆڵینەوەی بابەته تیۆرییە جیاجیاکانی هونەر، وێژە، زمان، مێژوو، جوگرافیا، جیۆپۆلێتیک، میتۆلۆژیا، پۆلێتیک، ئابووریی و بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵناسیی دەدا. بۆ ئەم مەبەستەش، کۆمەڵەکه ساڵانه گۆڤارێکی وەرزیی دەردەکا.
13. کۆمەڵەکە، نامیلکه و پەرتووکی تایبەت، له سەر ئەو بابەتانەی لای سەرەوە چاپدەکا.
14. کۆمەڵەکە، دەسی یارمەتیی، بۆ ئەندامانی خۆی درێژدەکا، بۆ ئەوەی، بەرهەمەکانیان به چاپبگەیەنن.
15. کۆمەڵەکه هەوڵدەدا، پێوەندییەکی توندوتۆڵ، لەگەڵ یەکێتی نووسەرانی کورد له « کوردستان » دامەزرێنێ. کەڵک له تاقیکردنەوە و توانای یەکدی وەرگرن. بەپێی توانا، یارمەتیی نووسەرانی کورد له ناوەوەی وڵات دەدا، بەرهەمەکانیان بڵاوبکەنەوە.
16. کۆمەڵەکە، پێوەندیی لەگەڵ یەکێتی نووسەران و دەزگە نێو نەتەوەییەکانی، وڵاتانی جیاجیای جیهان دەبەستێ. لەو ڕێیانەشەوە هەوڵدەدا، کۆمەکی ئابووریی بۆ کۆمەڵەکه دابینکا و کورسی خوێندن، بۆ خوێندکارانی « کوردستان » وەرگرێ.

17. کۆمەڵەکە، بێ گوێدانە ڕەخنە و هەڕەشەی ئەم ڕێکخراو و ئەو دەوڵەتی داگیرکەری « کوردستان »، هەڵوێستی ڕاستەقینەی نیشتمانپەروەرانە و بێلایەنانە، بەرانبەر ڕووداو و کارەساتە گرنگەکانی کۆمەڵگەی کوردەواریی وەردەگرێ.
18. کۆمەڵەکە، بەرژەوەندیی بالای نەتەوەی کورد، پێش بەرژەوەندیی تایبەتیی هەموو کەس، دەستە، تیرە، هۆز و ڕێکخراوێکی ڕامیاریی « کوردستان »ەوە دادەنێ.
19. کۆمەڵەکە، بە هەموو شێوەیە، داکۆکیی لە مافە ڕەواکانی نەتەوەی کورد دەکا. دژی داگیرکەرانی « کوردستان » ڕادەوەستێ. لە پێناوی دێمۆکراسیی و ئازادیی مرۆڤی کورد و سەربەخۆیی « کوردستان »دا خەباتدەکا.

**دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز**
**ستۆکهۆڵم**
**1998. 07. 25**

* * *

---

**تێبینیی:**
ساڵی « **1998** »، لە یانەی « میدیا »ی شاری « ئەمستەردام »، کۆڕم هەبوو. لەوێ، چاوم بە هێندێ دۆست و نووسەری وەک: « دوکتۆر جەبار قادر، فووادی مەجید میسریی ... » کەوت. کاتێ، سەردانمکردن و چەن شەوێ، پێکەوە دانیشتین، لەو بارەیەوە، قسەم لەگەڵ کردن. لەبەرئەوە، هەر سێکمان لە سەر ئەوە ڕێککەوتین، من، ڕەشنووسی پرۆژەیەک بنووسم و بۆیان بنێرم، تا ئەوانیش، دید و بۆچوونی خۆیان دەربڕن، دوای ئەوەی، دەسکارییدەکەین، گۆڕانکاریی تێدا دەکەین، پێیدا دەچینەوە، سەرلەنوێ دەینووسیەنەوە و هەر سێکمان لە سەری ڕێکدەکەوین، ئەو کاتە، بلاویکەینەوە.
منیش، ئەم بانگەوازەم نووسی و بۆم ناردن، تا، بۆچوونی خۆیانی لە سەر دەربڕن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دوو برایە وەلامیاندایەوە، بەلام، کارەکە سەری نەگرت و هەر لە سەرەتاوە زیندەبەچالکرا.
ئەز، بە پێویستم زانی، لێرەدا، ئەم بانگەوازەی خۆم بلاوکەمەوە، تا لە لایەکەوە: خوێنەری کورد، ئاگای لەم هەوڵ و تەقەلایە بێ. لە لایەکی دیکەشەوە: ئەوا حەوت ساڵ، بە سەر نووسینی ئەم بانگەوازەدا تێپەڕیوو، وا بزانم، تا ئێستە، هیچ لە باری نووسەرانی کورد نەگۆڕاوە، هەر وەک ئەوە وایە، لە نێوەڕۆکی بانگەوازەکەدا باسکراوە!

# نامیلکە و پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر

**01**. دەربارەی پڕۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی1، سوید، 1994.
**02**. دوا پڕۆژە، چ.1، سوید، 1994.
**03**. پێنج وتاری غەمگین، چ.1، سوید، 1994.
**04**. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ.1، سوید، 1994.
**05**. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا:
چ.1، سولەیمانی 1993.
چ.2 ، سوید، 1995.
**06**. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا:
چ.1، سوید، 1995.
چ.2، سولەیمانیی 1996.
چ. 3، سولەیمانیی، 2002.
**07**. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چ.1، سوید، 1995.
**08**. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی:
چ.1، سوید، 1996.
چ. 2، کوردستان، 2000.
**09**. فیدراڵیزم و دەوڵەتی فیدراڵ:
چ.1، سوید، 1996.
چ.2، سولەیمانی، 1996.
چ.3، سولەیمانی، 2004.
**10**. بەڵێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە نەک شێواندنی ڕاستیی، چ.1، سوید، 1996.
**11**. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا:
چ1، سوید، 1997.
چ.2، سولەیمانیی، 2002.
**12**. ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا:
چ.1، سوید، 1997.
چ. 2، سولەیمانیی، 2001.
**13**. گیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد:
چ.1، سوید، 1998.
چ. 2، سولەیمانیی، 2000.

14. ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی:
چ.1، سوید، 1999.
چ.2، سولەیمانیی، 1999.
15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی:
چ.1، سولەیمانیی، 1999.
چ.2، سولەیمانیی، 2005.
16. خلتەی بیرێکی ژاراویی، چ.1، سولەیمانیی، 2000.
17. مەسعوود محەمەد و دوو دیداری دۆستانە، چ.1، سولەیمانیی، 2002.
18. دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی، چ.1، سولەیمانیی، 2002.
19. پەیمانێکی ڕەش و ڕۆژێکی سوور، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
20. سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن:
چ.1، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2003.
چ.2، سولەیمانی، 2004.
21. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی1، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
22. شەکرە شارەکەم سولەیمانی، چ.1، سولەیمانیی، 2003.
23. حەوت گوتاری قەدەغەکراو، چ.1، چاپخانەی ئەزمڕ، سولەیمانیی، 2004.
24. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی 2، چ.1، سولەیمانیی، 2004.
25. ئێمە بۆ واین؟ چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.
26. برایەتی درۆزنانە، چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.
27. کورد و کێشەی کەرکووک، چ.1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005.
28. دۆزەخی ژێردەسیی، چ.1، سولەیمانیی، 2006.
29. هێندێ بابەتی زمانەوانیی و وێژەیی، چ.1، سولەیمانیی، 2006.

* * *

## بەرهەمی داهاتووی نووسەر

1. یاقووت و زمرووتی کوردیی، بەرگی3.
2. یاقووت و زمرووتی کوردیی، بەرگی4.
3. یاقووت و زمرووتی کوردیی، بەرگی5.
4. ئایین و نەتەوایەتیی.
5. بەرکۆڵێ لە خەرمانی بیری نەتەوەیی.
6. ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کورددا.
7. جیۆپۆلێتیکی کوردستان.